# گاڤەکێ ویڤەتر ژ دیاردەیا بجهئینانا کاری ژبۆ ل سەر خوە راکرنا ئەرکی

هەر جارا ئەز سەردانەکا ئەورووپایێ دکم، ئەڤ پرسیار دهێت ناڤ مەژی یێ من کا بۆ چ نەتەوەیێن کۆ ل باکورێ ئەورووپایێ دژین، رەوشا ئابۆری یا وان باشترە ئوو پێشکەڤتیترن، ئوو رەوشا ئابۆری یا خەلکێ باشورێ ئەورووپایێ لەوازترە. هەر چندە کۆ رەنگە چ شرۆڤەکرنێن زانستی ژبۆ ڤێ دیاردەیێ نەبن، لێ ئەز باوەرم کۆ رەنگە سەدەمەکا وێ ئەدەتێ بێهنڤەدان ئوو نڤستنا نیڤرۆ ل نک خەلکێ باشورێ ئەورووپایێ بت.

نەتەوەیێن پەرئاڤێن دەریا یا سپی (یا ناڤین)، چ باژاری بن چ گوندی، ب ئاوایەکێ ئەدەتی فێربوونە کۆ پشتی خوارنا فراڤینێ چاخکەکێ (= سەعەتەکێ) دوان بنڤن. هەلبەت، ئەڤ رەنگە ژبۆ خەلکێ پرر بزاڤ ئوو لڤەلڤێ کۆرەیێ تشتەکێ ئەجێب بت، هەر چندە کۆ هەر کەس پشتی خوارنا زادەکێ باش پچەکێ گران دبت ئوو خەوا وی دهێت، ئوو راستە ژی کۆ گەرمی یا وان دەڤەران ژی هاریکاری یا وێ پررخەوییێ دکت.

ئەز هێشتا تێناگەهم کا چاوا مرۆڤەك دکارت ل دەمێن پررمفا ئوو بهادارێن رۆژێ بنڤت. ژ ڤێ ژی ئەجێبتر ئەوە کۆ هەمی کارمەند ژی نیڤرۆیان دنڤن، ب سەر هندێ را کۆ دەما دەستپێبوون ئوو داویبوونا کارێ وان ژی وەکی دەما نەتەوە یێن باکورێ ئەورووپایێ یە. پررانی یا دکانان ئوو فرۆشگەهان ژی بەری چاخك هەشتێ ئێڤاری دهێن گرتن.

دەما هەمی خەلکێ حڤاکەکێ وەها بن، بێ گومان هێزەکا مەزن یا کاری ژناڤ دچت. ژبەر وێ ئەز باوەرم کۆ خەوا نیڤرۆیان دبێ بکەڤت بەر لێکۆلینان.

چ گومان تێدا نینه کۆ تەنبەلیەك ئوو سستیەك د لڤین ئوو گێولێ وان نەتـەوەیان دا هەیە ئوو ب رەنگێ ئەدەتێن کەسینی ئوو نەتەوەیی خوەیا بوویە. ئەڤ بابەت دکارت رەنگڤەدانا بیرووباوەرێن خەلکی دەرهەڤا ژیانێ ئوو چارەنڤیسێ ژی دا بن.

ب هەر ئاوایی بت، ئەز دهزرم کۆ بێخەمی یا نەتـەوە یـێن باشـورێ ئـەورووپایێ نـە ژبەر رحا رۆمانسیەتێ ل نك وان، لێ ژبـەر تەنبـەلی ئـوو بێخیرەتیـێ یـە. د راسـتیێ دا، ئەز وێ ژ نیشانێن نەساخی یا کـار-ژبـۆ-ل-سـەر-خـوە-راکرنـا-ئـەرکی دبینـم، ئـانکۆ کرنـا قەدارەیـەکا دیـارکری ژ کـاری ل بەرانبـەری مفـا وەرگـرتن ژ قەدارەیـەکا دیـارکری ژ بێهنڤەدان ئوو خوە مژوولکرنێ. ئەز ڤـی بابـەتی ژ سـەدەمێن سـەرەکی یـێن جداتی یـا دناڤبەرا رەوشا ئـابۆری یـا نەتـەوەیێن بـاکور ئـوو باشـورێ ئـەورووپایێ دا دحەسـبینم. خەلکەکێ کۆ هەمی بزاڤا خوە دکن دا دەما خوە ب بەلاش نـەبهورینن ئـوو چ توخیبـان ژبۆ کارکرنێ نانیاسن بێگومان دێ ژ وان کەسان سەرکەڤتیتر بن کۆ تەنێ ژبۆ بجهئینانـا ئەرکێ ل سەر خوە کار دکن.

ئەز هێشتا خەونەکێ دوبارە دبینم. د ڤێ خەونێ دا ئـەز ژ زانینگـەهێ دەرناکـەڤم. د راستیێ دا ژی، هەما چ نەمابوو کۆ ل خویندنێ سەرنەکەڤم. رەنگە سەدەما دیتنا ڤـێ خەونێ ئەو بت.

ل نیڤـسالا دووماهیێ ژ خوینـدنا ل زانـستکۆمێ (= کۆلیـژێ) ل شـوونا وێ کـۆ بـچم سەر پۆلێن دەرسـێ، مـن ب ئاوایـەکێ پـاردەم (= نـیڤ-دەم، نـیڤ-دەوام) ل دەسـتگاهەکێ حوکمەتێ کـار دکـر. ل وان سـالان، ئێـك ژ تـشتێن کـۆ شـاگردێن سـالا دوومـاهیێ فـەخر پێڤەدکر خوە ڤەدزینا ژ پۆلان بوو.

هەلبەت شاگردێن سالا دووماهیێ، وەکی من، پررانی یا هزرا خـوە ب ڤـەدیتنا کـارێ خوە یێ پاشەرۆژێ ڤە مژوول دکر. ئەڤ کارەك بوو کۆ هەما ببێژە هەمی شاگردێن سالا دووماهیێ دکر.

ئێك ژ دەرسێن سالا دووماهیێ یا من دگەل دەرسدێرەکی ب ناڤێ "پرۆفیـسۆر وانـگ ئیل چانگ"ی بوو کۆ نهـا ل زانینگـەها "هانیـانگ"ێ[1] ل بـاژارێ سـیۆلێ دەرسـێ ددت.

---

(١) Hanyang University.

هنگی ئـەو تـازە ژ ئـەمریکایێ هـات بووڤـە ئـوو ب رژدی دبـن تەسـیرا رێکـووپێکی ئـوو خویندنا ب ئاوایێ سیستەماتیک ئوو دۆزەنانە بوو.

ئەز ئاگەهدار نەبووم کۆ سەیدایێ "وانگ" هەر رۆژ ل پۆلێ سەح دکت کا کی هـاتی یـە ئـوو کـی نـەهاتی یـە ئـوو دەرەجـەیان نـادت کەسـێن کـۆ چـەند چـاخکەکێن (= سەعەتەکێن) دیارکری ل پۆلێ بەرهەڤ نـەبن. ئـەز گەلـەک دەرەنـگ ب ڤـێ حەسـیام ئوو کەڤتم ناڤ رەوشەکا خراب. ئەگەر من ژ دەرسا وی دەرەجە نـەوەرگرتبان، هـەبوو کۆ ئەز سەرنەکەڤتبام.

ژبەر وێ، من برریاردا کۆ "پرۆفیسۆر وانگی" ببینم ئوو لێبهورینێ ژێ بخـوازم ئـوو لاڤێ (= رجایێ) بکم کۆ بهێلت ژ زانینگـەهێ ب سـەرکەڤتن دەربـاز ببـم. لـێ، ئـەو رازی نەدبوو. ئەز وەها دفکرم کۆ وی ژ رەوشا من فەهم نەدکر ئوو ب شاشی ڤـە دهـزری کـۆ ئەز شاگردەکێ بێخەم ئوو سەرسەری مە. هنگی ئەز سەرۆکێ "جڤاتا دۆستێن شاگردێن بازرگـانیێ" بـووم. مـن ژ ئەنـدامێن جڤـاتێ ژی خوەسـت کـۆ ژبـۆ ڤـێ چـەندێ داخـوازا هاریکاریێ ژ وی بکن.

ل دووماهییێ، "پرۆفیسۆر وانگـی" ب مەرجـەکێ ئـەز پەژرانـدم. وی ژ مـن خوەسـت کۆ ژبۆ سەرکەڤتنا ژ دەرسا وی سالخەکا نـەمازەیی (= تایبـەتی) بەرهـەڤ ئـوو پێـشکێش بکم. من ئەڤ کار ب ئاوایەکێ سەرکەڤتیانە کـر ئـوو ژ زانینگـەهێ سـەرکەڤتم. لـێ ئـەو کار ژبۆ من بوو دەرسەک. من ئەو هزر کۆ تەنێ ژبـۆ ل-سـەر-خـوە-راکرنـا ئـەرکی کـاری بکم ژ سەرێ خوە دەرکر. شاگردەکێ سالا دوومـاهیێ ژی دبـێ ب ڤاسـی شـاگردەکێ سـالا ئێکێ خوە ماندی بکت، رەنگـە زێـدەتر ژی. مـن دهزرانـد کـۆ تـشتێ ئـەز ل زانـستکۆمێ (= کۆلیـژێ) فـێر بـوو بـووم بەسـی مـن بـوو، لـێ دەرسا مـن ژ وێ سـەربهورێ وەرگرتـی کـارەکێ وەسـا د مـن کـر کـۆ هێـشتا ژی ئـەز د خـەونان دا دبیـنم کـۆ ژ زانینگـەهێ دەرنەچوومە.

ژبەر ڤێ سەربهورێ، ژ دەما دەستپێکرنا بزاڤێن کاروەری یێن شەریکە یا "دێوو" یێ، ئەز نەشییامە کارمەندێن کۆ تەنێ ژبۆ ل سەر خوە راکرنا ئـەرکی کـار دکن تەحـەمول بکم. کارێ وەسا نە مفایێ دگەهینت وان کەسان نە ژی جڤاکێ.

ل ڤان سالێن درێژ، من بەرهەمێن پیشەسازیێ یێن بێهژمار د ئاستەکا ناڤنەتەوەیی دا بەلاڤکرنە ئـوو گەلـەك جـاران هەڤرووشی ئاریشەیەکا ئـارهین بوومـە: خەملانـدنا دوومـاهیێ یـا بەرهـەمی. بەرهـەمێن دەسـتکری یـێن کـۆرەیێ ژ ئـالی یـێ نتلانـدنێ (= دیـزاینێ)، چـاواییێ (= کالیتـەیێ، نەوعیـەتێ) ئـوو بهـایێ بەرچـاڤ بوونـە، لـێ خەملاندنا دووماهیێ هەمی گاڤان ستریەك بوویە د چاڤێن مـە دا ئـوو موهانەیـەك ژێ ژبۆ بکرران دا ژ بهایێ وان کێم بکن. ئـەڤ نـە تـەنێ دبـت سـەدەما هاتنـەخوارا بهـایێ بەرهەمان ل سووکێن جیهانی، لێ خەلکێ کۆرەیێ ژێ پچەکێ تووشی شەرمزاریێ دکت.

ئەڤی بابەتی هەمی گاڤان ئـەز ئێشاندمە. خەملانـدنا دوومـاهیێ ب رەنگـێ ل سـەر خوە راکرنا ئەرکی زەهمەت ئوو ماندیبوونا ژبۆ بەرهـەمی ب ئـاڤێ دا بـەر ددت ئـوو ب ڤی ئاوایی زیانەکا مەزن دگەهینت وەلاتی.

دەمـا ئـەز جـارا پێـشێن بـەر ب سـووکێن مـەزاختنێ ل ئـەمریکایێ چـووم، ئێـك ژ بکـررێن مـن فرۆشـگەهێن زنجـیری یـێن "سـی پێـرز"ێ بـوون. سـەرۆکێ کاروبـارێن بەرهـەمی ل "سـی پێـرزێ" گەلـەك ئـالۆزێ جـۆرەیێ بەرهـەمێن کـۆرەیێ بـوو ئـوو بەرپرسیاریتی یا من ئەو بوو کۆ ترسا وی کێم بکم. ژبەر وێ، من پشکەکا ناڤخوەیی یـا کۆنترولکرنـا جـۆرەیی (= سـەیتەرەیا نـەوعی، کالیتـە کـۆنترۆل) دامەزرانـد دا هـەمی بەرهەمێن چێکری بجەربینت. ژبۆ ڤێ، من ستاندەرەك ئانکۆ پیڤکەکا بلنـدتر ژ پیڤکا فرۆشـگەهێن "سـی پێـرز"ێ دانـا. ل دوومـاهیێ، ئـەز شـییام بـاوەری یـا بەرپرسـێن فرۆشگەهان بدەستڤە بئینم.

ئـەم ب سـاناهی دکـارین هنـدەك نموونـەیێن دی ژێ ژ "کارکرنـا ژبـۆ ل سـەر خـوە راکرنا ئـەرکی" ڤـەبینین. ل سالا ١٩٦٧ێ، دەمـا مـە شـەریکە یـا "دێـوو" یـێ دامەزرانـد، هەمی بەرهەمێن کۆ ژبـۆ دەرڤـەیی کـۆرەیێ دهـاتن هنـارتن ب گـەمیان دهـاتن هنـارتن. پیشەسازی یا بارکرن ئوو ڤەگوهاستنا دەریایی هێشتا گەلەك پێش نەکـەڤت بـوو، ژبـەر وێ ژێ هەڤرکیەکا توند د ناڤبەرا شـەریکەیێن دەرڤـەهنێر (= تەسـدیرکەر) دا هـەبوو دا جهەکێ باش دناڤ گەمیان دا ژبۆ خوە ڤـە ببیـنن. ژبـەر وێ پررانـی یـا شـەریکە یـێن دەرڤەهنێر نمینەندە (= نوونەر) ل بازارێ بەندەری یێ "پۆسان"ێ هەبوون. دەما ژڤانـا دانەدەستا بەرهەمان بۆ دەستێ بکررێن دەرڤەیی دهات، هـەمی تـوورە دبـوون ئـوو زوو

دغەیدین. پشکێن بەرهەمئینانێ ل کارخانەیان بیست ئوو چار چاخکان کار دکر. پشتی کۆ بەرهەمێ دەرڤەهنارتنێ دگەهشت ئمبارێن گۆمرکێ، نمینەندە یێن شـەریکەیان دبیـا ب ژڤانـا هنـدێ مابـان کـۆ دەمـا بارکرنـا بەرهـەمێن وان بهێـت. ئەگـەر ئـەم نەشـیبابان گەمیەکێ ل دەمەکا هەژی پەیدا بکین، دبیا ب کێمی ڤە هـەتا هەفتیـەکا دی ئـوو هاتنـا گەمیەکا دی ل بەندێ بمابان ئوو هەمی ماندیبوونا مـە ژبـۆ دانەدەسـتا سـەروەخت یـا بەرهەمان ب ئاڤێ دا دچوو. هنگـی بـەختێ سـەرکەڤتنا شـەریکەیەکا بـچووك هـەمی ل سـەر ڤەقەدانـدنا جهـی ل گەمیـەکێ رادوەسـتیا. لـەوما، گڤـاش ئـوو بەرپرسـیاری یـا نمینەندەیێن شەریکەیان ل بەندەران گەلەك گرنگ بوو.

خوەرسکی یـە کـۆ هـەڤررکی یـا دناڤبـەرا وان نمینەنـدەیان دا ب توندووتیـژی بـوو. ئەگە نمینەندە گەلەك هشیار نەبا، ب ساناهی دا ل بەرانبـەری نمینەنـدە یـێن هـەڤررك بدۆرینت. هندەك جاران دقەومی کۆ بەرهەمێن شەریکەیەکێ ل گەمیێ دهـاتن بـارکرن ئـوو دەمـا نمینەنـدەیێ وێ شـەریکەیێ ب هێـسابوون ڤـە ژ بەنـدەری دچـوو، بـارێن وی هاتبان داگرتن ئوو بارێن شەریکەیەکا دی هاتبان بارکرن.

خوەشە کۆ بزانن ل بەندەرێ پۆسانێ سـێ دەسـتەکێن نمینەنـدە یـێن جـۆر-ب-جـۆر یێن شەریکە یێن دەرڤەهنێر هەبوون. دەستەکا ئێکێ دەما پشتراست دکـر کـۆ پـەرتالێن شـەریکەیێ گەهـشتنە ئمبـارێن گـۆمرکێ، ژ گـۆمرکێ دچـوون. دەسـتەکا دویـێ ل بەنـدا بارکرنا پەرتالان ل گەمیێ دمان، پاشی ژ بەندەرێ دچوون. دەسـتەکا سـێیێ ئـەو بـوون کۆ پشتی هاتنا پەرتالان بۆ گومرکێ ئوو پشتراستبوونا ژ بارکرنێ ل گـەمیان ژی هـەر ل وێدەرێ دمان هەتا ددیت کۆ گەمی ب رێ دکەڤت ئوو ژبەر چاڤان وندا دبوو.

نمینەنــدەیێن جــۆرەیێ ئێکــێ پررانــی ددۆرانــد ئــوو راســتی ئاریــشەیان دهــاتن. نمینەنـدەیێن دویـێ ژی ب ئاوایـەکێ ئـەدەتی ژ هـەر ١٠ سـەفەرێن خـوە جـارەکێ-دوان تووشی هندێ دبوون کۆ پەرتالێن وان ل ئەردی مابان. لێ نمینەندە یێن دەستەکا سێیێ هـەتا داویبوونـا کـاری ل بەنـدەری دمـان ئـوو تووشـی چ ئاریـشەیان نـەدبوون ئـوو سەرکەڤتی بوون. نمینەندە یێن دەستەکێن ئێکێ ئوو دویـێ هـەما هنـد کـارکری یـە کـۆ وی چاخی ل گۆرە یێ وان باش ئوو تێرا بوویە، لێ گەلەك جاران ژبۆ شەریکەیێن خـوە ئاریشە چێ کرنە.

من ئەمر کر کۆ نمینەندە یێن شەریکەیا "دێوو"یێ هەتا گەمی دهێت بارکرن ئوو ل ئاسۆیێ ئاڤا دبت ل بەندەرێ بمینن. ئەڤ ب خوە کارەکێ دووماهیئینانا کاری بوو. هەر ئەڤ کارێ سادە بوو سەدەما هندێ کۆ د بارکرنا چ پەرتالەکی دا ئەم تووشی ئاریشەیان نەبن ئوو هەمی پەرتالێن مە ل سەر وەختێ خوە بگەهن دەستێ بکرران. گەلەك بابەتەکێ بنگەهین ئوو پێدڤی بوو کۆ ئەم د راستا بکررێن خوە یێن ناڤنەتەوەیی دا جهێ باوەرێ بین. هەمی جیهانێ پەژراند بوو کۆ "دێوو" شەریکەیەکە دکارت پەرتالێن خوە ل دەما خوە بدەستڤە بدت.

نە گرنگە کا ئەز چ کارەکی دکم، گرنگ ئەوە کۆ ئەز ژ کارێ خوە حەز دکم ئوو وی کاری هەتا سەری دبم. ئەڤ کلیلا سەرکەڤتنێ یە. ئەز خەبتیمە کۆ ڤی بنگەهی بکم سەرێ کارمەندێن خوە ئوو وان تێبگەهینم کۆ ژبۆ بەرهەمئینانا پەرتالان ب تەنێ هووربینی، پێگری ئوو لدووڤچوون پێدڤی نینە، دبێ هەتا دووماهی یا کاری وەها بت. ئەڤ شێواز ل شەریکەیا "دێوو"یێ بوویە کەڤنەشۆپ ئوو فەرهەنگەکا گرانبها.

ژبەر ڤێ ئێکێ، ئەز ژ جوانێن مە یێن ئەڤرۆ دخوازم کۆ هەمی جاران ئافرینەر بن، ئوو تەنێ ل دووڤ هێشەتێ ئوو تەبایی عامێ نەچن شامێ. نابت ئەو تەنێ ژبۆ ل سەر خوە راکرنا ئەرکی دەرسێ بخوینن.

رێیەکا درست ژبۆ خوە هلبژێرن، ب شیایێن خوە بحەسن، شیانێن نەڤەدیتی ئوو نەپەنێن خوە ڤەببینن ئوو وان هەمیان پێشکێشی ئاڤاکرنا جڤاکا خوە بکن. تەنێ ب تەهلی ئوو ماندیبوون ئوو دژواری یێن ئەڤرۆ یێن مە یە کۆ سبەهیەکا روهن ئوو گەش دێ بهێت. ئەگەر هون دەرسێ بخوینن ئان ب هەر ئاوایەکێ دی بژین، کارکرن ئوو خەبتینا ژبۆ ل سەر خوە راکرنا ئەرکی رابوەستینن.

### بەهرا پێنجێ

# جادووکەر

دبێـژن جادووکـەرەك هـەبوو هـەرگاڤا خوەسـتبا دشـيا ب پـچەکا خوەهلـدانێ بگەهشتبا سەرێ چیایان. وی ب ڤان کارێن خوە خەلك ئەجێبمایی دکر ئوو وەها ل وان ژی دکر کۆ ئێرەیـی ئـوو حەسـوودیێ پـێ بـبن. مـە ئـەجێبمایی دکـت کـا ئـەم ژی دێ رۆژەکێ بکارین تشتەکێ وەهـا بکـین. ئـەم ب ئـەجێبی ڤـە دهـزرین کـۆ رەنگـە رۆژەکـێ، دەما ئەو د دەریا یا هزراندنێن خوەدا نقـووم بوویـە، ژ نـشکێڤە ئـەڤ شـیان ژ ئـەسمانێ هـشین بـەر ب ئـالی یـێ وی هـاتی یـە ئـان ب ئیلهلامان وەهـا دکـت ئـوو هـزرێن هۆسـا. ئەشکرا یە کۆ ل دەستپێکێ وی مێرێ جادووکەر ژی هـەر هنـدی خـەلکی خـوە هلدایـە، ئان هەما ببێژە مەترەکێ زێدەتر ژ خەلکی خوە بازدایـە. لـێ وی ئارمانجـەك ژبـۆ خـوە دیارکری یە: دبێ ل رۆژەکێ ب ڤاسی چیایێن بلند خوە باز بـدم. وی هـەر رۆژ راهینـان کرنە ئوو رۆژ ل پەی رۆژێ شیانا وی یا  بازدانێ زێدەتر بوویە. وی هەمی دەما خـوە ل سەر هندێ دانایە. رەنگە وی هند بێهنا خوە درێژ کربت ئوو ژبۆ گۆتنێ ل سـەر گـەنمێ زەڤیەکێ کۆ هێدی هێدی بلند بوویە باز دابت ئوو ب ڤی ئاوایی خوە راهینا بت. رەنگە ژبـەر هنـدەك راهینـانێن دی ژی بووبـت جادووکـەر، ئـوو د چارچووڤێ شـەهرەزایی یـا خوە دا بوویە پسپۆرەکێ ژێهاتی ئوو دەستهەل.

گەلەك ساناهی یە کۆ ب شاشی وەسا بەرێکڤەبدین کۆ جادووکەر هەما وەسا ژ دایکـا خـوە بوویـە. ئەگـەر ئـەڤ بـەرهزر راسـت بـت، دبـێ ل سـەر شـۆپا وێ مـرۆڤ ببێـژت شەهرەزایەك ژی هەما ژ دەسـتپێکێ شـەهرەزا بوویـە ئـوو سـەرۆکێ دەسـتەکا رێڤـەبرنا شەریکەیەکێ ژی هەما ژ دەما ژدایکبوونا خوە سـەرۆکێ دەسـتەکا رێڤـەبرنا شـەریکەیێ بوویە. ئەرێ گەلۆ، ب راستی ژی شەهرەزا ئوو سەرۆکێن دەستەکا رێڤەبرنێ وها هاتنـە

ئافراندن؟ نەخێر، نە وەسا یە. وان زەھمەت کێشایە، خەبتینە ئوو خوە ماندی کری یە ھەتا ل کارێ خوە بوونە شەھرەزا، ھەما وەکی جادووکەرەکی.

ھەر مرۆڤەکی شیانێن بێ توخیب ھەنە. تەنێ جداتیەك دناڤبەرا کەسێن ئەدەتی ئوو جادووکەرەکی دا ھەیە. جادووکەر ب راھینانان ئوو دژواری یێن گەلەك زێدە شیانێن خوە یێن نەپەن بکاردئینت ئوو د وان کارێن ئەجیب دا کۆ دکت دەستھەل بوویە. ژبۆ ھەر ئەگەرەکێ بناسەك ھەیە، ئوو ھەر خوەماندیکرنەکێ ژی ڤەرێژەك ھەیە. ڤەنجی ئوو ھونەر ھەما ھەونتە ب دەستڤە ناھێن. ئەو وەرارا ھێدی ھێدی یا کریارەکا دیارکری نە.

بەرڤاژی خوە شکاندنێ یە ئوو رەنگە وەکی خوەپەسندانەکێ بت کۆ ببێژم خەلك دبێژن من "جادووکەر". رەنگە سەدەما ھندێ کۆ دبێژن من جادووکەر ئەو بت کۆ گەلەك جاران ئەز بەھسا وی ڤەھرەمانێ بازدانێ دکم. رەنگە ژبەر وێ بت کۆ من ب خوەماندیکرنێ ئوو بێ راوەستیان بزاڤ کری یە د ھەر کارەکی دا کۆ دەست پێ دکم ببم شەھرەزا ئوو ژێھاتی ئوو خودان سەربھور. دبێ پێزانینێ ب وێ بکم کۆ کەربێن من ژ ڤی ناڤی ڤەنابن. ژبەر وێ کۆ ل ھەمی ژیانا خوە دا من بزاڤ کری یە شەھرەزا ئوو پسپۆرەك بم.

من خویندنا خوە ل زانینگەھێ ل ئابۆریێ داوی کری یە. لێ بەرڤاژی خویندنا خوە، من کارێ خوە یێ دەستپێکێ ل پیشەسازی یا پاتەی دەست پێکر ئوو پاشی ھنگی، پشتی دەھ سالان، وەکی جادووکەرەکێ تەڤنکرنێ ئوو پاتەچێکرنێ ھاتم نیاسین. نھا، ھەر چندە کۆ ژ مێژوەرە ئەز ژ پاتەچێکرنێ دوور بوومە، دەما ئەز ھەر جۆرەیەکێ پاتەی ببینم دزانم کا چاوایە، ژبۆ میناك، چ داڤ ژبۆ تەڤناندنا وی ھاتنە بکارئینان، ڤۆناخێن چێکرنێ چ بوونە، ژبۆ رەنگکرنێ چ جۆرەیێن رەنگان ھاتنە بکارئینان ئوو ھ.و.د. ئەز ھێشتا ژی ژبۆ بەرێکفەدانا رەنگ، جۆرە ئان تەڤنێ پاتەی جادووکەرەکم.

لێ جادووکەری یا من تەنێ ژبۆ پیشەسازی یا پاتەیی ئوو تەڤناندنێ نیە. ھندی کۆ بزاڤێن شەریکە یا مە د بیاڤێن جداجدا دا بەرفرەھتر بوونە، من د وان بیاڤێن نوو دا ژی خوە ماندی کری یە ئوو د وان بیاڤان دا ژی بوومە شەھرەزا ئوو رایەدار. ژبۆ میناك، ل پشکێن ماکینەسازیێ دا، گەلەك جۆرە یێن ئالاڤێن ھاتووچوویێ، گەمیسازیێ،

ئوو هۆتێلداریێ؛ د هەر بیاڤەکێ دا من وەها خوە پێگەهاندی یە کۆ ببم شەهرەزایەك. هەر ژ بەر ڤان شەهرەزاییان، ئەم شیاین د ئاستێن جداجدا دا کارێن خوە بەرفرەه بکین.

ژبەر بزاڤێن من د بیاڤێن جداجدا دا، ئەز بوومە شەهرەزایێ بەرێکڤەدانا شیانێن مرۆڤان ژی. دەما ئەز دگەل رێڤەبەر ئان بەرپرسەکێ ژ خوە نزمتر دئاخڤم، ژ لڤینێن وی، هەڤۆکێن وی، شێوازا ئاخفتنێ، گوهارتنێن دێم ئوو سەروچاڤێن وی دگاڤێدا دزانم کا ئەو د وارێن گرێدایی کارێ خوە دا چەند شەهرەزا بوویە ئوو چەند دزانت. تەنێ ب پرسیارەکێ - دوان دکارم پێ بحەسم کا چەند د کارێ خوە دا دەستهەل ئوو خودان تەجریبە یە.

ئەم ل دەما دابەشبوونا زانستێن پسپۆرەیی دا دژین. ل دەمەکێ دژین کۆ کاروبارێن رۆژانە ژی بەردەوام د گوهارتن ئوو گوهێراندنێ دا نە. کاودانێن ژیانێ گەلەك ئالۆزتر ئوو جۆرانەتر بوونە ئوو د گەلەك ئاستان دا زێدەتر ژ جاران ئەم خوە حەوجەدارێن مرۆڤێن کارزان ئوو شەهرەزا دبینن. ئێدی دەما هندێ ب سەرچوویە کۆ کەسەك بشێت هەمی کاران بکت. ئەگەر کەسەك بکارت ب ئاوایەکێ گشتی ئوو ب هوورهوورکانی ڤە ژی کارەکی بکت، کێمی یا دەمێ ڤێ دەلیڤەیێ نادت وی.

کار ب تڤاڤی ل سەر بنگەهێ دابەشکرنا کاری ل گۆرە یێ شەهرەزایی یێن کارمەندان ل پشکێن جداجدا ب سەر وان دا دهێت دابێشکرن. ب ڤی ئاوایی رێژە یا بەرهەمدێریێ گەلەك زێدە بوویە ئوو ئەم حەوجەدارێن شەهرەزایی یێن جۆر-ب-جۆر بوونە. ژبەر وێ ل جیهانا ئەڤرۆ دبێ هون ل کارێ کۆ هلدبژێرن بین شەهرەزایەکێ خودان تەجریبە.

هەلبەت، دبیا ڤێ ژی ببێژم کۆ ئەڤ دابێشکرنا کاری، گرنگی ئوو بهایێ کارێن جداجدا کێم ناکت ئوو رامانا وێ ئەو نینە کۆ بل ژ کارێ خوە ئان پیشە یا خوە هەمی تشتێن دی پشتگوهڤەبهاڤێژن. جیهان بەرفرەه ئوو ژیان تژی تشتێن جۆر-ب-جۆرە. ئەگەر هون خوە د جیهانا بچووکا هزرێن خوە دا زیندانی بکن، دێ ژ جیهانا دەردۆرا خوە بێ ئاگەه بمینن، وەکی وێ بەڤا کۆ د بنێ بیرەکێ دا مابت.

تشتێ کۆ ئەڤرۆ هزرا من ب خوە ڤە مژوول دکت ئەوە کۆ ئەم ئەڤرۆ گەلەك ب لەز مژوولی کۆلینا کوورکەکا مەزنین. لێ مە ژ بیر کری یە کۆ دپێشدا کووراهی یا ڤێ چالێ بخەمنینین ئوو د حسێبێن خوە دا بەرچاڤ دابنین. ژبەر وێ کۆ بەری کۆلینا چالەکا کوور دبێ هەوە ئەردەك هەبت کۆ تێرا خوە بەرفرەه بت. ئەگەر کووراهی ئوو بەرفرەهی یا چالێ دگەل ئێك نەگونجن، دێ هون ل پەهنی ئوو درێژیەکا کێم چالەکا کوور بکۆلن، ئوو هنگی بێ گومان دێ تووشی ئاریشەیان ببن.

کار هەمی جاران هۆسا ب رێڤە ناچن. هەمی گاڤان هندەك بنەما یێن سەرەکی حوکمی ل کاران دکن. ئەگەر هون ب راستی حەوجەدارێن چالەکا کوورن، دبێ دپێشدا ل جهەکێ بەرفرەه دەست ب کۆلینێ بکن. ئەگەر هون تەنێ هزرێ ل کووراهی یا چالێ بکن، هون رەنگە وەها هزر بکن کۆ ژ دەما هلنانا بێرا ئێکی یا ئاخێ هون دێ بکارن بگەهن وێ کووراهی یا هەوە دڤێت. لێ هەما کۆ هون پچەکێ کوورتر چوون، هون دێ پێ بحەسن کۆ ئەگەر بیر تێرا خوە فرەه نەبت هون نکارن هندی دلێ هەوە دخوازت کوور بکن. ژبەر وێ، بەری دەست بهاڤێژن کۆلینێ، مسۆگەر بکن کۆ پەهنی ئوو درێژی یا هەژی یە. هنگی دێ ساناهیتر بشێن بگەهن وێ کووراهی یا هون دخوازن.

بزاڤێ بکن ببن شەهرەزایەك، کارزانەك، هەلبەت نە وەسا کۆ تشتێن دی نەبینن. ب سەر شەهرەزایی یا خوە را، پێدڤی یە هون د گەلەك کارێن جۆر-ب-جۆرە یێن دی دا ژی خودان شەهرەزایی ببن. رامانا دەرس-خویندن ئوو تێ دگەهشتنا مە ئەوە کۆ تێگەهشتنا مە ئوو هەستکرن ب تشتان ل نك مە زێدە بوویە. کەسەکێ کۆ د بیاڤێ هوورژینەوەرزانستی (= میکرۆبناسیێ) دا دخوینت، نە پێدڤی یە کۆ کارزانێ شێوازێن سەرئێکڤەگرێدانا پارچەیێن بالێن فررۆکەیان بت. لێ ئەگەر بیاڤێ خویندنا هەوە هوورژینەوەرزانست، دەرمانزانست ئان ئەدەبیات بت، هون حەوجەدارن کۆ زانینێن خوە دگەل بیاڤێن دی دا بەرفرەه بکن. ئەو زانینا بەرفرەها کۆ من مەبەستە، ئەوە کۆ هون ب ئاوایەکێ رێکوپێك زانینان ل نك خوە بپەروەرینن دا بکارن نهێررینا خوە ئوو کووراهی یا شەهرەزایی یا خوە زێدە بکن.

هون حەوجەدارن کۆ ب بەرفرەهی د هندەك وارێن مینا فەلسەفە، تیتالێن رابوون ئوو روونشتنا دگەل خەلکی ئوو بنگەهێن ئەخلاقی دا ببن شەهرەزا. ژبەر وێ، دەما

ئەز دبێژم مرۆڤ دبێ ببت شەهرەزا، هەما ئیکسەر وێ ژی ڤەدگرت کۆ دبیا تێگەهشتنا مە درست بت ئوو فەهمین (= فەهم کرن) ئوو تێگەهشتن ئوو تێدەرئانینا مە وەکی پشکەکا ژێکڤەنەکری یا وێ شەهرەزاییێ بت.

ئەڤرۆ، هێز ئوو کەسینی یا مرۆڤی دو تشتێن ژ هەڤ جدا نینە. ئێدی ئەو چاخێن کۆ وەسا بوون داوی بوونە. هێزمەندی هنگی پەیدا دبت کۆ هون شەهرەزا بن، ئوو کەسینی ئوو پلە ئوو پایە هنگی بدەستڤە دهێن کۆ هون کەسێ ئێکانە بن کۆ بکارن وی کاری ب شەهرەزایی بکن. پیڤك ئوو ستاندەرا بەرێکڤەدانا ئەڤرۆ شەهرەزایی یە.

چما پزشك جهێ رێزێ نە؟ ئەز ب لێ هووربوونێن خوە پێ حەسیامە کۆ رێزداری یا وان ژبەر وێ یە کۆ خودانێ شەهرەزاییەکا گرانبهانە. ئەو دکارن نەساخێن وەسا چارەسەر بکن کۆ خەلکێ دی نکارن. چما نڤیسکارێن وەکی "دۆستۆیۆڤسکی"[1]، "کامۆ"[2] ئوو "کافکا"[3] ی هێشتا د هزرا خەلکی دا مانە؟ ژبەر وێ کۆ ئەو د ئەدەبیاتێ دا شەهرەزا بوونە، ئوو ژبەر وێ کۆ ئەو گەهشتبوون ئاستەکی د ئەدەبیاتێ دا کۆ کەسێن دی نەگەهشت بوون وان بلنداهیان. وان کارێن وەسا کرن کۆ کەسێن دی نەدشیان ئان نەدخوەست کۆ بکن.

لەوما بخەبتن کۆ ببن شەهرەزایەك، کارزانەك ئان جادووکەرەك. د هەر بیاڤەکێ دا کۆ هون دەست پێ بکن، بزاڤێ بکن کۆ یێ هەری باش بن، نە خەمە کا پیشە یا هەوە چ

---

(١) فیۆدۆر میخائیلۆڤیچ دۆستۆیۆڤسکی (Fyodor Mikhaylovich Dostoyevsky) (١٨٢١–١٨٨١) رۆمانڤیس ئوو هزرڤانێ ناڤدارێ ئوورس کۆ د بابەتێن خوە دا ل دین، ئەخلاق، رەڤانزانی ئوو سیاسەتێ هووردبت. رۆمانێن وی یێن ناڤدارێن مینا "تاوان ئوو سزا"، "خەشیم" ئوو "برایێن کارامازۆف" هەنە.

(٢) ئەلبێر کاموو (Albert Camus) (١٩١٣–١٩٦٠) نڤیسکارێ ناڤدارێ فرانسایی–جەزاییری کۆ ل سالا ١٩٥٧ێ خەلاتا نۆبلێ ژبۆ ئەدەبیاتێ وەرگرت. د کتێبێن خوە دا ئەو ل سەر پووچی یا ژیانێ دسەکنت. رۆمانێن وی یێن مینا "بیانی"، "کالیگۆلا"، "چیڤانۆکا سیزیێفی" ئوو "تاعوون" ناڤدارن.

(٣) فرانتس (Franz Kafka) (١٨٨٣–١٩٢٤) نڤیسڤانێ ناڤدارێ نەمسایی–چیکی کۆ کتێبێن وی مشتی رەشبینی ئوو بێهیڤیتیێ نە. وی وەسیەت کربوو کۆ پشتی مرنا وی دەستنڤیسێن وی بسوژن، لێ هەڤالێ وی ب گوهێ وی نەکر ئوو کتێبێن کۆ کافکا ژبەر وان ناڤدار ("مەحکەمەکرن"، "کەلا"، ئوو "ئەمەریکا") ئەون یێن کۆ پشتی مرنا وی چاپ بوونە.

یە: ئەگەر هون ئەجێبمایی مانە کا چاوا ئەڤ دبت، دێ شیرەتەکێ ل هەوە بکم کۆ د هەر کارەکی دا کۆ هەوە دەست پێکری یە ب تڤاڤی مەلەڤان ببن. هزر، هش، ژیرەکی، ئاگەهی ئوو تێگەهشتن یێن وان کەسانە کۆ ب تڤاڤی خوە د کار ئان پیشە یا خوە دا نقووم دکن. ئەگەر هون دخوازن ژبۆ وەرگرتنا هزرێن نوو هەیامەکێ بێهنا خوە بدن ئوو خوە ژ کارێ خوە دوور بکن، هون ب رێیەکا گەلەك شاش دا چوونە.

نڤیسین ژ سەرکێ قەلەمی ژ دایك دبن. هون دبێ هند بنڤیسن، هند بنڤیسن هەتا هزرەکا نوو بدەستڤە بهێت. ب ڤی ئاوایی ژی هزرا ئافرینەر ئوو باوەری یێن بلند د بیاڤێن دی ژی دا ب خوەنقوومکرن ئوو ب کووری-لێ-هزرینێ بدەستڤە دهێن. عەبقەری (= نابغە، جینیەس) بوون هەما ٩٩ ژ سەدێ ب خوەماندیکرنێ ڤە گرێدایی یە. ژبۆ هندێ کۆ د پیشە یا خوە دا ببن عەبقەری، خوە تێدا نقووم بکن. ب کورتی ئوو کورمانجی، تێگەهشتن ئوو ئاگەهی یێن درست بدەستڤەبئینن ئوو وان کوورتر ئوو کوورتر بکن.

**بەهرا شەشێ**

# گرنگی یا نووخوازیێ ئوو ئافراندنێ

نێزیکی دەه سالان بەری نها، رۆژنامەیا "دونك- ویلی" یا بازاری سیۆلێ ژ من خوەست کۆ د جڤینەکا فێرکرنێ دا ژبۆ کارمەندێن پایە بلندێن وێ رۆژنامەیێ بئاخڤم. ژ من هات خوەستن کۆ نێزیکی چاخکەکێ (= سەعەتەکێ) ل سەر رێڤەبرنا شەریکەیان ئوو بیرووباوەرێن خوە ل سەر رێڤەبرنێ بئاخڤم. گەلەك دوور بوو کۆ ئێك هزر بکت بازرگان ئوو پیشەسازەك ژبۆ دەستەکەکا بەرپرسێن رۆژنامەیەکێ بئاخڤت. باشترە ببێژم کۆ هەما من ئەدەب کر ئوو من ئەو داخواز پشتگوهڤە نەهاڤێت.

نێزیکی چاخکەکێ، ئەز ل سەر رێڤەبرنا شەریکەیان ئاخڤتم. تشتێ من گۆتی هنگی دگەل سمت ئوو پێڤاژۆ یا گوهاررتنێن دناڤ رێڤەبرنێ دا دگونجیا. ل دووماهی یا ئاخڤتنێ، ئێك ژ رێڤەبەرێن رۆژنامەیێ ژ نشکێڤە پرسی: "ئەگەر تو رێڤەبەرێ رۆژنامەیەکێ بای، دا بزاڤێ بکی چ نووخوازی ئوو ئافراندنەکێ بکی؟"

ئەز کۆ هەمی جاران ل دەرڤەیی چالاکی یێن رۆژنامەڤانیێ بوومە، هەما ئاخڤتنا د وێ جڤاتێ دا ژبۆ من زەحمەت بوو. ب سەر هندێ را ژی، پرسیارەکا وەسا چاڤەرێ- نەکری ژ من هات پرسین. ژبەر وێ ئەز شەپلیم ئوو شەرپزە بووم.

ل دووماهیێ، تشتەك هات هزرا من، "کووباوو". ئەڤ پەیڤ د زمانێ کۆرەیی دا ناڤێ وان سەرهاتێن پێکەنۆك یێن کورتن کۆ ب ئاوایێ وینە یێن کارتوونی د رۆژنامەیان دا چاپ دبن ئوو ئەڤرۆ گەلەك ئالیگر ژی هەنە. من ب خوە ژی گەلەك ژ وان حەز کری یە. من بالا خوە دابوویێ کۆ پررانی یا خەلکی دپێشدا ل بەرپەرێ ئێکێ ئوو نڤیسارێن بەرپەرێن پێشی یا رۆژنامەیێ درامینن ئوو ئەگەر تشتەکێ ب دلێ وان

تێدا نەبت، بەرپەران هلددن هەتا دگەهن بەرپەرێن جڤاکی ئوو مالباتی کۆ ب ئاوایەکێ ئەدەتی ل داوی یا رۆژنامەیانن.

ل وان بەرپەران تشتێ ژ هەمیان بالکێشتر ئەو سەرهاتێن کۆمیدی ئوو کارتوونی بوون، کۆ ل کوژی یێن ژۆری ل بەرپەرا بەری دووماهیێ چاپ دبوون.

کەسێن کۆ بانگەوازان ددن رۆژنامەیان، دخوازن کۆ بانگەوازێن وان ل وێ بەرپەرێ چاپ ببن، ژبەر وێ کۆ خەلك زێدەتر ل وان بەرپەران دنهێررن ئوو ب گۆتنەکا دی زێدەتر بەر چاڤن. ژبەر وێ بهایێ بانگەوازێن کۆ ل وێ بەرپەرێ بەلاڤ دبن ل چاڤ بەرپەرێن دی گرانترن. هەر دەما ئەز وان پشکێن پێکەنۆك دخوینم، هزرەکا نوو دهێت مەژی یێ من. ژبەر وێ کۆ خەلك فێری خویندنا وان بابەتان بوونە، بەلاڤکرنا بانگەوازان ل وێ بەرپەرێ ب ئاوایەکێ خوەرسکی دێ زێدەتر بالا خەلکی رابکێشت، نەمازە ئەگەر پشتی پێنج رۆژان ل پەی ئێك بانگەواز ل شوونا وان بهێن بەلاڤکرن، ئانکۆ ل رۆژا شەشێ هون بانگەوازان ل وێ بەرپەرێ چاپ بکن. ئەگەر وەها ژی نەکن، دکارن پچەکێ ناڤبەرا وینەیان زێدەتر بکن ئوو دناڤبەرا وان دا بانگەوازان چاپ بکن، هنگی بێگومان دێ کارتێکرنەکا زێدەتر هەبت. پشکەکا هۆسا بهاگران کۆ خەلك دبێژنێ "کووباوو" ئانکۆ وینە یێن کارتوونی یێن پێکەنۆك، بێ گومان ژبۆ بازرگانان ئوو شەریکەیان گەلەك بالکێشن. ژبەر وێ من ئەڤ بابەت د بەرسڤا پرسیارا وی رێڤەبەری دا گۆت.

هەیامەکا کورت پشتی وێ گۆتارا من، ئەز پێ حەسیام کۆ چاوا من د وێ گۆتارێ دا گۆت بوو، وەسا دناڤبەرا "کووباوو"ان دا بانگەواز ل وێ رۆژنامەیێ هاتن بەلاڤکرن.

نووخوازی تشتەك ئوو پێدڤیەکا بناغەیی یا ژیانا مرۆڤانە. هند ژی زەهمەت نینە. هەمی گاڤان ئوو ل هەمی دەران ئەز ڤێ تەکەز دکم کۆ نووخوازی ب خوە نە گرنگە، گرنگ ئەوە کا هون دخوازن نووخواز بن ئان نە.

ئەگەر هون ب هووری ل نووخوازیێ ئوو ئافراندنێن بهاگران بنهێررن، دێ ببینن کۆ بناغەیێ گەلەك ژ وان ب راستی هندەك هزرۆکێن گەلەك سادە نە. گەلەك جاران ژی ئەنجام ئوو ڤەرێژێن پررمفا هەنە. نووخوازی د رێڤەبرن ئوو کارگێری یا شەریکەیان دا گەلەك ب تەسیرن.

نووخـوازی، ئافرانـدن ئـوو ئـیختراع د دیرۆکـا مرۆڤـانتیێ دا گەلـەك ب بانـدۆر (= تەسیر) بوونـە. نووخـوازی ئـوو ئافرانـدن ب خـوە‌ئێکـدلکرن، برریـاردان ئـوو ڤیانـا کەسـێن ئافرینـەر ڤـە گرێـدایی نـە، کەسـێن کـۆ دخـوازن ب تێکـشکاندنا هـزرۆکێن ئەدەتی ئوو هـەیی ل ڤـێ دەمـێ ئـوو ل ڤـی چاخی تـشتەکێ نـوو پێـشکێش بکـن ئـان ژ نوو ڤە چێ بکن.

ژبەر وێ، مـن گەلـەك جـاران تەکـەز کـری یـە کـۆ نووخـوازی ئـوو ئافرینـەری ژ بـۆ مرۆڤـان گەلـەك گرنگـە. خـەلکێ ئافرینـەر ئـوو ئاڤاکـەر سمـت ئـوو سـوویا دیرۆکـێ دگوهێررن.

پەروەراندنا ئافرینەریێ ب ڤەکۆلین ئوو زانینا رەوشا هەیی دەست پێ دکت: "ئەرێ من هەمی بزاڤا خوە کـری یـە؟"، "ئـەرێ رەوشـا نها دلخوازە؟"، "ئـەرێ رێیـەکا باشـتر هەیە؟". پرسـیارێن وەهـا ئافرینـەری یـێن نەپـەن ئـوو ڤەشـارتی یـێن هـەوە شـیار ئـوو چەلەنگ دکن ئوو هندی هون پررتر ڤەبکۆلن زێدەتر دگەهن ئەنجامێن باش.

ئەڤ باوەری یا من یا ژ‌دلە کۆ جوان دبێ بزاڤێ بکـن رەوشـا هـەیی باشـتر بکـن، ئـوو ژبۆ ڤێ ژی ئافراندن پێـدڤی یـە. دەمـا هـون ل ئالیـەکێ نـوو ڤـە، ل راسـتەکا دی ڤـە، ل بابەتی هوور دبن، هون دێ زێدەتر پێزانینان بدەستڤە بئینن. ئەڤ پێـزانین دبـێ هـەوە بەر ب پێشکەڤتن ئوو ئاڤاکرنێ پالبدن. ژبەر وێ کۆ جوان کێمتر بەندی یێن ڤەید ئـوو زنجیرانـن، ب ئاوایـەکێ خوەرسـکی زێـدەتر ژ خـەلکێ ناڤـسالڤەچوویی نووخـوازن ئـوو دکارن ئافراندنان بکن.

دەما ئەز ژبۆ جارا پێشێن پشتی داویکرنا خویندنا خوە یا زانینگەهێ مژوولی کاری بـووم، ئـەز بەرپرسـێ پێڤـەنی (= تێکهلـی) یـێن کـارێن دراڤـی یـێن شـەریکە یـا نـوو دامەزریایی یا ب ناڤێ شەریکە یا پیـشەسازی یـا "هـەنانگ"ێ بـووم. کـارێ مـن ساناهی بوو، تـەنێ دبیـا مـن هنـدەك بەلگـە ل دراڤخانـەیا (= بانکا) هاڤلدار ژ پـشکەکێ بربـان پشکەکا دی دا لێکۆلین ل سەر بهاتبان کرن دا بزانیبا ئەرێ هەژی یـێ هنـدێ بوونـە کـۆ ژبـۆ بەرپرسـێن بلندپایـەتر ل دراڤخانـەیێ (= بـانکێ) بهاتبـان هنـارتن ئـان نـە. ئەگـەر بەلگە نەهاتبان پەژراندن، شـەریکەیا مـە دێ گوهـاررتنێن پێـدڤی بکربـان ئـوو مـن دێ دیسا ئەو بەلگە دابان دەستێ پشکا لێکۆلینا بەلگەیان.

بەری كۆ ئەز وی كاری وەربگرم، كەسەكێ دی ل سەر وی كاری بوو. وی ژی هەر ئەڤ كارێ سادە دكر ئوو تووشی گەلەك ئاریشەیان دبوو. رۆژێ هەمیێ ئەو مژوولی هاتووچوویا دناڤبەرا دراڤخانەیێ (= بانكێ) ئوو شەریكەیێ دا بوو. برنا بەلگەیان بۆ دراڤخانەیێ هەر جار هندەك ژ وەختێ وی دبر ئوو ئەگەر بەلگە درست نەبان دێ بهاتبان زڤراندن ئوو دیسا دا وەختێ وی ببن. پشتی من ئەو كار وەرگرت، ئەز ل ڤۆناخێن وێ پێڤاژۆیێ هوور بووم دا بشێم ئاریشەیان ڤەببینم ئوو بزاڤێ بكم كۆ چارەسەرەكێ ژبۆ ڤەببینم.

ژبەر وێ، وەكی پێنگاڤا ئێكێ، من برریار دا كۆ تێكهلیەكا دۆستانە ئوو گەرم دگەل كارمەندێن پشكا وەرگرتنا بەلگەیان ل دراڤخانەیێ چێ بكم. دكارم ببێژم كۆ هەمی كارمەندێن وێ پشكێ ژن بوون ئوو وان دگۆت كا بەلگە ب كێری هندێ دهێن بۆ ئاستێن بلندتر بهێن هنارتن ئان نە. ئەگەر تەڤەزا شاشیەكا بچووك ژی د وان دا هەبا، ئەو ستی (=خاتوون) دكارین وان چێڤە بكن ئوو بهنێرن پشكا ژ خوە پێهەلتر. هەلبەت ل ڤێدەرێ ژی پرسگرێكا هەڤرركیێ هەبوو. گەلەك شەریكەیان بەلگە یێن بێهژمار ددان وان ئوو چەند بەلگە یێن هەوە ب بن بەلگە یێن شەریكە یێن دی بكەڤتبان، هند ژی دبیا بوو هون ل چاڤ وان شەریكەیان زێدەتر ل بەندێ بمینن.

هنگی ئمبارێن شەریكە یا مە تژی بوون ژ كنجێن ژنان كۆ ژ دەرڤەیی كۆرەیێ دهاتن، ژ ئیتالیایێ، ئوو نەدهاتن فرۆشتن ئوو ل سەر دەستێن مە مابوون. بەرپرسێ وان ل دەلیڤەیەكێ دگەرییا كۆ وان بمەزێخت. ژبەر وێ من هەر دو بابەت ل رەخ ئێك دانان. كنج ل ئمبارێ دبن تۆزێ ڤە دبوون ئوو رەنگ بوو كۆ ژنێن كارمەند ل بانكێ ژ وان حەز كربا. ڤێجا من ل نك خوە وەسا حەسباند كۆ ئەگەر وان كنجان ب بهایەكێ ئەرزانتر بفرۆشین وان كارمەندان، شەریكە یا مە دێ فاییدە كربا ئوو ئەو پەرتال ژی ئێدی ل ئمبارێ نەدمان.

ب كورتی، وان كنجان ئەز ب درستی گەهاندم ئارمانجا خوە، ب ئاوایەكی كۆ وان كارمەندان هەڤالێن خوە ژی دئینان دراڤخانەیێ دا كنجان بكرن. وان ژ پەرتالێن نوو یێن بیانی حەز دكر ئوو بهایێ وان ژی ئەرزان بوو. پشتی هەیامەكێ ئمبارا شەریكەیێ

ژ وان پەرتالان ڤالا بوو ئوو ل ئالی یێ دی ژی بەلگەیێن کو مـن دئینـان دراڤخانـەیێ ل سەرڤەیی هەمی بەلگەیان بوون.

ئاریشەیا دوییێ ئەو بوو کو هێشتا گەلەك دیوانسالاری (= بوروکراتیەت) هەبوو. مـن هزر کر کو رەنگە بشێم وێ نیڤی بکـم. بەلگـە ژ گەلـەك جۆرەیـان نـەبوون، ئـوو تـەنێ هندەك هژمارێن دیارکری تێدا دهـاتن گوهـاررتن. هـەما ببێـژە هـەمی پـشکێن دی یـێن وان وەکهەڤ بوون: ناڤێ شەریکەیێ، مۆرێن پێـدڤی، ناڤنیـشان، رۆژدەم (= تـەئریخ) ئـوو هـ.و.د. لەوما، هندی من دەلیڤە هەبا ل دەمێن خوە یێن زێدە دا من جهێن ڤالا یـێن کـو دوبارە دبوون ئوو سادە بوون تـژی دکـرن. هنگـی کارمەنـدێن شـەریکەیێ هـەر ئێکـی ل گۆرە یێ بەرپرسیاری یا خوە ئامار ئوو هژمارێن پێدڤی ل سەر وان دنڤیسین.

کـار باشـتر بـوو، لـێ هـەر ئاریـشەیەك مـابوو. ئـەز هێـشتا ژی رۆژێ چـەند جـاران دناڤبەرا دراڤخانەیێ ئوو شـەریکەیێ دا دهـاتم ئـوو دچـووم. ب لێکۆلینـەکا زێـدەتر مـن دیت کو ب راستی ژی ژ دو جاران زێدەتر هاتووچوو نەپێدڤی یە. جارەکێ سـپێدێ ئـوو جارەکێ ئێڤاری. کەسێ کـو بـەری مـن ل سـەر وی کـاری بـوو چ جـاران هنـد دەمـا خـوە تـەرخان نـەکربوو دا بـشێت وان ئاریـشەیان کـێم بکـت. ئـەو پـێ نەحەسـیا بـوو کـو بەلگەیێن ل سپێدەیان دهێن پێشکێشکرن، تـەنێ ل هێڤاریـان دهـێن بـەرلێکۆلینان ئـوو بەلگەیێن کو هێڤاریان دهێن پێشکێشکرن رۆژا پاشتر سپێدەیێ.

ب نـەزانینا ڤـێ، وی هـەمی رۆژا خـوە ب هاتنووچـوونا دناڤبـەرا دراڤخانـەیێ ئـوو شەریکەیێ ڤە دەرباز دکر ئوو هەرجار هندەك بەلگە ددان وان ئوو هنـدەك وەردگـرتن. ب سەر هندێ را ژی، وی هەما درست ئەو کار دکر کو بەرپرسێ وی کاری یـێ بـەری وی ئان بەرپرسێ ژ وی مەزنتر نیشا وی دا بوو. ئەو چ جاران نەفکری بـوو کـو رێیـەکا نـوو ڤەببینت کو کێمتر دەما وی ئوو پارەیێ وی ببت ئوو دەرەنگـتر ژی پێلاڤـا وی بـدرینت. ژبەر وێ من برریار دابوو کو وی کاری ب ئاوایەکێ وەسا بگوهێرم کو دگەل بەرنامـە یـا کارکرنا بانکێ بگونجت ئوو ئاریشە ژی نەمینن.

تەنێ پشتی هەیڤەکێ کو ئەز ل وی کاری بووم، کارەکێ باشتر دا مـن ئـوو ئـەز هـاتم پەسناندن ئوو هەمی دهزرین (= هزر دکر) ئـەز عەبقـەری مـە. ل وان رۆژان، پلەیـەکێ بەرزتر بوون د کاری دا ژبۆ کارمەندەکێ نوو-دامەزریایی پێنگاڤەکا گەلـەك بلنـد دهـات

حەسباندن. لێ سەرکەڤتنێن من تەنێ گرێدایی شیانێن من د تێگەهشتنا د ئاریشەیان ئوو ڤەدیتنا وان ئوو پاشتر ژی چێڤەکرنا وان دا بوو.

گەلەك سال بهورین. ئەز مژوولی چارەسەکرنا گەلەك ئاریشە یێن دی بووم، هەتا ئەز شیام شیانێن خوە یێن ئافراندنێ خورتتر بکەم. ب مسۆگەری دکارم ببێژم کۆ وان شیان ئوو ژێهاتی-بوونێن من شەریکە ب پێش ئێخست، ئوو ئەڤ هەمی دەیندارێن وان ئافراندنێن بچووك ئوو مەزن بوو کۆ ل جهێن جداجدا ئوو ل کارێن جداجدا دا دهاتن کرن. ئافراندن تەنێ د پیشەسازی ئوو بازرگانیێ دا نینە. دەرهەڤا خویندنێ ئان هەر قۆناخەکا دی یا ژیانێ ژی دا ئەڤ درستە. ئەگەر هەوە ل دبستانێ دەرسەك هلبژارتی یە کۆ ژێ حەز ناکن، ب دلگەرمی ڤە دکارم ببێژم کۆ ئاریشە د دەرسێ ب خوە دا نینە، ئاریشە چاوایی یا سەرەدەریکرنا هەوە یە. هون دبێ بزانن کۆ ئاریشە چەند مەزن ژی بت، چارەسەر هەر هەنە.

هون نکارن ب تەماشەکرنا ل بنەما ئوو مەنتق ئوو ڤەخویندن ئوو تێگەهشتنا پەیڤ ب پەیڤ ئوو هەڤۆك ب هەڤۆکا کتێبەکێ ب درستی د بابەتێ دەرسێ بگەهن ئوو لێ مەلەڤان ببن. هەر ب ڤی ئاوایی، هون نکارن ب لبەرکرن ئوو دوبارەکرنا وێ دەرسێ ل سەر وێ دەستهەل ببن. تێگەهشتن ئوو تێدەرئینانا تڤاڤا هەر بابەتەکی ب پێگری ئوو وازلێنەئینانێ دەست پێ دکت، ئانکۆ خوە نقوومکرن ئوو مەلەڤانکرنا د بابەتی دا ئوو سەروەختبوون ئوو ئاگەهداربوونا ل هەمی هوورهوورکێن دەرسێ ئوو بابەتێن پێراگرێدایی. خویندن ئوو تەماشەکرنێن سەرپێیی ئوو بلەز ب تڤاڤی بێ مفانە. ئەڤ رێباز چ جاران هەوە بەر ب ئافراندنێ نابت. ب کورتی، چ جاران گرنگی یا نووخوازی ئوو ئافراندنێ ژبیر مەکن.

# کەسێن کۆ تەسیرا وان ل سەر من هەیە

جارەکێ "مارتینێ بووبەر"[1] ئاخڤتنەکا ب تەسیر ئـوو بـالکێش کـر. وی گۆت ژیانـا راستین یا مرۆڤان ب هەڤدیتنان دەست پێ دکت. ئەز ب درستی تـێ دگـەهم کـا مـەرەما وی ژ ڤێ گۆتنێ چ یە. ئەز ژ دل باوەرم کۆ چاوایی یـا ژیانـا هـەوە ل بـن کارتێکرنـا وان کەسانە کۆ هون دبینن. لەوما، ژبـۆ هـەوە جـوانێن کـۆ ل رامانـا درسـتا ژیـانێ دگـەررن، دۆست ئوو هەڤالێن هەوە گەلەك گرنگن.

ل قۆناخا جوانی ئوو لاوینیـێ، کەسـێن کـۆ دگـەل هـەوە رادبـن ئـوو روودنـن دکـارن تەسیرەکا مەزن ل پاشەرۆژا هەوە بکن. لەوما، گەلـەك گرنگـە کـۆ دگـەل مـرۆڤێن چـاك بگـەررن. دبیـا هـون کەسـێن کـۆ جهـێ رێـزێ نـە ئـوو د ژیانـا خـوە دا رێ یـێن درسـت هلبژارتنە بکن نموونەیێن خوە. رەنگە ئێك ژ سەدەمێن کۆ ئەم وینە یێن کەسێن وەهـا د ئەلبوومێن خوە دا ئان ل سەر دیوارێ مالێن خوە ئـان جهێن کـارێ خـوە ئـان ل سـەر مێزا خوە هلدگرین ئەڤ بت. هون ب خوە تەنێ بیستکەکێ (= لەحزەیەکێ) ل جداتی یا ناڤبـەرا ژیـان ئـوو پاشـەرۆژا کەسـەکی کـۆ ل پـەی فەیلەسـووفەکێ رەشـبینێ وەکـی "شـۆپنهاوەر"ی[2] دچـت ئـوو کەسـەکێ کـۆ ل پـەی مرۆڤـەکێ وەکـی "گانـدی"[3]،

---

(١) مارتینێ بووبەر (Martin Buber) (١٨٧٨–١٩٦٥) فەیلەسووفێ جهوو یێ نەمـسایی کۆ فەلسەفەیا خوە ل سەر دانووستاندنێن مرۆڤان دامەزراندی یە.

(٢) ئارتوورێ شـۆپنهاوەر (Arthur Schopenhauer) (١٧٨٨–١٨٦٠) فەیلەسـووفێ رەشبینێ ئەلمانی کۆ کتێبا وی "جیهان وەکی ڤیان ئوو رامان" گەلەك ناڤدارە. بـاوەری یـێن وی دژبەری باوەری یێن فەیلەسووفێن رامانباوەر (=ئایدیالیست) یێن مینا هێگلی نە.

(٣) موهەنـداس کەرەمـچاند گانـدی (Mohandas Karamchand Gandhi) (١٨٦٩–١٩٤٦) بابێ نەتەوەیی ئوو رێبەرێ شۆرەشا ناتوندووتیژا هندستانێ کۆ هندستان بەر ب سەرخوەبوونێ بر. ئەو دژبەری پارچەبوونا هندستانێ ئوو فەرقووجداتی یـا ناڤبـەرا بسلمانان ئوو هندیان ئوو سیکان بوو.

"لینکولن"[١] ئـان "بـوودا"ی[٢] دچـت ئـوو هـەمی بوونـا وان تـژی ئـەڤینا ئـازادیێ، وەلاتپارێزیێ ئوو بهایێن دی نە بنهێررن ئوو هـون ب خـوە بـبن دادوەر. هـەر ژبـەر وێ یە کۆ گەلەك گرنگە مرۆڤ دگەل کەسێن هەژی رابیت ئـوو روونـت. رێـزێ ل مـرۆڤێن ساخلەم ئوو ڤەنـج بگرن ئوو ل پەی وان هەررن.

د ژیانا خوە دا ئەز راستی گەلەك مرۆڤان هاتمە. هەلبەت، من گەلەك کەسێن بـژارە ئوو بەرکەڤتی ئوو گەلـەك کەسـێن وەسـا ژی دیتنـە کـۆ هـەما نەخوەسـتنە مـن ببیـنن. هندەك ژ وان کەسان هێشتا ل بەرچاڤێن مـنن، هـەر چـندە کـۆ دێـم ئـوو سەرووچـاڤێن خەلکی زووکا ژ بیرا من دچن. لێ تشتەکێ مسۆگەر هەیـە، ژبـۆ هـەوە ببێـژم. ئـەز هـەر تشتەکێ هەبم، من هەر تشتەك ژی هەبت، ڤەرێژا رابوون ئـوو روونـشتنێن مفـادار ئـوو ئاڤاکـەرێن مـن دگـەل هنـدەك کەسـانە. ئـەڤ کەسـن کـۆ زێـدەتر د بـیرا مـن دا مانـە. ب ئانەهی یا هەوە دێ ناڤێ هندەکان بئینم. دایکا من کەساتیەکا بژارە ئـوو شـەریف بـوو. هەر چندە کێم کەس هەنە کۆ رێزێ ل دایکا خوە نەگرن. لێ ئەز زێـدە بێڤـام رێـزێ ل دایکا خوە دگرم. بابێ من دەرسـدێرەکێ جهـێ رێـزێ ئـوو سـتاندارەکێ (= پارێزگـارەکێ، والیەکێ) ئێك ژ ستانێن (= ویلایەتێن، پارێزگەهێن) کۆرەیێ بـوو. لـێ ل دەمـا شـەررێ دناڤبەرا هەردو کۆرەیان دا، هات دیلکرن ئوو بەر ب کۆرەیـا بـاکور هـات بـرن. ژبـەر وێ ئاریشە یێن دایکا من ژبۆ مەزنکرنا پێنـج زارۆ یـێن وێ گەلـەك زێـدەبوون ئـوو وێ ئـەڤ ئەرك ب زەهمەتی ئـوو دژواری ئـوو خوەگۆریکـەری ب ئـەنجام گەهانـد. ب سـەر هـەمی زەهمـەتیان را، وێ تـشتەکێ وەهـا کـر کـۆ ئـەم هـەمی هـەتا زانینگـەهێ بخـوینین. ب وێرەکی ڤە دکارم ببێژم کۆ ژیانا وێ گۆری ژیانا زارۆ یێن وێ بوو. هـەمی ئارمـانج ئـوو فەلسەفەیا من ژبـۆ وەرارا شـەریکەییێ ژی ئـەڤ خوەگـۆریکرن ئـوو ژخوەبهورین بوویـە. دبێ پێزانینێ بکم کۆ ئەڤ رفتارا من ژبەر باندۆرا دایکا من ل سەر من بوویە.

---

(١) ئابراهـام لینکـۆلن (Abraham Lincoln) (١٨٠٩-١٨٦٥) سـەرۆك کۆمـارێ شانزدەهێ یێ وەلاتێن ئێکبوویی یێن ئەمەریکاییێ یە. شـەرێ نـاڤخوەیی یـێ ئەمـەریکاییێ ل دەما سەرۆك کۆماری یا وی بوو.

(٢) بوودا (٥٦٣-٤٨٣ بەری بوونا عیسایی) هزرڤانەکێ نپـالی، کـۆ نـاڤێ وی یـێ درسـت سیدارتا گاوتاما بوو. ئەو دژبەری باوەری یێن هندۆکان دەرکەڤت ئوو گـۆت کـۆ هـەمی بهاییێن مرۆڤان ب چینا وی یا جڤاکی ڤە گرێدایی نینە.

هێشتا ئەز گەلەك بیرەوەریان ب زەلالی ب بیر دئینم. فەلەیەکا (= مەسیحیەکا) ژ- خودێ - ترس، کو رۆژانە چار جاران دعا دکرن ئوو بێ راوەستیان ب دەنگەکێ خەمگرتی حەمد ئوو سەنایا خودێ دکر. دبێ ل ڤێدەرێ ببێژم ژی کو دعایێن وێ هێز ددا من.

جیهانبینی یا فەلاتیێ (= مەسیحیەتی) هەمی خزمەتکرن ئوو خوە گۆریکرنە. تشتێن کو دایکا من فێری من کری ژ ئالیەکی، ئوو خویندنا ل زانینگەها "یۆنسێی"، زانینگەهەکا سەر ب دێرێ (= کلیسایێ) ڤە ژ ئالی یێ دی، دو چەمك ئوو تێگەهێن خزمەتکرن ئوو خوەگۆریکرنێ ب هەمی رامانا خوە ڤە د رەڤانێ من دا چاندن. ژبەر وێ یە کو ئەز باوەرم دین دەورەکێ گرنگ دبینت. هندەك کەس ب شاشی دبێژن کو ئەڤرۆ جیهان گەهشتی یە قۆناخەکێ کو ئێدی حەوجەدارا دینی نینە. ئەو ب گەرمی دەلیلان دئینن کو دین ئێدی بوویە هزرینەکا کەڤن ئوو ل گۆرە یێ کاودانێن ئەڤرۆ نینە. لێ ب نهێررینا من، هندی د ژیانا مرۆڤی دا دودلی هەبن ئوو هندی روخسارێ ژیانێ دگوهاررتنێ دابت ئوو هۆکارێن نەنیاس زێدەتر ببن ئوو هندی مرۆڤ زێدەتر ب پووچی ئوو بێ بهایی یا جیهانا مادی بجەست، هنگی ژبۆ بەردەوامی یا ژیانێ حەوجەدارێ هندەك باوەری یێن پەیت ئوو موکم ئوو نەگوهێرە. تەنێ دین دکارت وان بنەما ئوو باوەرێن نەگوهێر پێشکێشی مرۆڤان بکت، مرۆڤێن کو د جیهانەکا تژی ژ نەبەختیاریان ئوو ئاریشە ئوو ئالۆزی یێن گێژکەر ئوو سەرسامکەر دا دژین. د ژیانا خوە دا، دەما هون جوانێن خوەشدڤی ب کووری ل تێگەها بنگەهینا ژیانێ دهزرن ئوو ل سمت ئوو سوو ئوو ئارمانجەکێ ژبۆ پاشەرۆژا خوە دگەررن، ئەز وەسا دبینم کو گەلەك گرنگە کو هەوە دینەکێ راست ئوو باوەرییەکا دینی یا پاکژ هەبت. دایکا من ئەڤ د گەرمەگەرما ژیانا زارۆتیێ دا نیشا من دا.

د ژیانێ دا چ تشتەك ژ هندێ گرنگترە کو هون هەمی گاڤان دگەل دۆست ئوو هەڤالێن باش ئوو هەژی بن، هەڤالێن کو ب راستی هەڤالێن هەوە ئوو دلسوژێن هەوە بن؟ تو دکاری خەلکی ب هەڤالێن هەڤهزرێن وان بجەرببینی ئوو برریارێ ل سەر بدی. ئەڤ گرنگی یا هلبژارتنا هەڤالان نیشا ددت. هەڤالێ باش نەعمەتەکە، هەڤالێ خراب نەکبەت. هەڤالێن کەڤن هەمی جاران باشترین هەڤالن. هەڤالێ باش کەسەکە کو هون

بشێن گرنگترین نهینی یێن ژیانا خوه ببێژنێ. گەلەك مخابنە كۆ هەوە هەڤالێن وەسا نەبن. د كاروانێ ژیانی دا، گەلەك كار ل پێش هەوە هەنە كۆ دبێ ژبۆ وان بخەتبن. ڤەدیتنا هەڤالێن هەژی ئێك ژ وانە. من هەڤالێن نێزیك زەهف هەنە. ئەم هەمی گاڤان هاریكارێن هەڤ بوونە. ئەز ژ دبستانا بەرهەڤی یا "كی یونگی"یێ دەرچوومە، من گەلەك هەڤ-پۆلی هەبوونە، من گەلەك هەڤالێن هەڤ-دبستانی ژ پۆلێن ژ خوە پێهەلتر ئوو ژ خوە پێداتر هەبوونە ئوو هەمیان ژی گەلەك هاریكاری یا من كری یە. ئەز ژبەر وێ سپاسی یا وان هەمیان دكم.

جێگرێ سەرۆكێ دەستەكا رێڤەبرنێ ل شەریكەیا "دێوو"یێ سەیدایێ "لی- وو بووك" ئێك ژ هەڤ-پۆلی یێن من بوو. ل سالێن دەستپێكا دبستانا بەرهەڤی ئەم ل پۆلەكێ بوون. ئەو بەرڤاژی من شاگردەكێ نموونە بوو. د كاودانێن ئالۆز یێن پشتی شەررێ كۆرەیێ دا، دبستانا من جهێ دژواری یێن ژیانێ بوو. من نێزیكی سالەكێ خویندن هێلا. لەوما، دەما ئەز دیسا ڤەگەرریام سەر خویندنێ، من گەلەك ئاریشە ل خویندنێ هەبوون. دەرەجەیێن من گەلەك باش نەبوون ئوو ئەنجاما كارێ من تشتەك نەبوو كۆ مرۆڤ شەهنازیێ پێ بكت. لێ، چەند ئەم بەر ب سالێن دووماهیێ دچوون، دەرەجەیێن من وەكی دەرەجەیێن باشترین شاگردێن پۆلێ لێ دهاتن ئوو ژبۆ وان دەرەجەیێن باش ئەز دەیندارێ هەڤالێ عەمرێ خوە ئانكۆ سەیدایێ "لی- وو بووك"م.

ئەز ژبۆ دەرسخویندنێ ب هاریكاری یا وی چووم نڤستنگەهەكێ كۆ ئەو لێ دژیا. ئەز شاگردەكێ ئاریشەمەند ئوو ب سەرئیش بووم، ئوو ئەو نموونە ئوو میناكا شاگردەكێ هەژی. رەنگە من گەلەك ئاریشە ئوو سەرئیش ژبۆ وی چێكر بن، لێ وی نە هەما هەڤالینی یا من ب دل ئوو جان پەژراند بوو، د خویندنێ دا ژی گەلەك هاریكاری یا من دكر. ڤێ هەڤالینی یا مە گەرمتر ئوو موكمتر دكر.

لێ، من ژبەر ڤێ چەندێ ب تەنێ ژ وی حەز نەدكر. دەما من شەریكەیا "دێوو"یێ دامەزراندی، ڤەدیتنا مرۆڤەكێ هەژی ئوو جهێ باوەرێ گەلەك زەحمەت بوو، لێ وی گەلەك زوو بەرهەڤی یا خوە دیاركر ئوو ئەو بەرپرسیاری وەرگرت. ب راستی ژی ئەز نكارم ئوو نزانم چاوا ئوو ب چ زمان سپاسی یا وی بكم. ئەو كەسەكێ هەژی یە كۆ ئەز حەوجەدارێ وی بووم ئوو ژ هنگی وەرە دگەل منە.

ئێك ژ دەرسدێرێن دبستانا بەرهەڤی ژی ژ وان کەسانە کۆ د ژیانا من دا گەلەك کار ل من کری یە. ئەو سەیدایێ "ری سووك- هی" بوو کۆ پاشتر بوو سەرۆکێ زانینگەها "چانگ وانگ"ێ. ئەو نها ژی سەرۆکێ دەستەکا رێڤەبەری یا کارگێری یا "بنگەهێ دێوو"یێ یا سەر ب دەستەکا "دێوو"یێ یە. ل سالێن دەستپێکێ ل دبستانا بەرهەڤی ئەو دەرسدێرێ من بوو. هەر وەکی من گۆت، ل وان سالان ئەز ژ خرابترین شاگردان بووم. ژبەر وێ کۆ ئەز هنگی ژ کۆلانان ڤەگەرریا بووم سەر دەرسێ، ئەز گەلەك نەحەجمتی ئوو نەراوەستیایی بووم.

ئەز نەدشیام تێ دەربئینم کا سەیدایێ "ری سووك هی" دەرهەڤا من دا چاوا دهزرت. لێ وی ل نیڤی یا پێشینا سالێ ئەز کرم چاڤدێرێ پۆلێ، ئوو ل نیڤی یا پاشی یا سالێ ئەز کرم "ئەفسەرێ رێککرنێ". دەما ئەز بووم ئەفسەرێ رێککرنێ، شێوازا ژیانا من ب گشتی هات گوهاررتن. هنگی ئەز پێ حەسیام کۆ ژبۆ من گەلەك گرنگە کۆ ئەز ل چاڤ شاگردێن دی نموونە بم. هەتا هنگی من گوهێ خوە نەددا رێزگرتنا ل شاگردێن سالێن ژ خوە پێهەلتر ژی، لێ نها ئەز ژ نشکێڤە بوو بووم "ئەفسەرێ رێککرنێ". هەمی سپێدەیان ئەز بێهنەکێ ل بەر نەینکێ (= خوەدیکێ) رادوەستیام دا پشتراست ببم کۆ کنجێن ئێکدەستێن (= یوونیفۆرمێن، زەی مووەحەدێن) دبستانێ دبەر من دا جوان ئوو رێکن. ئەڤ بوو دەستپێکا باشتربوونا من. هێدی هێدی ئەز د دەرسێ ژی دا باشتر بووم. وی دەرسدێری، ئانکۆ سەیدایێ "ری سووك هی" گۆت کۆ ئەز ل پەی هەڤ-پۆلی یێ خوە "لی وو بوك"ی بچم ئوو دەرسا خوە باشتر بکم.

د ژیانا من دا، سەیدایێ "ری سووك هی" کەسێ پێشین بوو کۆ ب شیانێن من یێن نەپەنی حەسیا. ژبەر وێ، ئەز نیاسینا وی وەکی خالەکا وەرچەرخانێ د ژیانا خوە دا دبینم. وی ب زۆرزانی یا خوە کیینیەکا فەرمی ب من دا. من ژی بڕاڤ کری یە کۆ قەرێ وی ل سەر خوە رابکم. من بڕاڤ کر رفتارا خوە بگوهێرم دا ببێژم وی کۆ د برریارا خوە دا شاش نەبوویە. کەس ناخوازت کەسێن کۆ باوەری یا خوە پێ دئینن بێئومێد بکت.

نها دخوازم کۆ بەرێ ئاخڤتنا خوە بدم دایباب ئوو دەرسدێرێن کۆرەیی ئوو هندەك تشتان ببێژم وان کۆ ئالۆزێن زارۆ یێن خوە ئوو شاگردێن خوە نە.

هەمی شاگردێن دبستانان باش نینە. هندەك ژ وان ئاریشەمەند ئـوو ب سەرئێشن. هـەما درسـت ئـەڤ شـاگردێن هۆسـا پێـدڤی یـێن پووتەپێكرنـەكا زێـدەترن. بێگومـان هاوارکرنا ل سەر وان ئوو شکاندنا وان بێ ورجە. هون دبێ شیانێن نەپەنی ئـوو ئێكانـە یێن وان ڤەبنیاسن ئوو سمت ئوو سوویەكا وەسا بـدن وان كـۆ ئـەڤ شـیانێن وان ئەشـكرا بـبن. "ئەنیـشتەین"[1] ل دەسـتپێكێ ل دبـستانێ ب سـەرنەكەڤت. "ئەدیـسۆن"[2] ژ دبستانێ هات دەرکرن. ئەگەر سەیدایێ "ری سووك هی" دەرسـدێرێ دبـستانا مـە نـەبا، ئەز نکارم بئینم بەر هزرا خوە ژی کا دێ چ ب سـەرێ مـن بهاتبـا. ئـەڤرۆ دهێـت گۆتن گەلەك دەرسدێر ل وەلاتێ مە هەنە كۆ ب درسـتی دەرسـدێر نینـە. لێ، ئـەز شـەهنازیێ دکم كۆ من دەرسدێرەكێ درست هەبوویە ئوو ئەڤرۆ دکارم بەرسڤا ڤەنجی یێن وی بـدم ئوو د خزمەتا وی دابم. كەسێن كۆ دكەڤن رێ یا ژیانا هەوە دا دكـارن دەورێـن گـرنگ د ژیان ئوو پاشەرۆژا هەوە دا بگێررن. كەسێ كـۆ هـون د گەرمەگـەرما جوانی یـا خـوە دا وەكی هەڤال هلدبژێرن دكارت سمتا ژیانا هەوە بگوهێررت. لـەوما، ئـەز ئـەڤرۆ گەلـەك ئـالۆزم كـا جـوانێن كـۆرەیێ ئـوو جیهـانێ كـی دكـن نموونـە ئـوو كـی ژ دل ئـوو جان دحەبینن.

د ژیانێ دا گەلەك كەس هەنە كۆ دبێ هون سەرەدەریێ دگەل بكن، ئوو گەلـەك رێ هەنە كۆ دبێ هون پێدا دەرباز ببن. ئەز هیڤیدارم كۆ هون ئـەوقاس بەختـەوەر بـن كـۆ ل مرۆڤێن وەسا راست بهێن كۆ هەژیێ هندێ بن هون پشتا خـوە ب بـاوەری ئـوو زانینـا وان گەرم بكـن ئـوو ل سـەر بهورا وان مفـایێ ببیـنن. رێیـەكا بـاش ژبـۆ برریـاردان ئـوو ڤەنیاسـینا شـێوازێن ژیـانێ ئـەوە كـۆ بنهێـررن كـا وینـەیێن كـی ل سـەر مێـز ئـان دەروودیوارێن ئۆدە یێن هەوە هەنە؟ بهزرن كا رێ ئوو رێبازا وان كەسان هند بها هەیـە كۆ ببن نموونە ئوو میناكێن ژیانا هەوە ئان نە؟

---

(١) ئالبێرت ئەنیشتاین (Albert Einstein) (١٨٧٩–١٩٥٥) فیزیكزانستڤانێ ناڤـدارێ ئەلمانی كۆ ب بیردۆزا نسبیەتا گشتی ئوو نەمازەیی شۆرەشەك د فیزیكێ دا چێكر ئوو ژبەر وێ ژی ل سالا ١٩٢١ێ خەلاتا نۆبلێ ژبۆ فیزیكێ وەرگرت.

(٢) تامس ئەلڤا ئەدیسۆن (Thomas Alva Edison) (١٨٤٧–١٩٣١) داهینەر ئانكۆ موختەرعێ ناڤدارێ ئەمریكایی كۆ بێگومان ناڤدارترین داهینەرێ هەمی دەمانـە، زێـدەتر ژ ١٠٠٠ داهینانێن ب ناڤكری هەنە. ژ داهینانێن وی یێن هەری ناڤـدار گلـۆپێ كارەڤـایی، دەنگنڤیس (قەوان، گرامافۆن) ئوو كامیرایا وینەیێن لڤۆك (كامیرەیا سینەمایی) یە.

**بەهرا هەشتێ**

# ژ ٩ێ هەتا ٥ێ- ژ ٥ێ هەتا ٩ێ

ئەڤرۆ جیهان تژی تشتێن بهادارە: مال، ئەرد، خانی، كار ئوو تشتێن دی. لێ دەم ژ هەمیان بهادارترە. دەم وەكی تیرەكێ یە، كۆ ژ كڤانێ دەرچوو چ جاران ناڤەگەرت. بهورینا دەمێ هەمی تشتان دگوهێررت. نە تو دكاری دەمێ ژبۆ هەمی جاران رابگری ئوو نەژی دوبارە بدەستڤە بئینی. چ شەرڤانەك ژ دەمێ فێرستر نینە ئوو تەنێ ئەوە كۆ سەركەڤتی یا دووماهیێ یە.

"نها" تەنێ بیستكەكە، هەما ب گۆتنا پەیڤا وێ ئەو ژی بهوری یە ئوو بوویە "دەما چوویی" ئوو دەرباز بوویە. رەڤین ئوو بهورین خوەرسكێ خوەزایی یێ دەمێ یە ئوو هەما ئەڤ لڤین دەمێ وەسا بهادار دكت. هون هەمی گاڤان دكارن كارەكێ نوو دەست پێ بكن ئان سەروەتەكا نوو بدەستڤە بئینن. لێ هون چ جاران نكارن دەمێ بندەست بكن. ئێك ژ سالۆخەتێن جوانان ئەوە كۆ ساناهی بهایێ دەمێ ژبیر دكن. جوانی ئەو قۆناخە كۆ هون دەمەكا درێژ ل پێشی یا خوە دبینن. لەوما هون دهزرن كۆ ژدەستدانا هندەكا وێ شاشیەكا گەلەك مەزن نینە. لێ، قەت هۆسا نینە. من دەم ب تیر ئوو كڤانێ شوبهاند دا تەكەز بكم كۆ دەم چ جاران ڤەناگەرت، ئوو تەكەز بكم كۆ دەم وەكی تیرەكا ژ كڤانێ دەركەڤتی ب لەز پێشدا دچت.

چەند سالان بەری نها، ڤێ شەریكەیێ شیعارەكا نوو كۆ روحیەتا راستین یا "دێوو"یێ نیشا ددا هلبژارت. ناڤەرڕۆكا وێ ئەڤ بوو: "ئەم ل ڤێ شەریكەیێ سێ تشتان ب خسار نادین: دەم، ماندیبوون ئوو خەبات" ژبەر وێ كۆ ئەم ب راستی ب گرنگی یا تێگەها دەمێ حەسیا بوون.

سەرکەڤتن ئوو شکەستنا هەر کەسەکی ب تڤاقی ب چاوایی یا مفا وەرگرتنا وی ژ دەمێ ڤە گرێدایی یە. رەنگە هەمی کەس بشێن د هندەك کارێن دیارکری دا هندەك سەرکەڤتنان بدەستڤە بئینن. لێ کەسەکێ کۆ ب کووری دەما خوە بکاردئینت، گەلەك د کارێ خوە دا سەرکەڤتیترە.

خسارکرنا دەمێ ژ خسارکرنا پارە ئوو دراڤی گەلەك کامباخترە. ژبەر وێ کۆ هون هەمی گاڤان دکارن پارەی بدەستڤە بئینن، لێ دەم چ جاران ڤەناگەرت. هندەك جاران هون دبهیسن کۆ ئێکی هند وەخت هەیە نزانت چ لێ بکت. تێگەهشتنا د ڤان بابەتان، نەمازە دەما ژ ئالی یێ جوانان ڤە بهێت گۆتن، گەلەك زەهمەت ئوو دژوارە.

ڤەت رۆژەکا تڤاڤ ژبۆ بجهکرنا کارێن من تێرا من نەکری یە. هندەك جاران ئەز دعایێ دکم کۆ رۆژ ل شوونا ٢٤ چاخکان، ببا ٣٠ ئان ٤٠ چاخك. ژبەر وێ کۆ دەم ل نك من هند بهاگرانە. هندەك جاران د ترومپێلێ دا ئوو ل رێیێ دەستووچاڤێن خوە ب خاولیەکێ پاکژ دکم، ئوو هندەك جاران تێشتێن خوە ژی د ترومپێلێ دا دخوەرم. ب سەر ڤێ را، گەلەك ژ دەمێ من ب سەفەرێن دەرڤەیی کۆرەیێ دبهورت. سەفەرێن من زەهڤ ئوو درێژن کۆ ئەگەر د کتێبا "تۆمارێن جیهانی" دا پشکەك ژبۆ سەفەران هەبا، مسۆگەر دا ناڤێ من ل دەستپێکا لیستە یا وێ دابت.

ئەز نەمازە ل سەر گوهورینا فررۆکەیان حەساسم، ژبەر وێ کۆ ژ مەزاختنا دەمێ بێزارم. سواربوونا ژ فررۆکە یا شاش رۆژەکێ-دوان ژ دەمێ زرر دکت. هندی ژ من بهێت فررینێن شەڤانە هلدبژێرم دا دەما خوە زرر نەکم. ئەز ل دەما فررینێ تێرا خوە بێهنا خوە ددم ئوو دنڤم ئوو دەما ژ فررۆکەیێ دهێم خوار، ل سەر خوە مە ئوو بەرهەڤی دانوستان ئوو دیتارێن کارێ خوە مە. هندەك جاران ل دەما فررینێ دا تشتان دخوینم ئان ل سالخێن (= راپۆرتێن) پشکێن شەریکەیێ رادمینم.

ژاپۆن وەلاتەکێ گەلەك نێزیکە. لەوما هەر دەما پێدڤی بت دچم وێدەرێ. هەمی سەفەرێن من ل گۆرەیێ بەرنامەیەکا هوورن. خەلکێ کۆ بێ ئارمانج سەفەران دکن دەرڤەیی وەلاتی جهێ ئەجێبمانا منن. ژ ڤێ خرابتر ئوو نەبەرهۆزتر ئەو دەمە یێ کۆ کەسێن وەها د وان سەفەران دا زرر دکن. مە ل شەریکەیا "دێوو"یێ هندەك ئەدەت ئوو تەڤالید هەنە. ئەم جڤین ئوو روونشتنێن خوە ل دەما کارێ فەرمی ناکین. هەمی

جڤین بەری ئان پشتی دەما کارێ فەرمی نە. ب ڤی ئاوایی ئەز دکارم دگەل سەرۆکێن هەمی پشکان ل چاخك ٧ێ سپێدێ بروونم. ژ من را هاتیە گۆتن کو کارمەندێن "دێوو"یێ ب حەنەك ڤە دبێژن وان روونشتنان "ئاییننێن دعایا سەحارێ".

ئەڤ نیشانا هندێ یە کو ئەم ل "دێوو"یێ ب چاڤێ تشتەکێ گەلەك بهاگران ل دەمێ تەماشە دکین ئوو رێزێ لێ دگرین. ئێك ژ هۆکارێن ب تەسیر کو "دێوو" گەهاندی یە ڤێدەرێ رێزگرتن ئوو لبەرچاڤگرتنا دەمێ ئوو مفاوەرگرتنا ژ دەمێ یە. هەر چندە کو چالاکی یێن "دێوو"یێ ل چاڤ شەریکەیێن تێکهەل یێن دی دەرەنگ دەست پێ بوون، لێ ب سەر هندێ را، دو هۆکارێن جوانی ئوو دەمێ تەسیرەکا مەزن ل پێشکەڤتنا ڤێ شەریکەیێ هەبوویە. ژبەر جوانبوونا خوە ئەم ئافرینەر ئوو پێگربوونە ئوو مە باوەریەکا موکم ئوو نهێررینەکا جێگرتی ژبۆ بەرفرەهترکرنا چالاکی یێن خوە ل ئاستەکا ناڤنەتەوەیی دا هەبوویە. پێشکەڤتنا بەرچاڤ یا ڤێ شەریکەیێ ژبەر وێ بوو کو مە هەمیان هەست ب بهایێ دەمێ کربوو ئوو ئەم بەرهەڤی هەمی خوەگۆریکرنان ژبۆ وەرار ئوو پێشکەڤتنا شەریکەیا خوە بوون. گەلەك کەس پێشکەڤتنا بێ وینە یا شەریکەیێ د ڤان ٢٢ سالێن بهوری دا وەکی موعجیزەیەکێ دبینن. هندەك کەس ژی گومانان ل ڤێ پێشکەڤتنێ دکن. لێ تشتێ کو دبێ بێژم بیرا وان کەسان ئەوە کو پێشکەڤتنا مە تەنێ د چارچووڤێ ٢٢ سالێن سالژمێرێ (= تەقویمێ) دا نەبینن. ژبەر وێ کو مە ل ڤێ هەیامێ، ب راستی دو قاتی خەلکەکێ دی کارکری یە. ڤێ شەریکەیێ ل شوونا دەما کاری یا ئەدەتی یا نەهێ سپێدێ هەتا پێنجێ هێڤاری، ژ چاخك ٥ێ سپێدێ هەتا ٩ێ شەڤێ کارکری یە.

ئەز هێشتا ژی رۆژێن دەستپێکێ ژ کارێ "دێوو"یێ ب زەلالی ب بیر دئینم کو دگەل دەما چاخکێن (= سەعەتێن) بەربەندکرنا هاتنووچوونێ دناڤبەرا چاخکێن ١٢ێ شەڤێ هەتا ٤ێ سپێدێ بوو. وی چاخی مە گەلەك جاران روونشتنێن خوە دئێخستن پشتی دەما فەرمی ئوو گەلەك جاران هەتا هەیامەکا خوەش پشتی نیڤا شەڤێ ژی وان روونشتنان ڤە دکێشا. مە گەلەك خوە ماندی دکر ئوو ئەم دوقاتی شەریکەیێن دی بخەبتین. لەوما، دەستکەڤتێن مە ب درێژاهی یا ٢٢ سالان رەنگە ب قاسی دەستکەڤتێن شەریکەیەکا دی ب درێژاهی یا ٤٤ سالان بن. ئەز مسۆگەر دزانم کو هەر شەریکەیەکا

دی خوە وەکی مە ماندی بکت، دێ وەکی "دێوو"یێ سەربکەڤت، ئەگەر چ شاشیەك د چاوایی یا کارکرن ئوو خەباتا وێ دا نەبت. شەڤ ئوو رۆژەك ژبۆ هەمیان وەکی ئێکە ئوو ٢٤ چاخکە، لێ جداتی د هندێ دایە کا هون چاوا مفایێ ژ وان ٢٤ چاخکان وەردگرن. ئەگەر کەسەك د رۆژەکێ دا سێ-ڤاتی خەلکێ دی کار بکت ئوو بخوینت، ئەو سێ رۆژان ل پێش خەلکێ دی یە. ئەشکرا یە کۆ بابەتێ گرنگ چاوایی یا چالاکیێ، مفاوەرگرتنا هەژی ژ دەمێ ئوو تەسیرا ئەرێنی یا وێ د ژیانێ دا یە.

دەما خوە ب ئاوایەکێ ژیرانە بکاربئینن. هەر بیستکەك تەنێ جارەکێ دهێت ئوو ژبەر ڤێ ژی گەلەك بهاگرانە. ژ هەمیێ گرنگتر، ل ڤۆناخا جوانیێ، دەم گەلەك بهاگرانە. مرۆڤ دکارت ب ئەشکرایی ببێژت کۆ سێ-چارڤاتی دەما پیریێ بهادارە. د راستیێ دا، مفاوەرگرتنا ژ دەمێ ل جوانیێ رێبازا ژیانا هەوە ئوو ستاندەرا ژیانا هەوە ل پاشەرۆژێ دیار دکن.

"سێنێکا"ی[1] جارەکێ چاوایی یا بکارئینانا دەمێ ب ڤی ئاوایی بەرئێکڤەدا بوو. وی باوەر دکر کۆ ژیان تێرا خوە درێژە. ئەگەر مرۆڤ ب ئاوایەکێ کێرا ئوو مفادار دەما خوە بکاربئینت، درێژی یا ژی ئوو عەمرێ وی هند هەیە کۆ بکارت دەستکەڤتێن مەزن بدەستڤە بئینت. لێ ئەگەر ژی یێ مرۆڤی ب بێکاری ئوو بێکێریێ ڤە بەردەوام بکت ئوو چ ئارمانجەك د ژیانێ دا نەهێت دیارکرن، پشتی بهورینا دەمەکێ کورت دێ پێ بحەست کۆ ئێدی دەمەك ژبۆ گوهارتنا سمتا ژیانێ نەمایە. "سێنێکا"ی باوەر کربوو کۆ ژی یێ مرۆڤان کورت نینە، لێ ئەم ب زررکرنا دەما خوە، ژی یێ خوە کورت دکین. مرۆڤ دکارت ب خەبات ئوو خوەماندیکرنێ پارەیەکێ زەهف کۆم بکت، لێ ئەگەر د پاراستنا وی پارەی دا هشیار نەبت رەنگە ب گاڤەکێ هەمیێ ژ دەست بدت. لێ کەسەکێ دی رەنگە چ پارەیەکێ وەسا نەبت، لێ بکارت ب هشیاری ڤە ئوو ل دەمەکا درێژ وی

---

(١) لووسیوس ئانائیوس سێنێکا (Lucius Annaeus Seneca) (٤ێ بەری عیسایی– ٦٥ێ پشتی عیسایی) کۆ ب سێنێکایێ جوان ژی هاتی یە نیاسین، فەیلەسووفەکێ ناڤدارێ رۆمانە. ئەو فەیلەسووفەکێ رێبازا "رەواقیان"ە ئوو ئێك ژ نڤیسڤانێن چاخێ زیڤین یێ ئەدەبیاتا لاتینی یە. دایکا نیرۆیێ ئیمپەراتۆرێ ناڤدارێ رۆمان ژ سێنێکایی خوەست کۆ ببت دەرسدێرێ نیرۆیی ئوو ب ڤی ئاوایی نەهێلا کۆ نەڤسی یێ وێ، برایێ دی یێ نیرۆیی، پشتی بابی ببت ئیمپەراتۆر.

پارەی بپارێزت ئوو هێدی هێدی ل سەر زێدە بکت. ئەڤ بنەما دەرهەڤا دەمێ دا ژی راستە.

ب هەر حال، ژی یێ مرۆڤی گەلەك بهادارترە ژ هندێ کۆ ب بەلاش بهێت مەزاختن. هون نە دکارن دەمێن بهوری ڤەگەرینن ئوو نە ژی هەوە ژییەکێ دوبارە دبت.

هون دبێ بزانن کا ل ڤۆناخا جوانییێ چاوا ژ دەلیڤە ئوو کەیسێن هەیی مفایێ ببینن. چاخکەکا بکارئینانا دەما هەوە ل ڤۆناخا جوانییێ، دکارت دەما هون دگەهن تەمەنێ من تەسیرەکا مەزن ل ژیانا هەوە بکت. ئەگەر هون ل گۆرە یێ هۆزانەکا کەڤنا کۆرەیی کۆ دبێژت: "خوەش ببهورینن خوەش ببهورینن، هندی هون جوانن خوەش ببهورینن، ژبەر وێ کۆ ل پیرییێ هون نکارن" ژیانا خوە بەلاش ببن سەری، دەما هون دگەهن ژی یێ من، دێ گەلەك خەمان بخوەرن.

لەوما، وەکی مە ل "دێوو"یێ، دەما هون جوان ب بزاڤ ئوو خەباتێ ژبۆ پاشەرۆژا خوە سەرمایەیێ دابنن. ئوو ب هووری ئوو ب هزرینێ دەما خوە بکاربئینن. هەر وەکی من بەری نها ژی گۆت، ژیان تژی تشتێن بهاگرانە، لێ چ تشتەك ژ دەمێ گرانبهاتر نینە.

**بەهرا نەهێ**

# ئەز تەنێ ژنەکم

ژبەر کێمبوونا داخوازێ ژبۆ بکارگرتنا مرۆڤێن خوەندا، بێکاری یا دەرچوویێن زانینگەهان گەلەك زێدە بوویە. ژبەر وێ، هندەك ژ دەرچوویێن زانینگەهان دیسا ڤەدگەرن زانینگەهێ دا ل بیاڤەکا دی بخوینن. ئەڤ ئاریشە دەرهەڤا دەرچوویێن ژن دا دژوارترە. چەندەکێ بەری نها، نووچە یا خوەکوشتنا ژنەکا دەرچوویا بیاڤا مافان کو پشتی دەرچوونێ نەشییابوو کارەکێ هەژی ژبۆ خوە ڤەببینت، گەلەك تەسیر ل من کر.

گەلەك کەس باوەرن کۆ جیهان ژ گەلەك ئالیان ڤە گەلەك بلەز هاتیە گوهاررتن. لێ دەمارگری ئوو فەرقوجداتی یا دژبەری ژنان هێشتا د جڤاکا کۆرەیێ دا وەکی خوە مایە. د جڤاکا ئەڤرۆ دا، ژنێن کو وەکی مێران خویندی یە پشتی دەرچوونا ژ زانینگەهان نکارن ب درستی شیان ئوو هێزێن خوە یێن پیشەیی بکاربئینن. ئەڤ نە تەنێ ژ ئالی یێ کەسۆکی ڤە، لێ ژ ئالی یێ جڤاکی ڤە ژی گەلەك زیانبارە.

ژبەر وێ، "دێوو" پووتەیی ب دامەزراندنا ژنان ددت. هەلبەت، ئەم شەریکەیا هەری پێشین بوونە کۆ ژنێن زەوجی ئوو ژنێن دەرچوویێن زانینگەهان دامەزراندنە. هندەك ژ وان هەتا پلەیا سەرۆکتی یا پشکان بەرزبوونە ئوو ١٢ کەس ژ کارمەندێن ژن ژبۆ کارێن ئاڤاکرنا خانیان ژبۆ وەلاتی لیبیایێ هاتنە شاندن. ژبەر وێ مرۆڤ دکارت پچەکێ گەشبین بت کۆ رەوشا ژنان ل کۆرەیێ هندەك هاتیە گوهاررتن.

دەما ئەز دگەل جوانان دئاخڤم، ب ئاوایەکێ ئەدەتی چ جداتیێ دناڤبەرا ژنان ئوو مێران دا نابینم. لێ نها ئەز دخوازم دگەل ژنان بئاخڤم.

ژن ئوو مێران سالۆخەتێن هەڤپشك هەنە. ب درێژاهی یا دیرۆکێ ژنان دگەل مێران بەرپرسیاریتی یێن ئەڤراز ئوو نشیڤێن ژیانێ وەرگرتنە ئوو وەکی مێران (هەر

نەبت د ئاستێ ئاخڤتنێ دا) ژ ڤەنجی یێن جڤاکێ ژی بێبەهر نەبوونە. هەلبەت، ب کێمانی ڤە، د جڤاکا کۆرەییێ دا رەوش وها نەبوویە. ئەڤرۆ ژبەر چەند سەدەمەکان رۆلێ ژنان د جڤاکا کۆرەییێ دا هاتی یە بەرتەسککرن ئوو ئەو نەشییانە ژ هێز، ئافراندن ئوو شیانێن خوە یێن راستین مفایێ ببینن. سەدەما ئێکێ کۆ دهێت هزرا من، باوەری یێن کەڤن ئوو بەربەلاڤێن جڤاکی نە کۆ دبێژن شوو (= مێرێ ژنێ) ئەندامێ دەرڤە یێ مالباتێ یە، ئانکۆ کەسێ ل دەرڤەیی مالێ دخەبتت، ئوو ژن ژی ئەنداما ناڤخوە یا مالباتێ یە، ئانکۆ کەسا کۆ ل مالێ دخەبتت. لەوما د جڤاکا کۆرەییێ دا، ب ئاوایەکێ کەڤنەشۆپی، ژن خودانا کیینیەکا گرێدایی مالێ یە. ب سەر ڤێ را، هەمی گاڤان دەستهەلاتا کۆرەییێ دەستهەلاتەکا مێرسالار بوویە. ژنێن ڤی وەلاتی چ جاران نەشییانە د کاودانەکا وەسا دا بژین کۆ بکارن مایێ خوە د بەرپرسیاریتی یێن جڤاکی بکن: ڤێ پرسێ سووکا کاری ئێخستیە.

ب دیتنا من، مێرسالاری دگەل تەڤنێ جڤاکا کۆرەییێ یە ئوو ب تەنێ هۆکارێ ئێکانەیێ ڤەدەرکرنا ژنان ژ ڤادا جڤاکێ نینە. ب دیتنا من، گەلەك هۆکارێن گرنگتر ژ ڤێ هەنە کۆ ئەز هیڤی دکم ژنێن کۆرەییێ پێ بحەسن.

هەلبەت، کێشە یێن ژنێن کۆرەییێ گرێدایی سالۆخەتێن گشتی یێن جڤاکا مە نە. لێ ب نهێررینا من، ئێك ژ کێشە یێن سەرەکی ئەوە کۆ ژنێن کۆرەیی ئامادە نینن بەرپرسیاری یێن وەکی مێران وەربگرن. گەلەك ژن ب ئاوایەکێ نەهشیار (= لاوەعی) وەسا دادنن کۆ پشتی دەرچوونا ژ زانینگەهێ تەنێ دو-سێ سالەکان دێ کار بکن ئوو پاشی دێ بزەوجن. ئەو هەمی جاران کار ئوو پیشە یا خوە وەکی وەستینگەهەکا ئامانەیان یا نیڤا رێیێ دبینن کۆ دووماهی یا وێ زەوجینە. ژبەر وێ، ژبۆ پیشکەڤتنا د وارێ کار ئوو پیشە یا خوە دا گەلەك خوە ناوەستینن.

ئەز حەز دکم کۆ هون ب درێژی ل سەر ڤی بابەتی بهزرن. ل دەستپێکا دامەزراندنێ، ب کێمی ڤە شەش هەیڤەك پێ دچن هەتا کەسەك شەهرەزاییێ کارێ خوە ببت. د راستیێ دا، مرۆڤ دکارت ببێژت کۆ شەش هەیڤێن دەستپێکێ د هەر کارەکی دا ڤۆناخا کارفێربوونێ یە. ب ئاوایەکێ ئەدەتی هەتا کەسەکێ نوودامەزریایی بەرپرسیاری یا تڤاڤ وەردگرت، ب کێمانی دو سال دڤێن ئوو ئەڤ دەم درست ئەو دەمە

کۆ گەلەك ژن بەرهەڤن دا خوە ژ کاری ڤەبدزن ئوو بزەوجن. ب ڤی رەنگی، نابت مرۆڤ ب ژڤانا هندێ بت کۆ شەریکە بخوازن کەسێن هۆسا دابمەزرینن.

ل سالا ١٩٨٤ێ، دەما ڤێ شەریکەیێ دەست هاڤێت دامەزراندنا دەرچوویێن ژن، مـن ب خوە دانوستان دگـەل داخوازکـەران دکـر. د وێ هەڤپـەیڤینێ دا ژ وان دهـات پرسـین کـا دخوازن پشتی زەوجینێ ژی کـار بکن. ٩٩ ژ سـەدێ ژ وان بەرسـڤا ئـەرینی دا، لـێ پـشتی پێـنج سـالان تـەنی نیڤـەك ژ ٣٠٠ ژنـێن دەرچـوویێن زانینگـەهان ل سـەر کـارێ خوە مابوون.

هەلبەت ئەز وەسا دهزرم کۆ ئەڤ رێـژە ب خـوە ژی نیـشانا باشـتربوونا ڤـێ کێـشەیێ یە. مە جارەکا دی ژی ل سالێن ١٩٧٢ێ ئوو ١٩٧٧ێ هندەك سەربهور د دامەزرانـدنا ژنـێن باوەرنامەدار دا هەبوون. هنگی هزرا هەمی ژنان ئەو بوو کـۆ هـەتا دەمـا زەوجـینێ کـار بکن ئوو پاشی پیشەیا خوە بهێلن. دەمـا مـە ئـەڤ زانـی، مـە چ ژنـەك دانەمەزرانـد. لـێ ژبەر گوهارتنێن بلەز یـێن ڤـێ داویـێ، ئـەز دخـوازم وەکـی دامەزرینـەرێ شـەریکەیەکا پیشەسازی هندەك تشتان ببێژم ژنێن جوانێن ئـەڤرۆ ل کـۆرەیێ. ئـەز بـاوەرم کـۆ هـون ژی وەکـی مێـران ل بەرانبـەری پێـشکەڤتن ئـوو وەرارا جڤاکـا خـوە ئـوو وەلاتـێ خوە بەرپرسیارن.

بەری هەر تشتی، ژبـیر مـەکن کـۆ هـون برریـارێ ل سـەر چارەنڤیس ئـوو پاشـەرۆژا خـوە ددن. ل ڤـان سـالێن دوومـاهیێ، دەنگـێ نـەرازیبوونا ژنـێن کـۆرەیێ ل بەرانبـەر فەرقوجداتی ئوو دەمارگری یـا بـەلاڤا جڤاکـا مێرسالارا کـۆرەیێ گەلـەك زەلالـتر دهێـت گوهێ مرۆڤی. لێ ئەز باوەرم کۆ ژن ب خوە ڤان رەنگێن فەرقوجـداتی ئـوو دەمارگریـان دخـوازن، ژبـەر وێ کـۆ ئـەو ب ئـاخڤتنێن مینـا "ئـەز تـەنێ ژنـەکم" ئـوو "چـاوا هـون دخوازن ژنـەك ڤـی کـاری بکت؟" وێ بـاوەرێ ژبـۆ خـەلکی چـێ دکـن کـۆ ژنـان ب خـوە باوەری ب ئێکسانیێ ئوو بەرانبەریێ نیە.

پرسـگرێکا دی بکارئینانـا پـەیڤا "خـودان" ژبـۆ شـوویێن (= مێـرێن) خـوە یـە. "خودان؟" شوو یێن هەوە چاوا دکارن خودانێن هـەوە بـن؟ مـا هـون چاوا د زەوجـینێ گەهشتنە؟ ئەرێ رامانا وێ ئەوە کۆ هون شوویەکێ باش ئوو هـەژی ژ خـوە را ڤـەببینن ئوو پالێ خوە بدن وی ئوو ل بن ئـەمرێ وی بـن؟ ڤـەی هـون دخـوازن حەوجـەدار ئـوو

کۆله بمینن؟ رامانا ژن ئوو شوویاتییێ ئێکگرتنا دو کەسان ب بەرپرسیاریتی ئوو بها یێن وەکهەڤە. لەوما هون نابت زەوجینێ بکن تێکهلی یا خودانی ئوو کۆلەی.

وەسا دیاره کۆ ل جڤاکا کۆرەییێ، هێشتا ژی گەلەك ژن هەنە کۆ ل مێرەکێ باش دگەرن دا ئەمران ل وان بکت. ژ ڤێ خرابتر، هندەك کیژ ل تەڤا یا ١٤ سالێن خویندنا خوه ل شوویەکێ باش، ل "خودانەکی" دگەرن. ب نهێررینا من گەلەك جهێ داخێ یە کۆ کیژەك ل شوونا هندێ کۆ د هزرا ژیانا خوه ئوو پاشەرۆژا خوه دابت، خویندنا خوه یا زانستی بکت ئامرازەك دا بکارت شوویەکێ هەژی پەیدا بکت. ئەرێ ب نهێررینا هەوە، هزرینەکا هۆسا دێ ئێکسانی ئەوو بەرانبەرییێ دناڤ مێر ئەوو ژنێن کۆرەییێ دا چێ بکت؟

ژبیر مەکن، هون ب خوه خودانێن خوه نە. هەر ئێك ژ مە، چ مێر بین، چ ژن، ب هندەك سالۆخەت ئوو خەسلەتێن نەمازەیی ئوو تایبەت ڤە دهێن سەر دنیاییێ، بنگەهە ئەوو بناغەییێ ڤان هەمی سالۆخەتان ئەوە کۆ هەر ئێك ژ مە خودانێ ژیان ئەوو چارەنڤیسا خوه یە. هون ب تەنێ فەرماندار ئوو خودانێ خوه نە. هەلبەت، گۆتنا ڤان تشتان گەلەك ساناهیترە ژ کرنا وان. کارکەرەك چ ژێ بهێت خوەستن دکت ئەوو سەرێ وی سکڤە ئوو ژیانا وی هێسا یە. لێ خودان دبێ ل دوو کارێ خوه بت ئوو بەرپرسیاری یا ژیانا خودانی ل سەر ملێن وی ب خوه یە.

هیڤی ئوو رجا یا من ژ ژنێن جوان (= گەنج) یێن کۆرەییێ ئەوە کۆ ژبۆ وەرار ئەوو پێشکەڤتنا خوه، ب دوو کار ئوو پیشە یا خوه را بچن ئوو دەستان ژێ بەرنەدن. هەمی جاران وەسا بهزرن کۆ هون ب خوه خودانێن خوه نە، ژبەر وێ کۆ ئەڤ جۆرەیێ هزرینێ بورهان هەنە ئوو خوەرسکی یە. درێژی یا ڤان گۆتنێن من هەوە هەمیان ڤەناگرت، لێ هندەك ژن هەما کۆ ژ زانینگەهێ دەردچن وان تشتێن کۆ فێربوونە ژبیر دکن. ژبەر وێ کۆ ئەو خوه ژبۆ خودانێ خوه یێ نوو تەرخانکری دبینن ئوو وەرارا کەسینی ئوو هەمی تشتێن کۆ هەتا وێ گاڤێ فێربوونە ژبیر دکن. هون چاوا دکارن خوه هۆسا بێکێر ئوو بێخێر بکن؟

وەرار ئوو پێشکەڤتنا هەر کەسەکی گرێدایی خەبات ئوو لەباتا وی ب خوه یە. لێ بابەتێ گەلەك گرنگ ئەوە کۆ هون چاوا دکارن بگەهن ئارمانجێن بلند یێن خوه ئەوو

پاشـــەرۆژەکا گەشـــتر. کەســـێ کـــۆ ل جڤـــاکێ ئـــوو ژیـــانێ هـــوور دبـــت، وەرارا وی چ توخیب نینە.

ژبەر وێ، ژ هەوە ژنێن جوانێن کۆرەیێ دخـوازم کـۆ هنـدی ژ هـەوە دهێـت وەرارێ بکن ئوو پێشدا هەرن. ئەگەر هون ل دەردۆرا خوە بنهێـررن، هـون دێ ب زەلالـی ببیـنن کـۆ ب دەربازبوونـا دەمـێ د جڤـاکێ دا بـەرزە دبـن. بەرسـڤەکا سـادە ژبـۆ ڤـێ هەیـە. کەسەکێ کۆ هەتا دوهی مرۆڤەکێ نەنیاس ئـوو بـێ نـاڤ بوویـە، ئـەڤرۆ دکـارت ب رژدی بزاڤێ بکت کۆ پێش بکەڤت ئوو ل دووماهیێ بگەهت سبەهی یـێن گـەش. لـێ کەسـەکێ کۆ ئەڤرۆ بژارە ئوو دیارە، ئەگـەر تـەنێ دلـێ خـوە ب شـەهنازی یـێن خـوە یـێن ئـەڤرۆ خوەش بکت ئوو چ بزاڤێن دی نەکت، هێدی هێدی ل پاشەرۆەکا نە وەسا دوور دێ ببـت کەسەکێ وەسا کۆ تو دبێژی هەما هەر نیە ئوو هەر نەبوویە.

بابەتێ گرنگ وەرار ئوو پێشکەڤتنا کەساتی یـا هـەوە ژنانـە. ب گۆتنـەکا دی، پـشتی دەرچوونا ژ زانینگەهێ ئوو شووکرنێ وەرار ئوو پێشکەڤتنا خوە نەراوەستینن. کەسەك بن کۆ پووتەی ب پێشکەڤتنا کەساتیێ ئوو خویندنێ ددن ئـوو هـەرگاڤ ل پـەی شـیانێن نوو ئوو تشتێن نوو دگەررن. ئەڤ سالۆخەتێن ژنەکا جوان ئوو بەدەون. ژنـێن ب راسـتی ڤەشەنگ ئوو سپەهی ئەون کۆ ژبۆ وەرار ئـوو پێـشکەڤتنا خـوە بزاڤـێ دکن. ڤەشـەنگی ئوو بەدەوی یا راستین یا وان مێران ئوو ژنانە کۆ تژی ژیان ئـوو هـەرکینن ئـوو هـەمی دەمان دخوازن هەتا جهێ کۆ دکارن پێشدا بچن ئوو وەرارێ بکن.

ئەز دخوازم تشتەکێ ژی ببێژم وان ژنان، یێن کۆ دخوازن شیانێن خوە ئـوو هێـزێن خـوە یـێن نەپـەن ب ئاوایـەکێ کێـرا بخـەبتینن. هـون دبـێ ب ئاوایـەکێ پیـشەکارانە (= موحتەرف، پرۆفسیۆنەل) یێ درست ل پیشە یا خـوە تەماشـە بکـن ئـوو ب ئاوایـەکێ بەرکارانە (= مونفەعلانە، پاسیڤ) ئوو بندەستانە بەرپرسیاریان وەرنـەگرن ئـوو تـەنێ وی کاری نەکن کۆ دبێژن هەوە. هەتا ئەڤرۆ ژی ژنێن کۆرەیی هۆسا ل کار ئوو پیشە یـا خوە تەماشە دکن ئوو ژبـەر وێ ژی گەلـەك شـەریکە ئـوو بنگـەهێن بازرگـانی نـاخوازن وان دابمەزرینن. ئەگەر هون دخوازن کۆ وەکی مێـران سـەرەدەریێ دگـەل هـەوە بکـن ب ئاوایەکێ کێرا ئوو چەلەنگ (= ئاکتیڤ) (نـە بەرکارانـە) د کـارێ خـوە دا پـێش بکـەڤن ئوو بەرپرسیاریتی یێن پێدڤی وەربگرن. هەر نەبت دبێ هون بشێن وەکی مێرەکـی کـار

بکـن. ئەگـەر هـون هۆسـا ل کـارێ خـوە بـرامینن، هنگـی چ شـەریکەیەك خـوە ل سـەر دامەزراندنا هەوە نـەرازی ناکت ئـوو هـون ب ڤـی رەنگـی دکـارن هـەمی دەمـارگری ئـوو فەرقوجداتی یێن کەڤنەشۆپی یێن جڤاکی بشکێنن.

ل وەلاتـێن ئێکگرتـی یـێن ئـەمریکایێ ئـوو هنـدەك نەتـەوەیێن دی یـێن ئاسـیایێ، گەلـەك ژن هـەتا ئاسـتێ سـەرۆکێن پـشکان، رێڤەبـەرێن کـارگێری یـا شـەریکەیان ئـوو هندەك جاران سەرۆکتی یا دەستەکا رێڤەبەریێ پێش کەڤتنـە. کەسـێن هۆسـا دکـارن ب تەجریبە ئوو سەربهورا پیشەیی یا خوە ئوو شیانێن بەرفرەهێن خـوە د جڤاکـا خـوە دا ببن خودان باندۆر. ئەز چ دەلیلەکێ نابینم کۆ ژنێن کۆرەیی ل چاڤ ژنـێن نەتـەوە یـێن دی یێن جیهانێ کێم‌شیانتر بن. کێشە یا گرنگ، سەرەدەریکرنا ژنێن مە دگەل کـار ئـوو پیشە یا خوە یە. ژنێن کۆرەیێ کار ئوو پیشە یا خوە ئوو خوینـدنا خـوە وەکـی جهـەکێ بازدانێ، وەکی بازەبەرەکی، ژبۆ زەوجینێ دبینن. ئەگـەر هـون ژی وەسـا دفکـرن ئـوو ب ئاوایەکێ بەرکارانە ئوو نەچالاك کارێ خوە دشـۆپینن ئـوو بـەردەوام دکـن، هنگـی هـون ژی ئێك ژ وان کەسانن کۆ کەڤنەشۆپێن فەرقوجداتیخواز ئـوو دەمارگرانـە د جڤـاکێ دا خورتتر دکن.

ببن فەرماندارێن خوە ئوو بزاڤێ بکن هندی ژ هەوە دهێت هێـز ئـوو شـیانێن خـوە بـەرفرەه بکـن ئـوو ب ئاوایـەکێ چـەلەنگ ئـوو چـالاك ل پـەی ئاگـاهی ئـوو پێـزانینێن پیشەیی بن. تەنێ ب ڤێ رێیێ هون دکارن رفتـار ئـوو دەمـارگری یـێن جڤاکـا مێرسـالار بگوهێررن. ئەگەر هون هۆسا بکن، هـون دێ ژبـۆ مێـرێن دەمـارگر ئـوو کەڤنەپەرێـسێن ڤێ جڤاکێ ئوو نقشێ کـەڤن بـسەلمینن کـۆ ئـەو هـەمی د هلـسەنگاندنا ژنـێن کـۆرەیێ دا تووشی شاشی ئوو خەلەتیێ بوونە.

**بەهرا دەهێ**

# ركەها مرخان

من گەلەك جاران گۆتی یە كۆ ئەڤرۆ هەر تشتەك من هەبت ئان ئەز هەر تشتەك بم، من ژ شەرریێ كۆرەییێ هەیە.

هێشتا ئەز زارۆ، ژبەر بەخترەشی ئوو دژواری یێن شەرریێ كۆرەییێ من گەلەك زوو زەهمەتی یێن ژیانێ نیاسین ئوو ژبەر وێ كۆ ل قۆناخا سنێلەیی (= موراهقی) یا خوە ئەز ئێكسەر بووم بەرپرسیارێ دابینكرنا ژیارا مالباتا خوە، ئەز گەلەك زوو پێ حەسیام كۆ وێرەكی ئوو هێزا خوە ژبۆ بەرسینگگرتنا تەهلی ئوو ترسێ ئوو بەلایێن ژیانێ كۆم بكم.

دا هون بزانن كۆ ژیان هند ساناهی ژی نینە، ئێك ژ باوەری یێن دەستپێكی یێن دیانەتا بوودای ژبۆ هەوە ببێژم. ل گۆرە یێ وێ باوەرییێ، بناغەیێ ژیانا ڤێ جیهانێ ل سەر رەنج ئوو تەهلیان هاتیە دانان ئوو جیهان دەریایەكا تژی نەخوەشی ئوو بەلایانە. ژیان كەرخەكا رەهوان ئوو ساف نینە، فەرشەكێ سۆرگولان ژی نینە. ئەگەر رێیەكا فەرشكری ب سۆرگولان ژی با، ژبیر مەكن، سۆرگولان ستری یێن تیژ هەنە.

ئەگەر هون ژ ستری یێن گولان دترسن، هون چ جاران بسەرناكەڤن. بەختەوەری یا وان كەسانە كۆ ژ پەڤچوون ئوو شەرركرنا دگەل ستری یێن تیژ ناترسن. دكارم ببێژم بەختەوەری یا هەمی كەسێن سەركەڤتی یێن ئەڤرۆ بەرهەمێ تەهلی ئوو دژواری یێن وان یێن دوهی نە، ئەو نە بەرهەمێ رێڤەچوونا ل سەر فەرشێن بەلگێن نازكێن سۆرگولانە. ژبەر وێ یە كۆ ئەز دبێژم شەرریێ كۆرەییێ ب راستی ئەز كرم ئەو كەسێ ئەز نها هەمە. خالەك هەیە ئەز دخوازم هون ب ئاوایەكێ نەمازەیێ لێ هوور ببن: تەهلی ب خوە دەراڤێن ئەرینی یێن ژیانێ دزێن، هەلبەت ئەز سەدەما ڤێ نزانم. لێ

راستی ئـەوە كـۆ دەراڤـێن ئـەرینی یـێن ژیـانێ هـەمی گاڤـان ل هونـدرێ تـەهلی ئـوو زەهمەتیان دا دپشكڤن.

دەمـا ژیـان ب خوەشـی دەربـاز ببـت، خـەلك ب رەنگـەكێ دلخـواز كـاردكن. ئەگـەر د رەوشەكا وها دا هون وەكی خەلكێ دی پێش نەكەڤن، دبێ سەدەما وێ هون ب خوە بـن. ژبۆ میناك، شاگردەكێ ژیر ئوو هزرتیژ بئینن بەرچاڤێن خوە. ژبەر وێ كۆ وی بـاوەری ب ژیرەكی یا خـوە یـا زێـدە هەیـە، ل سـالێن خوینـدنا ل دبـستانا بەرهـەڤی ئـان سـالێن دەستپێكا زانینگەهێ ژبۆ وەرگرتنا دەرەجەیێن بلند خوە گەلەك ناوەسـتینت ئـوو هـەر سـال ب دەرەجـەیێن نـاڤنجی خوینـدنا خـوە دەربـاز دكـت. هەلبـەت ئـەو هـەمی جـاران برریـارێ ددت كـۆ ل سـالا دوومـاهیێ هـەمی بزاڤـا خـوە بكـت دا د ئـەزموونێن (= تاقیكرنێن) دووماهیێ دا باش ببت. ئەو هزر دكت كۆ ئەگەر ل سالا دووماهیێ هەما خوە پـچەكێ مانـدی بكت دێ ب دەرەجەیـەكا گەلـەك بـاش دەربـچت. ئـەرێ گـەلۆ ئـەڤ تشت مومكینە؟

تشتێ كۆ نابت ئەم ژبیر بكـین ئـەوە كـۆ شـاگردێن كـۆ ل سـالێن دەسـتپێكێ ب رژدی دخوینن، ل سالێن دووماهیێ ژی هەر ب وێ رژدیێ دخوینن. ژبـەر وێ، ئـەو كەسـێ كـۆ خـوە ل سـالێن بـەرتر گەلـەك مانـدی نـەكربت، ئەگـەر ل سـالا دوومـاهیێ دو-سـێ قـاتی سـالێن بـەرتر ژی خـوە مانـدی بكـت، دیـسا ژی دەرجـەیێن وی گەلـەك ژ سـالێن بـەرتر باشتر نابن. ئەو هندی خـوە مانـدی بكـت رەنگـە هـەر بـشێت دەرەجـەیێن نـاڤنجی یـێن سالێن بەرتر وەربگرت، نە زێدەتر. دەما هەژی ژبۆ بزاڤـا هـەوە ئـەو دەمـە كـۆ هـەمیان دەست ژ بزاڤێ كێشا بت ئوو ژ بزاڤێ نائومێد بووبن. د رەوشێن وەها دا، ئەو كـەس دێ سەربكەڤت كۆ ب رژدی خوە مانـدی بكـت ئـوو بـاش هـایێ وی ل دەراڤـێن ئـەرینی یـێن نەپەن د زكێ زەهمەتی ئوو تەهلیان دا هەبت. دبێ هون بـزانن كـا چـاوا تەنگاسـی یـێن ژیانا خوە بكن دەراڤێن ئەرینی ئوو چاوا مفایێ ژێ ببینن. هون ل وان پـەیڤێن كـۆ مـە ژ زمانێ چینی وەرگرتنە ئوو رامانا وان "تەنگاسی" یە بنهێررن. تیپێن بەراهیێ وەكـی پەیڤا "مەترسیێ" ئانكۆ "ریسكێ" نە، یا دی ب رامانـا "دەراڤ" ئـان "شـانس" ە. ژبـەر وێ پەیڤێن "ریسك" ئان "مەترسی" ئوو "دەراڤ" ئوو "شانس" دولێڤ ئان دوئالی نـە،

رامانا وان ئەرینی ئوو نەرینی یە. رامانا وێ ئەوە کۆ تەنگاسی دکارت ب هەر دو بارێن ئەرینی ئوو نەیینی دا بچت.

مرۆڤەکێ رەشبین رەوشەکا "مەترسی-دەلیڤەییێ" نەیینی دبینت ئوو ژبەر وێ تووشی بێهیڤیتی ئوو بێئومێدییێ دبت. لێ مرۆڤەکێ گەشبین ئوو پر بزاڤ وێ رەوشێ ب هیڤی ئوو ئومێد ئوو باوەری-ب-خوە بوون ئوو گێولەکێ خەتەرکرنێ دبینت. کەسەکێ هۆسا ل دووماهییێ دێ دەلیڤە یێن نەپەن د هوندرێ تەنگاسییێ دا ڤەببینت. هەلبەت، سەرکەڤتن ئوو شکەستنا وی ب ئێك قەدارە یە. لێ ب نهێررینا من بەرسینگگرتنا ترسێ ئوو تەسلیم نەبوون د وان رەوشان دا گەلەك گرانبهاتر ئوو ئاقلانیترە.

هون جوانن، ژبەر وێ ئەگەر هون هەمی بزاڤا خوە ژبۆ گەهشتنا ب ئارمانجێن خوە بکن، بێگومان رەنگە هندەك جاران ژی تووشی شکەستنێ ببن. لێ ئەگەر هون هەمی گاڤان وی تشتی بکن کۆ ژ هەوە دهێت چاڤەرێکرن، هنگی رەنگە هەوە چ ئالۆزی ئوو ترس ژی نەبن. لێ ژبیر مەکن چ جاران چ دەستکەڤتێن مەزن ژی بدەستڤە نائینن.

دۆخێن نها یێن جوانان کۆ ب راستی من دترسینن، لەوازی، تەنبەلی ئوو خەتەرنەکرن ئوو هەتا توخیبەکی ژی نەبوونا خوەسەرییێ یە. وەسا دیارە هەمی جوانێن نها بەرێ خوە دایە تەنبلی ئوو رەهەتییێ.

هەلبەت گەلەك ژ ڤان کێشەیان ژبەر مایێخوەتێکرنێن زێدە بێقامێن دایبابانن. چ دایباب نینە کۆ ب راستی ژ زارۆ یێن خوە حەزنەکن. هەمی دایباب حەز دکن کنجێن (= جلکێن) زارۆ یێن وان باش بن، زادێ وان باش بت ئوو د ژیانێ دا سەرکەڤتی بن. لێ دایبابێن ئاقل ئەون کۆ پووتەی ب پاشەرۆژا زارۆ یێن خوە بدن. ژبەر وێ، ئەو ل سەر خوە دبینن کۆ هندەك خالێن گرنگ یێن پەروەردەکرنێ ل بەرچاڤان بگرن. ئێك ژ وان ڤەنیاسین ئان تەشخیسکرنا چاوایی ئوو چەنداتی یا پووتەپێکرنا ب زارۆانە. هەر زارۆیەکێ زێدە ژ پێدڤیتی یا وی پووتەی پێ بکن ئوو کەیفا خوە پێ بئینن، دێ تووشی خەندقیانا رەڤانی (= پسیکۆلۆژیك، نەفسی) ببت. دایبابێن کۆ ب زێدە-پووتەپێکرنێ ئوو کەیفا-خوە-پێئینانێ، رەڤان ئوو رحا زارۆیێ خوە دخەندقینن ئوو

وی تووشی لەوازی یا رەڤانی دکن، نە تەنێ کەساتی یا وان زارۆان لەواز دکن، ناهێلن زارۆیێن وان شییانا بەرسینگگرتنا زەهمەتی ئوو تەهلی یێن ژیانێ ژی هەبت.

چ دایبابەك ناخوازت زارۆ یێن خوە بئێشینت ئوو ل مالباتێن نها ب ئاوایەکێ ئەدەتی دو ئان سێ زارۆ زێدەتر ژی نینە. ژبەر وێ، ژیانا مالباتێن ئەڤرۆ خوەشتر ئوو رەهەتتر ژ مالباتێن کەڤنە. لەوما دایبابێن ئەڤرۆ رێ یێن جۆربجۆرتر هەنە کۆ کەیف-پێ-هاتنا خوە ژبۆ زارۆ یێن خوە دیار بکن. هەتا هون نەبن دایباب، هون نکارن حالێ وان دایبابان تێ بگەهن کۆ شڤکەکی ئان چووڤەکی د دەست دگرن دا زارۆیێ خوە بکوتن ئوو بئێشینن.

لێ کەیف-پێ-هاتنا دایبابان دبێ ب ئاوایەکی بت کۆ پاشەرۆژا زارۆیێ خوە ژ تەهلی یا ئێشاندنا زارۆیێ خوە مەزنتر ببینن. ب هەر حال، د ژیانا هەر کەسەکی دا رۆژەك دێ بهێت کۆ تێدا ئەو کەس دبێ ل سەر پێ یێن خوە رابوەستت. دایباب نکارن هەتا هەتایە زارۆی ل بەرانبەری کەسێن دی ئوو جڤاکێ بپارێزن.

ل جڤاکا ئەڤرۆ یا کۆرەیێ دناڤبەرا ١٠ هەتا ٢٠ ژ سەدێ ژ کارمەندێن نوودامەزرایی ل داموودەزگەهان ئوو شەریکەیان بەری شەش هەیڤێ کارێ خوە دهێلن. چما؟ ژبەر وێ کۆ کارکرنا ل وان داموودەزگەهان ئوو شەریکەیان دژوار ئوو زەهمەت دبینن. ژبەر وێ، ژبۆ رەڤینا ژ وێ دەراڤێ، بلەز بەر ب وەرگرتنا باوەرنامەیەکا (= شەهادەیەکا) دکتۆرایێ ل زانینگەهێ دچن ئوو ژبۆ درێژترکرنا خویندنا خوە دچن دەرڤەیێ وەلاتی. ئەڤ شێوازەکە کۆ ئەز دخوازم هندی زوو یە د جڤاکا مە دا نەمینت. ئەز هندەك جاران ل ستاندەرێن وان جۆرە ناڤەندێن زانستی دهزرم کۆ کەسێن وها وەردگرن. کەسێن کۆ نەشێن کاودانێن کاری ل شەریکەیان تەحەمول بکن دچن زانینگەهان. ب ڤی ئاوایی ئیهانەتا دەزگەهێن خویندنێ هاتیە کرن.

چەندەکێ بەری نها، د کاودانەکا چاڤەرێ نەکری دا دگەل شاگردەکێ سالا دووماهیێ ل بیاڤا بازرگانیێ ل ئێك ژ زانینگەهێن گەلەك ناڤدارێن کۆرەیێ کەڤتم ئاخڤتنێ. ئەو مرۆڤەکێ کەشخە ئوو رێکوپێك دهات بەرچاڤان ئوو گەلەك ژیرەك ئوو هشیار ژی دیار بوو. ئاخڤتنێن مە زێدەتر ل دۆرێ هندێ دگەریان کا ئەو پشتی دەرچوونا ژ زانینگەهێ دێ چ کارەکی بکت.

من ژێ پرسی کا دخوازت پشتی قەداندنا خویندنا خوە کارەکی بکت ئوو ژبەر وێ کۆ بەرسڤ "ئەرێ" بوو، من گۆتێ کۆ دگەل شەریکەیا "دێوو"یێ کار بکت. دەما گۆت ژ "دێوو"یێ حەز ناکت، من سەدەما وێ ژێ پرسی. وی بەرسڤاند کۆ "دێوو" گەلەك کاری ب مرۆڤی دکت. من ژێ پرسی دخوازت ل کیدەرێ کار بکت، گۆت زێدەتر حەز دکت ل شەریکەیەکا بیانی دابمەزرت، ژبەر وێ کۆ زێدەتر پارەی ددن ئوو کێمتر کاری ژ مرۆڤی دخوازن.

گەلەك زوو ئاخڤتێن مە گەهشتن بنی ئوو مە چ نەما کۆ ل سەر بئاخڤین. هەلبەت نە ژبەر وێ کۆ گۆت بوو ژ "دێوو"یێ حەز ناکت. ژبەر وێ کۆ ئەز نەدشیام وی ژبۆ ڤەدیتنا کارەکێ کێم ماندیبوون یێ پرر-داهات ئوو پارە پچەکێ نەرمتر بکم. لێ ئاخڤتێن وی یێن پاشتر زێدەتر ئەز نەرەهەت کرم. وی گۆت کۆ ئەگەر بشێت د هەیاما چار پێنج سالان دا تێرا خوە پارەیان کۆم بکت، رەنگە ئەو ئوو دەستگرتی یا خوە خوارنگەهەکێ ڤەبکن دا هەمی ژیانا خوە یا مایی ب خوەشی ئوو رەهەتی دەرباز بکن. هەلبەت ڤەکرنا خوارنگەهەکێ د خوە دا عەیب نینە. لێ تشتێ کۆ ئەز عاجز دکرم ئەو بوو کۆ شاگردێ ئێك ژ باشترین زانینگەهێن وەلاتی بوو ئوو تەنێ دخوەست پیشەیەکێ هلببژێرت کۆ ژیانەکا رەهەت ئوو خوەش ژبۆ وی دابین بکت. ڤی بابەتی ئەز ئالۆز کرم کۆ نەکە هەمی شاگردێن دی ژی وەسا دەرهەڤا پاشەرۆژا خوە بفکرن.

ژیان ژبۆ مرخەکا هۆگرتی ب رکەهێ گەلەك ساناهی ئوو دلخوازە. ئەو نە ئالۆزا زادی یە، نە سرر ئوو سەرمایێ، نە مەترسی یێن دی. لێ ب نهێررینا من ژیانا وێ مرخێ چ تشتەك تێدا نینە کۆ ئەز حەسوودیێ پێ دابیم. هەلبەت مرخا ئازاد نەچارە زادێ خوە پەیدا بکت، هێلینا خوە ئاڤا بکت ئوو ل بەرانبەری مەترسیان ژی بەرەڤانییێ ژ خوە بکت. لێ هەر ئەو مرخا ئازادە کۆ ئازادانە هەمی جیهانێ تێکڤە ددت. مرخەکا ئازاد کۆ خەتەران دکت گەلەك ژ مرخەکا د رکەهێ دا کێفخوەشترە کۆ ژ رەهەتییێ پێڤەتر چ تشتەك نینە.

ل دەرڤە جیهانەکا بەرفرەه ژبۆ ڤەدیتنێ ئوو نیاسینێ هەیە. لەوما، هیڤیدارم هون وان هزرێن کۆ ژبۆ زیندانیکرن ئوو د رکەهێکرنا هەوە د مێشکێ هەوە دانە ژ خوە دوور بکن. ژ نەنیاسیان مەترسن، ژ شکەستنێ مەترسن. ژبەر وێ کۆ ئەرکێ جوانانە ئوو ماڤێ وانە رەوشێن تەنگاڤی یێن ژیانێ بکن دەراڤ ئوو دەلیڤەیێن ئەرینی ئوو ب گێولەکێ ڤەبخوازیێ ژبۆ بەرسینگگرتنا تەهلی ئوو دژواریان رابن سەر پی یێن خوە.

## بەهرا یازدەهێ

# شانۆ ڤەدگەررت رۆژهلاتێ

دیرۆكــا جیهــانێ تــژی هــەلاتن ئــوو داكــەڤتنا نەتــەوە ئــوو باژارواریانــە (= شارستانیەتانە). دیرۆك هەمی جاران دبێژت كۆ چ نەتەوەیەك ب سەر هەمی شكۆمەندی ئوو هێزا خوە را هەتاهەتا نامینت. ئەڤرۆ شكۆمەندی یا باژارواری یێن مەزۆپۆتامیایێ، مسرێ ئوو روومێ تەنێ د نڤیسینان دا مایە.

ب درێژاهی یا ڤان ئەڤراز ئوو نشیڤێن دیرۆكێ، هەر دەما نەتەوەیەكێ دارێ كێبركیێ دایە دەستێ نەتەوەیەكا دی، جیهان تووشی گوهاررتنێن نوو بوویە. مە ل چەند سەد سالێن بهوری ئەڤ گوهاررتن دیتنە. ل ڤێ هەیامێ، سەركێشی یا جیهانێ ژ ئیسپانیایێ چوو بریتانیایێ ئوو ل دووماهیێ بریتانیایێ ژی ئەو دا دەستێ ئەمریكایێ. نها ئەو دار گەهشتی یە دەستێ نەتەوەیێن وەكی ژاپۆنێ ئوو وەلاتێن دی یێن ئۆڤیانووسا ئارام. ئەم ب ئەشكرایی دبینین كۆ شانۆیا باژارواری یا جیهانێ بەر ب رۆژهلاتێ دهێت ئوو كۆرە پشكەكا گرنگ ژ ڤێ شانۆیێ یە. ل چاخەكی كۆ وەلاتێن رۆژهلاتێ، هێدی هێدی دبن ژڤانگەهێن جڤینێن ناڤنەتەوەیی، جوانێن كۆرەیێ ژی دبن پێشەنگێن جیهانا پاشەرۆژێ.

من ب هەمی گەشبینێ ڤە د گۆتارێن چوویی دا گۆت كۆ نڤشێ هەڤتەمەنێ من دێ نڤشێ هەری داوین یێ كۆمارا بەر ب پێشكەڤتنێ یا كۆرەیێ بت ئوو هون جوانێن كۆرەیێ دێ نڤشێ پێشیێ ژ كۆمارا پێشكەڤتی یا كۆرەیێ بن. ژبەر وێ دخوازم هندەك تشتان ل سەر ئاخڤتنێن خوە یێن بەرێ زێدە بكم. ژ بیر مەكن كۆ وەكی نڤشێ ئێكێ یێ كۆمارا پێشكەڤتی یا كۆرەیێ، بەرپرسیاری یا مەزن یا رێبەری یا جڤاكێن ناڤنەتەوەیی ل سەر ملێ هەوە یە. لەوما ئەگەر كەسەك ژ هەوە ژبەر وێ كۆ ل

وەلاتەکێ بچووك ئوو بەر ب پێشکەڤتنێ یێ وەکی کۆرەیێ هاتی یە دنیایێ نەرازی یە ئوو هزر دکت کۆ ئەگەر ل وەلاتەکێ وەکی فرانسایێ، وەلاتێن ئێکگرتی یێن ئەمریکایێ ئان ئێك ژ وەلاتێن پێشکەڤتی یێن دی هاتبا دنیایێ دا بەختەوەرتر بت، هیڤیدارم هزرا خوە بگوهێررت. ژبەر وێ کۆ وەلاتێ مە ل دەرازینکا وەلاتێن پێشکەڤتی دا یە، تەنێ پێنگاڤەك مایە. دەما ستێرا سەرەوەری یا رۆژئاڤایێ ئاڤا ببت، ئەو ستێر دیسا دێ ل رۆژهلاتێ بهەلێت. لەوما دبێ هون شوکر بکن کۆ ل کۆرەیێ هاتنە سەر دنیایێ. نها دیرۆك ئوو خەباتا ڤێ نەتەوەیێ، مە ڤەدگەررینن ناڤەندا جیهانا پێشکەڤتی یا ئەڤرۆ. چاوا هون دکارن ژ کۆرەیی-بوونا خوە نەرازی بن؟

٢٠ سالان بەری نها خەلکێ کۆرەیێ خەلکەکێ هەژار ئوو نەدار بوون ئوو د ئاستەکا ناڤنەتەوەیی دا چ گرنگی ئوو رێز نەبوو. ئەم وەکی بەڤێن بنێ بیران بوون. لێ نڤشێ مە شییا ب سەر وێ رەوشا دژوار دا سەربکەڤت ئوو ئابۆریەکا خورت ئاڤا بکت ئوو د سووکێن جیهانی دا ل پێشیێ بت.

پشتی سێ ڤۆناخێن شاییینیێ ل کۆرەیێ (د ناڤبەرا سالێن ٥٧ێ بەری بوونا عیسای ئوو ٦٨٨ێ پشتی بوونا عیسای)، ئەڤ جارا پێشنیە کۆ کۆرە وەکی نەتەوەیەکا ئێکگرتی د ڤادا جیهانێ دا خوەیا دبت ئوو ئەڤ پێشینەیا وەلاتێ مە وەکی "شاییینیەکا د خوە دا" ب دووماهی دئینت.[1]

وەلاتێ مە ژبۆ مانا خوە هەمی گاڤان گەلەك پووتە ب جیهانا دەرڤە کری یە. ژبەر وێ کۆ کۆرە ژ ئالی یێ هێشەتێ (= جەمعیەتێ، نفووسێ) ڤە پشتی بەنگلادش ئوو تایوانێ تێپەستاییترین ئوو همبزترین وەلاتێ جیهانێ یە ئوو چ ژێدەرێن خوەرسکی نینە، ژبۆ مانا خوە، مە چ چارە نینن دبێ هەر چاڤێن مە ل دەرڤەیی سینوورێن مە بن.

ئەڤرۆ ئەڤ ئاریشە سەدەمێن ئێکانە یێن گرنگی دانا مە ب جڤاکێن ناڤنەتەوەیی نینە. ژبەر وێ کۆ ئەم هەر ژ ناڤەندا جیهانا پێشکەڤتی نێزیك دبن، جیهان ژی بانگی

---

(١) د دیرۆکا کۆرەیێ دا، وەکی دیرۆکا کوردان، کێم جاران دەستهلاتەکا کۆرەیی حوکم ل هەمی کۆرەیێ کری یە. گەلەك جاران سێ ئان چار میرگەهێن کۆرەیی هەبوونە، ئان ژی کۆرە ل بن دەستهلاتا ژاپۆنیان، چینیان ئوو جارنا مەغوولان دا هات بوو دابێشکرن.

مە دكت. د ڤێ شانۆییێ دا كۆرەیی یێن جوان دێ وەكی پێشەنگێن جیهانا نوو بن. هەوە جوانان دبێ بها ئوو باوەری یێن موكم ئوو بلند هەبن. بهایێن ل گۆرە یێ جیهانا پێشكەڤتی، ئانكۆ هزر ئوو ئارمانجێن بلند. هەر د وێ دەمێ دا ژی، ئامادە ئوو بەرهەڤی وەرگرتنا گوهاررتنێن هەیەجانی، ئەجێب ئوو نوو یێن كۆ دێ بقەومن ببن.

ژبەر وێ كۆ هەڤرركێن جیهانی یێن هەوە هەڤالێن هەوە نینە، هون دبێ شیانێن خوە یێن نەپەن خورت بكن ئوو چاڤێن خوە ل راستی یێن دەردۆرا خوە ڤە بكن. ژبیر مەكن، جوانێن ئەمریكی ئوو چینی هەڤرركێن گەلەك زەهمەتێن هەوە نە ئوو دخوازن وەكی هەوە قەهرەمان ئوو رێبەرێن جیهانا نوو بن. ژبەر وێ ب رژدی ئوو هەتا پشتی نیڤەكا شەڤێ مژوولی خویندنێ بن ئان بلا تبلێن هەوە دایم ل سەر كلیلدەپەیێ (= كیبۆردێ) كۆمپیوتەرێن هەوە بن. هەڤرركێن نەنیاس هەڤرركێن راستین یێن هەوە نە.

دا بزانن كا چاوا د جڤاكێن ناڤنەتەوەیی دا پێشەنگ بن، دخوازم چەند خالەكان ببێژم. هون دبێ فێری زمانێن بیانی ببن، دا بشێن دانوستانێ دگەل وان بكن. ب كێمی، دبێ بكارن ب رەهوانی ب زمانێ ئینگلیزی بئاخڤن ئوو د زمانەك ژ زمانێن دی یێن گرنگێن جیهانێ وەكی چینی، فرانسی، رووسی، ژاپۆنی، ئەلمانی ئان سپانی ژی دەستهەل بن. ئەگەر هون هۆسا نەكن، هەما پشتی دەركەڤتنا ژ فررینگەها ناڤنەتەوەیی یا سیۆلێ دێ ببن مرۆڤەكێ كەرر ئوو لال.

هەلبەت گەلەك باشترە كۆ نەتەوەیێن دی ژی فێری كۆرەیی ببن. ئەز باوەرم ئەگەر هێزا مە ل قادا جیهانی بەرفرەهتر ببت، رۆژەك دێ بهێت كۆ گەلەك ژ خەلكێ جیهانێ ژی دێ زمانێ كۆرەیی فێر ببن. لێ ژبەر وێ كۆ ئەڤ بوویەر رەنگە پشتی هەیامەكا درێژ بقەومت، ئەز باوەرم كۆ خەلكێ كۆرەیێ دبێ ل سەر فێربوونا زمانێ خەلكێ دی خوە گەلەك ماندی بكن، دا بشێن د قادا ناڤنەتەوەیی دا ب ئاوایەكێ چالاك پشكدارییێ بكن.

ل قۆناخا پاشتر، شیانێن هاژۆتنا ئالاڤێن هاتنووچوونێ ئوو شەهرەزایی یا ل كۆمپیۆتەرێ گەلەك گرنگن. هون دبێ ژبۆ بەرسینگگرتنا هەر رەوشەكێ ئامادە بن، ژبەر وێ كۆ تشتێن پێشبینی-نەكری هەرگاڤ رەنگە روو بدن، ئوو بێگومان ل سالێن

بهێن دێ ئەڤ هەر دو شەهرەزاییە هێشتا گرنگتر ژی ببن. هەر وەکی هون دزانن، ل ڤان چەند سالێن داویێ سووکا ترومپێلان ل کۆرەیێ گەلەك ب لەز پێشکەفتی یە ئوو هیڤیدارین کو هەر بەردەوام ژی بت. د پاشەرۆژەکا نەگەلەك دوور دا ئەم دێ پێشکەفتنەکا هۆسا بلەز د وارێ کۆمپیۆتەران ژی د جڤاکا خوە دا ببینین ئوو هێدی هێدی کۆمپیۆتەر دێ وەکی ئامرازێن پێدڤی یێن مالێ، دبستانان ئوو هەما ببێژە هەمی جهێن کاری لێ بهێت.[1] ژبەر وێ ئەز دیسا ژی تەکەز دکم کۆ شیانێن خوە یێن هاژۆتنا ئالاڤێن هاتنووچوونی ئوو بکارئینانا کۆمپیۆتەرێ خورتتر بکن. هون ب خوە دبێ ب گرنگی یا بێ-رەڤ یا ڤان شیانان ژبۆ رووبرووبوونا دگەل گوهارتنێن جڤاکا نوودەم بجەسن. هندەك شەهرەزایی یێن دی ژی هەنە کو هەوە ژبو گێررانا دەورێ ئێکێ د شانۆیا جیهانێ دا بەرهەڤ دکن: شیان ئوو باوەری-ب-خوە-هەبوون ئوو هێزا هەوە ژبۆ رووبرووبوونا دگەل هەر کەسەکی ئوو هەر رەوشەکێ.

شیان ئوو تەکنۆلۆجیایا کۆرەییان هەر وەکی یێن نەتەوەیێن پێشکەفتی نە. ئەز گەلەك ل بن تەسیرا کارمەندێن ڤێ شەریکەیێ مە کۆ ل سوودانێ، لیبیایێ ئوو وەلاتێن دی یێن ئەمریکایێ پرۆژە یێن خوە ب باشی دنیاسینن. ئەو د پرۆژەیێن هەڤپشك دگەل ئەمریکیان، ژاپۆنیان ئوو کاروەرێن وەلاتێن دی دا ژی ب-خوە-باوەرن. ب نهێررینا من، کەسەکێ کۆ بکارت هەمی شیانێن خوە ل ئەمریکایێ بکاربئینت، بێگومان دکارت وی کاری ل هەر دەرەکا دی یا جیهانێ ژی بکت. ئەز هەمی جاران خودان-شیانترین ئوو بلندفررترین بەرپرسێن فرۆشتنێ ل شەریکەیێ دپێشدا دهنێرم وەلاتێن ئەمریکایێ ئوو رۆژهلاتا ناڤین. ب دیتنا من ئەڤ وەلات زەهمەتترین ئوو دژوارترین جهێن جیهانێ نە. پشتی چەند سالێن تەجریبەوەرگرتنێ وان کەسان دهنێرم وەلاتێن وەکی ئەمریکا ئوو بریتانیایێ ئان وەلاتێن پێشکەفتی یێن پیشەسازێن دی. ئەز باوەرم کەسێ بشێت ل وان وەلاتان کار بکت ئوو خوە بگونجینیت، دکارت ل هەر دەرەکا دی یا جیهانێ سەربکەڤت.

---

(١) هون بئینن بیرا خوە کۆ ئەڤ کتێب چەند سالان بەری نها هاتی یە نڤیسین ئوو نها کۆرە ب شەریکەیێن خوە یێن مینا دێوویێ، سامسۆنگێ ئوو هیۆندایێ ئێك ژ پێشەنگێن پیشەسازی یا کۆمپیۆتەران ئوو تێلەفۆنێن بەریکێ ئانکۆ موبایلانە. ئەڤ پێشبینی یا نڤیسەری ژی راست دەرهات.

ل ڤێ دووماهیێ، خەلکەك بوویەرێن جیهانێ وەکی سەربارکێن داکەڤتنا بازاروارێ ئوو فەرهەنگێن مەزنێن جیهانێ دبینن. ب گەڤاهی یا دیرۆکێ، ئەڤ بنگەهە شەنگستێ هەمی بازاروارێ ئوو فەرهەنگێن جیهانێ بوویە. ژبەر ڤان سەربارکان، شیانا ئافراندانێ ل نك جڤاکان لەواز دبت، ئەخلاق کێم دبت ئوو فەلسەفەیا "خوەش بهوراندنێ" د جڤاکێ دا بەلاڤ دبت. ئەم گەلەك جاران ڤان بوویەران وەکی نەساخی یێن تایبەتی یێن جڤاکێن پێشکەڤتی دبینین. گەلەك ژ خەلکێ جیهانێ ئالۆزی یا خوە ژ زێدەبوونا ڤان سەربارکان ئوو دیاردەیان ل جڤاکا ئەڤرۆ یا ئەمریکی ب ئەشکرا دبێژن.

بێگومان ئەرکێ مە یە کۆ هندی دکارین ژ نەتەوە یێن پێشکەڤتی زانست ئوو پیشەسازیێ فێر ببین، لێ نە پێدڤی یە کۆ د هەمی تشتەکێ خراب ئوو زیانبار دا ژی ل پەی وان بچین. مخابن، سرێما بەربەلاڤا جوانێن ئەڤرۆ یێن کۆرەیێ پەژراندن ئوو وەرگرتنا بێمەرج ئوو بێشەرتا هەر رێباز ئوو شێوازەکا رۆژئاڤایی یە. لێ ب دیتنا من، هون جوان نەچار نینە کۆ زاری رێبازێن نەحەزکری ئوو نەدرست ڤەبکن. هەلبەت درستە کۆ هەتا نها ڤان نەتەوەیان رۆلێ رێبەری یا جیهانێ لەیستی یە، لێ ژبیر مەکن کۆ ئەو ئێدی دێ ژ سەر شانۆیا سەرەکی دوور بکەڤن.

ل چەند دەهسالێن بهوری، مە د بن ئالایێ نووخوازیێ، پیشەسازکرنا جڤاکێ ئوو رۆژئاڤاییخوازیێ دا گەلەك بزاڤ کری یە کۆ زاری نەتەوەیێن پێشکەڤتی ڤەبکین، لێ نها رۆژەك ل رۆژهلاتێ ل سەر هلاتنێ یە کۆ ئێدی حەوجەدارا زارڤەکرن ئوو ل پەی چوونا ستێرا بەر ب ئاڤابوونا رۆژئاڤایێ نینە. ئەو نەتەوە ئێدی پێر ئوو ناڤسالڤەچوویی نە، ئەم جوان ئوو خورتین. ڤێجا ئەگەر ئەم جوان زارڤەکەرێن ناڤسالڤەچوویيان بین، ل شوونا خوەبەرهەڤکرنا ژبۆ لەییستنا رۆلێ ئێکێ، دێ دگەل وان ناڤسالڤەچوویيان ژ سەر شانۆیێ دەربکەڤین. نها چاڤێ جیهانێ ل مە یە ئوو ل سەر هەوە جوانان دمینت کۆ ژینوەرانە ئوو ب زیندیتی مێرخاسی ئوو شیانێن نەپەن ئوو پەنی یێن ڤی وەلاتی نیشا جیهانێ بدن. ئێك ژ هیڤی یێن من یێن هەری کوور ئوو درێژ ئەو بوویە کۆ هون پێشەنگێن چەرخا نوو ئوو پەهلەڤانێن جیهانا نوو بشێن بارێ بەرپرسیاریتی یا خوە هلبگرن ئوو بگەهینن جه. لێ ژبۆ بێهنەکا ب تەنێ ژی ژبیر مەکن کۆ هون نڤشێ بەراهیێ یێ کۆرەیێ نە کۆ دچن سەر شانۆیا جیهانێ ئوو چاخەکێ نوویێ جیهانێ ب هەوە دەست پێ دکت.

# نهینی یا ساخلەمیێ

هندەك وەسا هزر دكن كۆ من نهینیەكا تایبەتی ژبۆ ساخلەمی یا خوە هەیە. ژبەر وێ كۆ ب لەز-ئوو-بەزەكا وەسا كارێن خوە بجە دكم كۆ ب گەلەك كەسان وەرە ئەڤ لەزووبەز تشتەكێ گەلەك گرانە. لێ من چ نهینیەك نینە، ئوو چ جاران ژی من دەما خوە ب هندێ نەمەزاختی یە. رەنگە پچەكێ مەزنكرن تێدا بت ئەگەر ببێژم كۆ ئەز خوە هەمی گاڤان جوان دبینم ئوو چ جاران ژی ئالۆزێ ساخلەمی یا خوە نەبوومە.

ل دەما شەرێ كۆرەیێ، دەما ئەز دگەل مالباتا خوە ژ "دائێگۆ"یێ رەڤیام، ژبۆ فرۆشتنا رۆژنامەیان رۆژێ ١٠ كیلۆمەتران ب پیان دچووم. رەنگە وان پەیاچوونان بناغەیێ پەیتێ ساخلەمی یا من دارێهت بت. دەما من ل زانینگەهێ ژی دخویند، من بوكسانێ ئوو وەرزشێن دی دكرن.

رەنگە هندەك وەسا هزر بكن كۆ ژبەر وێ كۆ ئەز كاروەرەكم، دبێ شەهرەزاییێ یاری یا گۆلفێ[1] بم. لێ هەتا نها دەستێ من ژی ب كاشۆیا گۆلفێ (= گۆپالێ گۆلفێ) نەكەڤتی یە. من چ جاران ژبۆ گۆلفێ وەخت نەبوویە ئوو من ئەو وەكی وەرزشەكا درست ژی قەبوول نینە. ژبەر وێ گەلەك بالا من كێشا، دەما من د كتێبا بناغەدانەرێ دامەزریایی یا پیشەسازی یا ناڤدار یا ژاپۆنێ "تۆكۆتۆشیۆیێ" دا خویند كۆ نهێررینا وی ژی ژبۆ گۆلفێ وەكی یا منە. جارەكێ دەما كارمەندێن وی ژێ دخوازن كۆ گۆلفێ بكت، دبەرسڤت كۆ نزانت بۆ چ ئەو ئەڤیندارێن هندێ نە كۆ تۆپەكا بچووك بكن ناڤ كونەكا

(١) گۆلف (golf) یاریەكا بەربەلاڤا جیهانی یە كۆ كەڤنترین تۆمارا وێ ڤەدگەرت سالا ١٤٥٦ێ ل سكۆتلاندایێ. د ڤێ یاریێ دا تۆپەكێ (= گۆكەكێ) ب كاشۆیەكی (= گۆپالەكی) دكن ناڤ هندەك كونێن بچووك. د ناڤ هەمی یاری یێن نوودەم دا یێن كۆ ب گۆكان دهێن كۆن، تەنێ قادا گۆلفێ قادەكا نەدیاركری یە.

بچووك. ئەو پێڤەچوو ئوو گۆت رێڤەبرنا شەریکەیەکا پیشەسازی گەلەك ژ یاری یا گۆلفێ بتامترە.

ئەڤ درست هەستا منە. دەما بەهسا مژوولی ئوو خوەسەرگەرمکرنێ دهێت کرن، یاری یا گۆلفێ دکەڤت بنێ رێزکا (= لیستەیا، قاییمەیا) من. خوەشی یا کۆ ئەز ژ کارکرنێ دبم گەلەك ژ هندێ زێدەترە. بل ژ هندێ، ژبۆ ساخلەمیێ ژی ئەز گۆلفێ ب تشتەکێ بهادار نزانم، ئەز دهزرم کار ئوو بزاڤێن خورت، وەرزشەکا کێراتر ئوو باندۆردارترە. ئەز دهزرم کۆ مرۆڤێ کارکەر حەوجەدارێ وەرزشێ نینە.

گەلەك جاران کۆ ئەز گەلەك خەلکی ل هۆلێن لەش-راهینانێ (= کەمال ئەجسامێ) دبینم، وەسا دهزرم کۆ ئەو لەوما دەما خوە ل وان دەران دمەزێخن کۆ چ جهێن دی ژبۆ خوهدانێ نینە. هژمارا هۆلێن وەرزشێ ئوو ساونایێ ل کۆرەیێ ب لەز زێدە دبت. ئەڤ نیشانا هندێ یە کۆ خەلکەك ژبۆ ساخلەمی یا خوە بەرێ خوە ددن وەرزشێ. لێ هێشتا ئەز تێ نەگەهشتمە کا بۆ چ خەلك ژبۆ ساخلەمی یا خوە ئوو راهینانا لەشێ خوە ڤی هەمی دراڤ ئوو دەمێ دمەزێخن. ئەگەر کەسەك ژ من بپرست کلیلا ساخلەمی یا تە چ یە، دێ ببەرسڤم "خوەماندیکرن". ئەز د راستیێ دا هێز ئوو شیانا خوە ژ بزڤینا زێدە یا خوە وەردگرم. ئەز دزانم ژی کۆ کارێن بێزارکەرێن کۆ مرۆڤی ماندی دکن دکارن ژبۆ ساخلەمی یا مرۆڤی زیانبار بن. ئوو کارێن کۆ مرۆڤ ژێ حەز دکت ژی دکارن دلێ مرۆڤی ڤەبکن ئوو هێزێ بدن مرۆڤی. لەوما، کارێ خوە ب خوەشی ئوو شادی ڤە بکن، هون دێ ب راستی هەست ب ژینەوەری (= زیندیتی) ئوو کەیفخوەشیێ بکن. خوهدانا ل دەما کارکرنێ گەلەك ژ خوهدانا ل هۆلێن وەرزشێ بهادارترە. کارکرن ئوو خوەماندیکرن کلیلا ساخلەمی یا منە. من بەری نها ژی گۆت، کارکرن خوە-مژوولکرنا منە. نها ژی ب ئەشکرایی دبێژم کارکرن ئوو خوەماندیکرن نهینی یا ساخلەمی ئوو لەشساخی یا منە.

ئەز دهزرم کۆ ئەگەرەکا دی یا ساخلەمی یا من، زادێ هەژی ئوو خوارنا زادێن جۆر-ب-جۆرە. ئەز هەمی گاڤان زادێ خوە هەڤسەنگ رادگرم. ب ئاوایەکێ ئەدەتی زادەکێ زەهف ب لەز دخوەرم. ئەگەر هون خەباتکەر ئوو خوەماندیکەر بن، دێ نەچار بن زادەکێ زەهف بخوەرن. ئەز ژبەر وێ کۆ دچم گەلەك وەلاتێن جیهانێ، فێری هەمی زادان بوومە.

مەتەلەكا كەڤن دبێژت "زادێ هەژی باشترین دەرمانێ پێشگرتنێ یە". هەر ل درێژی یا ڤی بابەتی ژی دبێژم كو ئەگەر ل سەر زادی موهانەیان نەگرن ئوو زادەكێ هەژی بخوەرن، هنگی ژبو چارەسەرا نەساخیان حەوجەدارێ دەرمانان ئوو دەمكری یێن كەڤنەشوپی نابن. ڤێجا هەمی جورەیێن زادی ب كێف ئوو خوەشی بخوەرن. لێ ئەگەر هون ل سەر زادی موهانەیان بگرن، هون نكارن ب ساناهی سەفەران بكن. ل دەما سەفەرێن دەرڤەیی وەلاتی هون دێ خەلكێن جوربجور بنیاسن ئوو دێ زادێن جوربجور بهێن بەری هەوە، هەر د وێ دەمێ دا ژی ژبو هەڤالینی ئوو دوستینیێ ئوو تێكهلی یا دگەل وان خەلكان دبێ هون ئامادە بن كو زادێن وان بخوەرن. ئەگەر هون سەفەرێ بكن ئەمریكایێ دبێ زادێن ئەمریكایی بخوەرن ئوو ئەگەر سەفەرێ بكن روژهلاتا ناڤێن دبێ گوشتێ مەران بخوەرن. ئەگەر زاد ب دلێ هەوە ژی نەبت، دیسا ژی بزاڤێ بكن وی زادی بخوەرن، ب نهێررینا من ئەڤ باشترین رێ یا پەیداكرنا هەڤالانە.

دەما هون بخوازن بەرهەمێن خوە بفروشن، ئەڤ بابەت هێشتا گرنگتر ژی دبت. هندەك جاران ئەز د شەڤەكێ دا ل دو جهان ڤەخوەندی یێ (= دەعوەتێ) شیڤێ مە، هنگی ئەز بزاڤێ دكم كو ژ هەر دو شیڤان تام بكم. ئەز چ جاران ل سەر زادی موهانەگر نەبوومە ئوو وەسا دهزرم كو خوەشی یا كو ئەز ژ خوارنا زادێن جوربجور دبینم ئوو تێكهلی یێن من دگەل خەلكێن جوربجور دەورەكێ گرنگ د سەركەڤتنێن ناڤنەتەوەیی یێن من دا هەبوویە.

هەلبەت ئەز باش دزانم كو نابت خەلكی تێهن بدم زادی ب لەز بخوەرن. لێ ژبەركو ئەز لەزگینم، خوارنا ب لەزا زادی بوویە ئەدەتێ من. پررانی یا جاران كو ئەز دگەل كارمەندێن "دێوو"یێ زادی دخوەرم، بەری ئەو نیڤەكا زادێ خوە بخوەرن ئەز زادێ خوە داوی دكم. هەلبەت ئەو كارمەندێن كو دگەل من دهێن سەفەرێن دەرڤە یێن وەلاتی فێری بلەزخوارنێ بوونە. ل سەر ناپلیونی[1] دبێژن كو وی ب هەشت دەقیقەیان فراڤین

(١) ناپلیونێ بوناپارت (Napoleon Bonaparte) (١٧٦٩-١٨٢١) ئیمپەراتورێ ناڤدارێ فرانسایی كو دەستهلاتا شورەشا فرانسایێ ب دیكتاتوری یا خوە تێكشكاند. ئەو ئێك ژ مەزنترین سەركردەیێن لەشكری یێن دیروكێ یە ئوو پررانی یا وەلاتێن ئەورووپایێ ئێخستن بن ركێفا خوە.

ئوو ب ١٢ دەقیقەیان شیڤ دخوار. ئەڤ نیشا ددت کۆ د دیرۆکێ دا مـرۆڤێن پررکـار ئـوو پرربزاڤ گەلەك خوە ب خوارنێ ڤە مژوول نەکری یە.

خـالا کـرنگ بابـەتی زادی نینـە، گـرنگ پاراسـتنا سـاخلەمیێ بـێ خوارنـا دەرمـانێن نـوو ئـوو دەمکـری یـێن گیایـان ئـوو سـەردانا هـۆلێن وەرزشـێ ئـان دابەزانـدنا کێـشا زێدە یا لەشی یە.

فەلسەفە یا من یا کەسۆکی ئەوە کۆ مرۆڤ دکارت ب رێ یا ئەدەت ئوو کارێن رۆژانـە ساخلەمی یا خوە بپارێزت.

سرێما جڤاکێن ئەڤرۆ مەیلا زێدە بێقاما پاراسـتنا سـاخلەمیێ ئـوو لەشـساخیێ یـە. لێ ئـەز دخـوازم تەکـەزێ ل سـەر ساخلەمی یـا رەڤـانی ژی بکـم. رحـا سـاخلەم گەلـەك گرنگـە. ئـەڤ هـزر کـۆ دبێـژت لەشـەکێ تـژی ماسـیلکە (= عەزەلـە) کلـیلا سـاخلەمی یـا سـەربەردایی یـە، رەنگـە ب دەربازبوونـا دەمـێ ببـت نەسـاخیەکا رەڤـانی ئـوو روحـی. هزرێن وەها رەنگە هەوە بگەهینن جهەکی کۆ بفکـرن خـوەراگری ئـوو بـەرخوەدان ئـوو بکارئینانا هێزا لەشی وەکی هەڤن. لێ ب دیتنا من هزرەکا هۆسا ب راسـتی دکـارت ژیانـا هەوە تێك بدت. ژبەر وێ کـۆ لەشـێ سـاخلەم هنگـی بهـادار ئـوو ب قیمەتـە کـۆ هزرەکـا ساخلەم ئوو رەڤانەکێ ساخلەم وی لەشی کەملان بکن.

ب سەر هندێ را کۆ ئەز دامەزرینەرێ دامەزرياييەکا پێشەسازی مە، ئەز دهزرم کـۆ رەڤـانێ مـە گەلـەك ژ لەشـێ مـە گـرنگترە. ئارمانجـا دامەزرینـەرەکێ دامەزرياييـەکا پێشەسازی د راستیێ دا ئەو نینە کۆ قەلەو ئوو مەزن ببت. ئارمانجا سـوقراتێ[1] برسـی ژی ئەو نەبوو کۆ ببت سوقراتەکێ تێر ئان سوقراتەکێ قەلەو. ئەم دبێ ب هـەمی هێـزا خوە ڤە دژبەری وان جۆرەیێن پێشکەڤتنێن ئـابۆری ئـوو مـادی رابوەسـتین کـۆ ئـەنجاما وان هاتنەپێـشا زکـان ئـوو تێرکرنـا نەفسێ نـە. گرنگیـدانا ب مـادەی هـەتا وێ قۆنـاغێ بهادارە کۆ تێکهلی وەرارا روحێ ئوو رەڤانێ کتەکتا کەسێن جڤـاکێ بـت. ئەگـەر نەوەسـا

---

(١) سۆقرات (Socrates) (٤٧٠–٣٩٩ێ بەری زایینێ) دامەزرینەرێ فەلـسەفەیا یـەونانی یە. ئەو زاهد ئوو دژبەری خوەشی ئوو رهەتی یـێن ژیـانێ بـوو. ئاتنیـان ئـەو ب ژەهـرێ کوشت. فەلـسەفەیا وی ب رێ یا ئەفلاتوونی گەهەشتی یە مە.

بت، پەروەراندنا لەشی ب تەنێ ژبۆ خوەرسکێ ئوو ژبۆ هزرا مرۆڤی زیانبارە. وەرارەکا ئابۆری یا وەسا ژبۆ جڤاکێ بەخترەشی ئوو نیکبەتە. ئەو نەعمەت ئوو بەرەکەت نینە.

ئەشکرایە کۆ لەشێ ساخلەم ژبۆ روح ئوو رەڤانەکێ ساخلەم گەلەك ب تەسیرە، ژبەرکۆ هش ئوو ئاقلێ ساخلەم هەمی بهایێن مرۆڤانتیێ کۆنترۆل دکت. ژبەر وێ ئەز دخوازم کۆ ل-پێش-بوون ئوو گرنگی یا ساخلەمی یا رەڤانی ل بەرانبەری ساخلەمی یا لەشی تەکەز بکم.

ئەڤرۆ، خەلك بێقام خەما ساخلەمی یا خوە دخوەرن. هەلبەت ئەز ب چ روویەکی ناخوازم کۆ ژ قیمەتا ساخلەمی یا لەشی کێم بکم، ژبەر وێ کۆ مرۆڤ بکارت ژ زادخوارنێ ئوو کارکرنا کۆ حەز ژێ دکت خوەشیێ ببینت، دبێ ژ ئالی یێ لەشی ڤە ساخلەم بت. لێ نابت هەمی دەمان هزر ئوو خەما هەوە ساخلەمی بت. ئەز وەسا دبینم کۆ گەلەك باشترە مرۆڤ ب رەڤانەك ئوو ئاقلەکێ ساخلەم ڤە بژیت، هەتا کۆ ژبۆ ساخلەمی یا لەشێ خوە نەچار ببت بەردەوام دەرمانان ئوو دەمکری یێن گیایان بخوەرت ئوو هەرگاڤ بلەز خوە بگەهینت هۆلەکا وەرزشێ.

دەما جڤاك ژینفرەه (= خودان ریفاهیەت) ببت ئوو پێش بکەڤت، پووتەپێکرنا ب مادەی بەرفرەهتر دبت ئوو خەلك ب ساناهی گرنگی ئوو بهایێ ساخلەمی یا رەڤانی ژبیر دکن. ئەڤرۆ گەلەك ژ خەلکی ژ ئالی یێ لەشی ڤە گەلەك ساخلەمن، لێ ژ ئالی یێ روحێ ڤە گەلەك رەوشا وان خرابە. ئەگەر روحا هەوە نەساخ بت، ساخلەمی یا لەشی ژبۆ چ یە؟ زکەکێ تێر ئوو مەژیەکێ کورت ئوو ڤارێ (= ژ رییێ دەرکەڤتی) چ بها هەنە؟

جارەکێ من ل جهەکی خویند کۆ جوان نزانن چاوا دەما خوە بکاربئینن ئوو ناڤسالڤەچوویی ئالۆزن کا چەند ژ تەمەنێ وان مایە. ل سەر ڤی بناغەیی، دخوازم ببێژم جوانێن کۆ دهزرن گەلەك وەختێ وان هەیە، ئوو ژبەر وێ ژی گەلەك قەدرێ وەختێ خوە نزانن، گەلەك ژ مێژە یە جوانی یا خوە ونداکری یە. رەنگە راست بت کۆ ببێژم پررانی یا جوانان زێدەتر خەما ساخلەمی یا رەڤان ئوو لەشێ خوە هەیە ئوو ناڤسالڤەچوویی زێدەتر بەندی یێن رەوشا لەشێ خوە نە. لەوما جوانێن کۆ تەنێ هزرا ساخلەمی یا لەشێ خوە دکن، جوانی یا خوە خسار کری یە.

بەهرا سێزدەهێ

# كار وەكی مژوولی

ئەز سالێ زێدەتر ژ ٢٠٠ رۆژان د سەفەرێن دەرڤەیی وەلاتی دا دبهورینم ئوو هندەك رۆژێن سالێ ژی ب سەفەرێن ناڤ وەلاتی دەرباز دكم. لەوما، دەما كۆ ئەز ب مالباتا خوە را دەرباز بكم گەلەك كێمە. هندەك جاران نە هەما رۆژابوونا زارۆ یێن خوە ئان ژنا خوە ژبیر دكم، رۆژابوونا خوە ژی ژبیر دكم.

ئەز گەلەك مژوولم. دبێ پێزانینێ بكم كۆ ئەز ژ ڤی هەمی كار ئوو مژوولی یا خوە رازی ئوو كێفخوەشم ئوو هند خوەشیان ژێ دبینم كۆ هندەك دبێژن ئەز دینێ كاركرنێ مە. ژ رۆژا دەستپێكرنا كارێ خوە هەتا نها من رۆژەكا ب تەنێ ژی ئیجازە وەرنەگرتی یە ئوو ناهێت بیرا من ژی كۆ ل دەمەكا بێهدانێ دا ئەز دگەل مالباتا خوە چووبم رەخ دەریایێ. هەلبەت ئەز ل سەر ڤی تشتی خەمبار ئوو ئالۆز ژی نینم.

ئەز باوەرم ئەگەر هون ب هەمی شیانێن خوە ڤە كار ئوو بزاڤێ بكن، سەركەڤتنا هەوە مسۆگەرە. كەسەكێ كۆ ب هەمی شیانا خوە ڤە كاردكت، چ جاران ناشكێت.

ئەز وەسا دهزرم كۆ هندەك كەس ژ خوە دپرسن مرۆڤەكێ پرركار ئوو پرربزاڤێ مینا من دبێ خوە ب چ مژوولیەكا دی ڤە مژوول بكت. رەنگە گەلەك كەس تێنەگەهن كا بۆ چ ئەز هۆسا كار ئوو خوەمژوولكرنێ تێكهل دكم ئوو هندە بەنی یێ كار ئوو بزاڤێ مە.

ئەز باوەرم كۆ ئەڤ نهێررین یێن وان كەسانن كۆ چ جاران خوەشی یا درستا كاری نەدیتنە ئوو ب ڤەنجی یا وی جوانی نەحەسیانە كۆ ژدل بەندی یێ كارێ خوە یە. ئەو ب خوەشی یا كۆ مرۆڤ ژ سەركەڤتنێ دگەهتێ ژی نەحەسیانە.

ئەشكرایە كۆ ژبۆ گەلەك كەسان كاركرن تشتەكێ بێزاركەر ئوو مانديكەرە. ل گۆرە يێ ئامارەكا ڤێ داويێ ٢٣,٥٪ (بيست ئوو سێ ئوو نيڤ ژ سەدێ) ژ شاگردێن بەرهەڤيێ ل كۆرەيێ پەيڤێن نەيينى دەرهەڤا كاركرنێ دا بكاردئينن، پەيڤێن مينا: "نەفرەت لێكرى"، "پررسەرئێش"، "بێزاركەر". ئەڤ هژمار هەما ببێژە دو ڤاتى هژمارا وان كەسانە كۆ ب ئاوايەكێ ئەرينى ل كاركرنێ دنهێررن. ئەز هەست دكم كۆ جوانێن ئەڤرۆ ل شوونا هندێ كۆ كار ئوو پيشەيێ وەكى ئارمانجەكا سەرەكى ببينن، تەنێ ل كاركرنێ وەكى ئامرازەكى دنهێررن دا پێ بگەهن خوەستەكێن خوە يێن دى.

ب نهێررينا من تشتەكێ گەلەكێ خەمگينە كۆ مرۆڤێن كۆ ژ هەمى ئاليان ڤە گرێدايى ئوو ڤەبەستى يێن هەڤن، كاركرن ئوو پيشەيا خوە تەنێ وەكى ئامرازەكى ببينن كۆ زكێ خوە پێ تژى بكن. ژ ڤێ داخبارتر ژى رەوشا وان كەسانە كۆ ل گەرمەگەرما جوانى يا خوە ل شوونا هندێ كۆ مشتى ژيانێ ئوو ژينەوەرى ئوو هيڤى ئوو خوەزيان بن، كاركرنێ وەكى تشتەكێ بێزاركەر ببينن.

ئەگەر خەلك ل شوونا هندێ كۆ ل كار ئوو پيشەيێ وەكى ئەگەرەكا سەركەڤتنێ، بەختەوەريێ، وەرارا كەساتى يا خوە ئوو باشتركرنا جڤاكێ بنهێررن، تەنێ د هزرا بدەستڤەئينانا مادەى دا بن، هنگى ب راستى بێحورمەتى ب ئاييێ كاركرن ئوو پيشەگەريێ هاتى يە كرن.

كار ئوو پيشە گەلەك بهادار ئوو گرانبهانە. نابت مرۆڤ وان تەنێ ژبەر مادەى هەلبسەنگينت. ئەگەر هون شەهنازيێ ب كار ئوو پيشە يا خوە بكن ئوو ژێ رازى بن، هنگى دێ پيشە يا هەوە ببت كانيەكا بێ داوى يا خوەشى ئوو لەزەتێ ئوو ئەڤ خوەشى دێ ببت سەدەما كەيفخوەشى ئوو سەربلندى يا هەوە.

ئەڤ گۆتن دەرهەڤا خويندنێ دا ژى درستن. شاگرد دبێ ب رژدى ئوو ژدل دەرسێ بخوينن. هون دبێ هند خوە نقوومى خويندن ئوو دەرسێ بكن كۆ خەلك ببێژن هون كرمێن دەرس ئوو خويندنێ نە. ئەرێ هەوە چ جاران ل شەوڤا چاڤێن شاگردەكێ زانينگەهێ كۆ ب تڤاڤى نقوومى دەرس ئوو خويندنێ يە تەماشە كرى يە؟ هەبوونا شاگردێن وەسا شەوقەكا تايبەتى هەيە ئوو ئەز دهزرم هەر كەسێ ب ڤى ئاوايى مژوولى كارەكى ببت ب وى ئاوايى دێ روهن ئوو شەوقدار ببت. كار ئوو پيشە ژبۆ

بدەستڤەئینانا پارەی ئوو خویندن ژبۆ بدەستڤەئینانا دەرەجەیان ئوو شەهادەیان تێرا چ تشتەکی ناکن. دبێ مرۆڤ ژ کارکرن ئوو خویندنا خوە خوەشیێ ببینت. گەلەك جهێ داخێ یە کۆ شاگردێن وەسا هەبن خوە نەچاری دەرس-خویندنێ ببینن. ژ وێ ژی خرابتر ئەو شاگردن کۆ هەما ب زۆر ژی نکارن بخوینن.

ڤێجا هون نابێ خویندنێ وەکی ئەرکەکێ نەچاریێ بزانن. ئەگەر هۆسا یە، هون دبێ هزرا خوە بگوهێررن. دپێشدا خویندنێ ب کارەکی بزانن کۆ گرێدایی هەوە یە ئوو هون ب خوە دخوازن کۆ بکن. هنگی دێ خویندن ژبۆ هەوە شرین ببت ئوو دێ ببت سەرووکانی یا خوەشیێ. ب لبەرچاڤگرتنا ڤان تشتان، هون دبێ خویندنا خوە ئوو پیشە یا خوە وەکی سەرمایەیەکێ ژبۆ ژینفرەهی یا جڤاکێ بزانن.

دەما کەسەك پرسیارا مژوولی یێن من بکت، ئەز گەلەك دشەپلم ئوو شەرپزە دبم، ژبەرکۆ وێ گاڤێ چ تشتەك ناهێت هزرا من. هەر چندە کۆ ئەز هندەك جاران "گۆ"یێ[1] دکم، لێ ئەز نکارم ببێژم وێ مژوولی، ژبەرکۆ دێ بێحورمەتیەك بت ب وان کەسێن کۆ گەلەك شەهرەزایانە وێ یاریێ دکن. من چ جاران گۆلف نەکری یە ئوو هەتا نها ژی پی یێن من نەکەڤتنە هۆلێن کۆنسێرتان ئان شانۆییێ.

تەنێ ئەز ژ تشتەکی خوەشیێ دبینم: کارکرن. هەتا نها ژی چ کەسەکی ئەز نەچار نەکرمە کۆ کار بکم. ڤێجا ئەگەر مژوولی تشتەك بت کۆ مرۆڤ پێ کێفخوەش ببت ئوو خوەشیێ ژێ ببینت، مژوولی یا من ژی کارە.

ئەگەر هون کار ئوو خویندنێ وەکی ئەرکەکێ زێدە بزانن، هەردو دێ هێدی هێدی ببن بارەکێ گران ل سەر ملێن هەوە. لێ ئەگەر هون کار ئوو خویندنێ وەکی مژوولیەکێ بحەسبینن، هنگی دێ خوەشیێ ژێ ببینن ئوو دێ ساناهیتر لێ بهێن ئوو دێ ژدل ئوو جان بکن. ل دووماهیێ ژی دێ شیانێن هەوە پێ زێدە ببن. ل ئالیەکێ دی، چ قاس شیان ئوو هێزا هەوە زێدە ببت، ئەنجامێن باشتر ئوو دلخوازتر دێ ب

---

(١) گۆ (go) یاریەکا بەربەلاڤا رۆژهلاتا ئاسیایێ یە، ب هندەك بەرکان ل سەر دەپەیەکێ دهێت کرن کۆ ١٩ هێلێن ئاسۆکی ١٩ هێلێن ستوونکی دبرن. ڤێ یاریێ بەری ٣٠٠٠ سالان ل چینێ سەرێ خوە هلدایە ئوو ئەڤرۆ یاری یا نەتەوەیی یا ژاپۆنیانە.

دەستڤەبئینن ئـوو ل دوومـاهیێ دێ بەختـەوەری ئـوو کەیفخوەشـی ب ئەشـکرایی پـارا هەوە بت.

ئەگەر کاروەر دگەل بجهئینانا کارێ خوە وەکی مژوولیەکێ ژی خوەشیێ ژێ ببینـت، کـارێ وی دێ هێـدی-هێـدی گەشـتر ببـت ئـوو شـیانێن وی ئـوو دەسـتهلی یـا وی دێ بـەرفرەهتر بـبن. هـەر ب ڤـی رەنگـی، ئەگـەر شـاگردەك وەکـی مژوولیـەکێ خوەشـیێ ژ خویندنا خوە ببینت، بێگومان دێ دەرەجە یێن وی ئوو رێزا وی زێـدەتر لـێ بهێن ئـوو رەنگە خەلاتان ژی وەربگرت. ئەگـەر هـون ژ مـن باوەرنـاکن، تـەنێ جارەکێ بجـەرببینن. ئەگەر ژبۆ گەهشتنا ب سەرکەڤتنێ هەوە رێیەکا دی هلبژارت بـت، وەکـی هنـدێ یـە کـۆ هون بخوازن ب چنگ ئوو لەپێن خوە بگەهن ستێرێن ئەسمانان. ئەگـەر هـون ب هـەمی شیانێن خوە ئوو ژدل ئوو جان نقوومی کارەکی ببن ئوو خوەشـیێ ژێ ببیـنن، چ جـاران تاما شکەستنێ ناکن.

حەفت سالان بەری دامەزراندنا شەریکەیا "دێوو"یـێ، ئـەز ل شـەریکەیەکا خزمـەکێ (= فامیلەکێ، ئەقربایەکێ) خوە مژوولی کاری بووم. هەر چـندە ئـەز ئێـك ژ ئەنـدامێن مالباتا خودانێ کاری بووم، من وەکی کارمەندەکێ ئاسایی کـاردکر ئـوو وەسـا دخـەبتیم هـەر وەکـی ئـەز ب خـوە خـودانێ کـاری. ئـەز ل بەنـدا دەسـتوور ئـوو فرمانـان نـەدمام. هەمی جاران ئەز ب خوە ل دوو کاران بووم، چ جاران ژی ئـەز دەرەنـگ نەدچووم سـەر کاری ئوو من تەنێ ژبۆ رۆژەکێ ژی ئیجازە وەرنەگرت. ژبەر خوەشی یا بێڤاما کۆ من ژ کارکرنێ ددیت، هەتا ئـەڤرۆ ژی ئـەز هـەر ب وێ دلگـەرمی ئـوو رژدیـێ کـاردکم. ڤێجـا، خوەشی یا دیتنا فلمەکا بالکێش ئان یاری یا گۆلفێ ب چ ئاوایەکی ناهێت رێـزا خوەشـی یـا سـەرکەڤتنا د مۆرکرنـا گرێبەسـتا پرۆژەیـەکێ دا پـشتی کـۆ هـەوە کـێش-مەکێـشەکا زەهف دگەل کاروەرێن مەزن یێن ناڤنەتەوەیی کربت.

هەلبـەت هێـشتا ژی ئـەز هنـدەك جـاران ژ هـەڤرووبوونا دگـەل کەسـێن نـوو د پرۆژەیێن نوو دا تووشی دلئالۆزیێ دبم. رەنگە هەر ئەو دلئالۆزی بت یا کۆ یاریکـەرەك ل یاریگەهەکێ ل دەما جەرباندنا شیانێن خـوە تـووش دبـت. لـێ پـرۆژە چـەند گـرنگتر ئوو مەزنتر بت، ئـەز هـزر ئـوو بـالا خـوە زێـدەتر ل سـەر بابـەتی کـۆم دکـم. پـشتی کـۆ

کارتێن خوه یێن برنێ ئوو سەرکەڤتنێ ل سەر ئەردی رادئـێخم ئـوو گرێبەسـتا دلخـوازا خوه ب ئاوایەکێ هەژی بدەستڤەدئینم ئوو ب رازیبوونـەکا بێقـام ڤـە دەسـتێ خـوه ددم دەستێ ئالی یێ دی یێ موعامەلێ ئوو بازاری، خوەشی ئوو کەیفـەکا وەسـا ژبـۆ مـن چـێ دبت کۆ ناهێت وەسفاندن.

ئیسال ژی نکارم سۆزێ بدم مالباتا خوه کۆ دێ ل رۆژێن بوونێن وان هەر ل مال ژی بم. هەلبەت ئەز گەلەك ژ ڤێ دلتەنگم، لێ ژبەر وێ کۆ مـن مالباتـەکا وەسـا تێگەهـشتی ئوو فاما هەیە سپاسدارم.

**بەهرا ئێکێ**

# دەرسەك ژ جیهانا تەڤنپیرکان

د سروشتی دا جۆرەیەکێ تەڤنپیرکان هەیە پشتی کۆ د تووشکێ دارێ دا هێکێن خوە دکت، تەڤنەکێ ل دۆری هێکێن خوە یێن بێهەژمار چێ دکت دا ژبەر چاڤان ونـدا بـبن. پشتی هەیامەکێ زارۆ یێن تەڤنپیرکێ ژ هێکان دەردکەڤن ئوو تەڤنپیرکا دایك بێ هندێ کۆ ل هزرا رەهەتی یا خوە بت، ژبۆ ڤەدیتنا زادی ژبۆ زارۆ یێن خوە دخـەتبت، کـارەکێ کۆ هەمی لاور ئوو کێزك دکن.

دەما زارۆ یێن تەڤنپیرکێ مەزن بوون ئوو هند بهێز بوون کۆ ب خوە نێچیرێ بکن، دایك ژبـەر وەسـتیان ئـوو مانـدیتیێ دکـەڤت ئـوو دمـرت. ژ ڤـێ ئـەجێبتر ژی ئـەوە کـۆ جۆرەیەکێ دی یێ تەڤنپیرکێ پـشتی دەرهاتنـا زارۆیـان ژ هێکـان، لەشـێ خـوە وەکـی زاد ددت وان. رەنگە مرۆڤ باوەر ژ ڤێ نەکت، لێ لەشـێ دایکـێ زادەکـێ باشـە ژبـۆ زارۆ یـێن تەڤنپیرکێ.

خالا دلتەزینا ڤێ دیمەنێ ئەوە کۆ ژیانا زارۆ یێن تەڤنپیرکان گرێدایی خوەگۆریکرن ئوو مرنا دایکێ یە. ئانکۆ دبێ دایك بمرت هەتا زارۆ بژین.

بەلێ راستە، ژینفرەهی یا نڤشێ پاشەرۆژێ گرێدایی خوەگۆریکرنا نڤـشێ نهـا یـە. د ڕاستیێ دا، مسۆگەرکرنا هێسایی ئوو ژینفرەهیێ بێ خوەگۆریکرن مومکن نابت. ئەگـەر ئـەم بخـوازین ژ ئـالی یـێ کەسـۆکی ڤـە ل ڤـی بابـەتی مێـزە بکـین، دبـێ ببێـژین کـۆ بەختەروەی یا زارۆان گرێدایی خوەگۆریکرن ئوو خوەقوربانکرنا دایبابانە. رۆندك ئـوو رەنجێن نڤشەکی دبن سەدەما پێشداچوون ئوو ژینفرەهی یا نڤشتەکێ دی.

هـەر دگـەل ڤـێ ژی، دایبـابێن نەبەرپرسـیار ئـوو لەشـپەروەر، پاشـەرۆژەکا پـرر ژ بەخترەشی ئوو نەخوەشی ژبۆ زارۆ یێن خوە بەرهەڤ دکن.

من گەلەك جاران دیتی یە، مالباتێن سەرکەڤتی ئەون کۆ دایبابێن وان ل شوونا هندێ کۆ د خەما رەهەتی یا خوە دا بن، ژبۆ رەهەتی ئوو ژینفرەهی یا زارۆ یێن خوە دخەتبن ئوو خوەگۆری دکن. دبێژی ڤەی ئەو ل گۆرە یێ وێ ڤانوونا سروشتی یا تەڤنپیرکان دچن. ژینفرەهی یا ئەڤرۆ یا وەلاتێ مە بەرهەم ئوو ڤەرێژا راستووراستا خوەگۆریکرن ئووماندیبوونا نڤشێ بەرترە.

ئەڤ بابەت دەرهەڤا هەمی نەتەوە یێن پێشکەڤتی یێن جیهانێ دا راستە. سەرکەڤتنا جڤاکێ ل سەر هیم ئوو شەنگستێ خوەگۆریکرنا تەڤانەیا نڤشەکی ئاڤا دبت. خەلك گەلەك جاران بەهسا "موعجیزا راینێ"[1] دکن. ئەرێ ب راستی ئەو موعجیز بوو. "موعجیزا راینێ" ژ کارکرنا هێسکحەلین ئوو بیست ئوو چار چاخکی (= سەعەتی) یا خەلکێ ئەلمانیایێ ژبۆ ئاڤاکرنا ئەلمانیا یا نوو پێڤەتر تشتەك نەبوو. تەڤگەرا ئاڤاکرنا ئاڤاهیان ژی هەر دەنگڤەدانا پرر ژ دەنگا خوەگۆریکرن ئوو خوەبەختکرنا ڤی گەلی یە ئوو ئەو خوەڤوربانکرن سەرپشکا ڤێ ژینفرەهی یا ئەڤرۆ یا ئەلمانیایێ یە.

میناکێن هۆسا زەهڤن. رح ئوو هەستا خوەگۆریکرنێ د مشەختێن پارزەمینا (= ڤارەیا) ئەمریکایێ دا ژی هەبوو ئوو بوو سەدەما پێشکەڤتن ئوو سەرکەڤتنا جڤاکا ئەمریکایێ یا ئەڤرۆ. سەرکەڤتنا ژاپۆنێ ژی هەتا توخیبەکی ڤەرێژا خوەگۆریکرنا خەلکێ ژاپۆنێ ل درێژاهی یا دەستهلاتا "مێیجی"[2] یە.

کێ ئنگلستان کر بریتانیا یا مەزن؟ کەسێن کۆ د زەهمەتی یێن بێهەژمار دا، وەکی کۆلەیان د رەوشێن خراب دا ل دەما شۆرەشا پیشەسازیێ خوە گۆری کر.

---

(١) موعجزا راینێ بەهسا خوەماندیکرنا بێ بەڤل ئوو بێ وینە یا ئەلمانیان د ئاڤاکرنا سەرژنوو یا ئەلمانیایێ پشتی وێرانکاری یێن شەرێ جیهانی یێ دویێ یە. دەڤەرێن دەردۆرا رووبارێ راینێ، ژبەر ئیمکانا هاژۆتنا ئەرزانا گەمیان ل سەر رووباری ئوو مادەنێن رەژوویا بەرین ئوو گەلەك سەدەمێن دی، بووبوو جهێ پیشەسازی یا نوو یا ئەلمانیایێ.

(٢) مێیجی (Meiji) (بوون ١٨٥٢- مرن١٩١٢) ژ سالا ١٨٦٧ێ هەتا مرنا خوە ئیمپەراتۆرێ ژاپۆنێ بوو. ل دەما دەستهلاتداری یا وی ژاپۆن بەر ب پیشەسازیێ ئوو نووژەنکرنا دەستهلاتێ ڤە چوو.

چ تشتەك د ژیانێ دا ب بەلاش بدەستڤە ناهێت ئوو چ بوویەرەك ژی سودڤە ئـوو ل گوترە ناڤەومت. هـون چـەند زێـدەتر بکۆلن، چالەکا کوورتر دێ چێ ببـت ئـوو چـال چەند کوورتر بت، ئاڤەکا زێدەتر دێ تێ بزێت. بناغە ئوو بنەما یا گرنگ ئەڤـە ئـوو چ تشتەکێ دی نینە.

دەرهەڤا کۆرەیێ دا، نڤشێ سالێن شێستان گەلـەك ژبـۆ نڤـشێ نها خـوە مانـدی کـر. ئەڤ خوەگۆریکرن هند زێدە بـوو کـۆ ئـەز ب ئاوایـەکێ ئـەدەتی ژ نڤـشێ خـوە را دبێـژم "نڤشێ خوەگۆریکەر". ل سالێن شێستان بـوو کـۆ ئـەم ب ئیمکانـا دامەزرانـدنا بناغـەیێ ئابۆریەکا پەیت ئوو نەتەوەیەکا خورت ئوو بهێز حەسیاین. پاشی ب دلەکێ مـوکم ئـوو ماندینەنیاسیەکا بێبەڤل ئوو بێهەڤتا، مە ئەو ئارمانج بجه ئینان. ژینفرەهی یـا نڤـشێ ئەڤرۆ، فێکی یێ وان خوەماندیکرن ئوو خوەگۆریکرنێن وان سالانە.

ئەز باوەرم کۆ نڤشێن خوەگۆریکەر چرایێن روهنێن سرێما دیرۆکێ نە. ئەو شـەوڤا ڤیانا موکما وان ژبۆ ئاڤاکرنا نەتەوەیەکا ژینفرەه ئوو بەختەوەر ئوو ژیانـەکا نـوو ژبـۆ مە ڤەدگێررت. ژبۆ خەلکێ کۆرەیێ تیرێژا وی چرایی وەکی ڤیان ئوو دل‌مـوکمی یـا وان ژبۆ ئاڤاکرنا نەتەوەیەکا بەر-ب-پـێش ئـوو پێـشکەڤتی یـە ئـوو سـەدەما سـەربلندی ئـوو کێفخوەشی یا نڤـشێن پاشـەرۆژێ یـە. نڤـشێ خوەگۆریکـەر نڤـشەکە کـۆ چ تـشتەك ژبـۆ خوە نەخوەست، تەنێ د هزرا پاشەرۆژێ دا بـوو. ژیانـا نڤـشەکێ وەسـا د خوەمانـدیکرن ئوو خوەڤوربانکرنێ دا کورت بوو بوو.

گەلـەك ئـوو گەلـەك جـاران نەتـەوە یـێن پێـشکەڤتی ژ مـن دپرسـن کـۆ چـما هـون کۆرەیی هەمی گاڤان گەلەك خوە ماندی دکن ئوو رۆژەکا ب تەنێ ژی بێهنـا خـوە نـادن. ئەرێ دەما هندێ نەهاتی یە کۆ پچەکێ ژ رەوشا خوە رازی ببن ئوو ژیـانێ ل بـەر خـوە هند گران نەکن ئوو پچەکێ د هزرا بێهنڤەدانا خوە دا بن.

بەرسڤا من ژبۆ وێ پرسیارێ ئەڤە: هون گەلەك باشتر ئوو ژینفـرەهتر ژ مـە دژیـن. ڤێجا هون ناهزرن کۆ نڤشێ پاشەرۆژێ یێ ڤی وەلاتی دبێ بزاڤێ بکت کۆ ژینفرەهـی یـا کۆرەیێ ژی بگەهینت ئاستێ ژینفرەهی یا وەلاتێن پێـشکەڤتی؟ هەسـتا نڤـشێ نها ئـەوە کۆ خوە بەرپرسیار دبینت کۆ ئامادەکاریێ بکت دا جـداتی یـا د ناڤبـەرا ژینفرەهـی یـا کۆرەیێ ئوو وەلاتێن پێشکەڤتی ژبۆ نڤشێن پاشەرۆژێ بەرتەسکتر ئوو کێمتر ببن.

ئەز ب خوە باوەرم کۆ ئەڤ وەلات هێشتا حەوجەدارێ خوەڤوربانکرێ یە. ئەز ژ وان کەسان دترسم کۆ ب زێدەگاڤی یێن کەسێن تازە دەست پێ راگەهشتی، ب ئاوایەکی رفتارێ دکن دبێژی ڤەی ئەم ئەندامێن وەلاتێن پێشکەڤتی نە.

ئەم ل دەمەکێ دژین کۆ جڤاکا مە هێشتا حەوجەدارا خوەماندیکرنێ یە، لەوما دبێ دیسا رحا خوەگۆریکرنێ ئوو خوەماندیکرنا جاران د خوە دا شیار بکین. ئەگەر ئەم خوەگۆریکرنێ وەسا راڤە بکین کۆ نڤشەك ژبۆ ژینفرەهی یا نڤشێ پاشەرۆژێ خوەگۆری بکت، ڤێجا دبێ هەر نڤشەك ژبۆ بەرهەڤکرنا پاشەرۆژەکا باشتر خوە گۆری نڤشێ پاشی خوە بکت. رازیبوونا هەر نڤشەکی هەمی جاران دبت سەدەما نەرازیبوونا نڤشێ پاشتر.

زارۆیەك فێکی یێ دارەکێ دخوەرت کۆ باپیرێ وی چاندی یە. ئەگەر چ دار نەبن، زارۆی چ تشتەك ژبۆ خوارنێ نابت. ئەگەر نڤشەك تەنێ ل حەوجەداری ئوو خوەستەکێن خوە بفکرت، چ تشتەکی ژبۆ نڤشێ پشتی خوە ناهێلت. بلا ل دەما گەهشتنا بەرێ دارێ ئەم ساخ ژی نەبین، ئەرکێ چاندنا دارێ هەر ل سەر ملێ مە یە.

چەند جهێ دلخوەشیێ یە کۆ زارۆیەك فێکی یێ وان داران بچنت کۆ باپیرێن وی چاندنە ئوو ل سەدەم ئوو ئەگەرێن دارچاندنا باپیرێن خوە بفکرت ئوو لێ هوور ببت.

خوەگۆریکرن هنگی مومکن دبت کۆ هون خوە ژبیر بکن ئوو تەنێ ل خەلکی بفکرن ئوو ژینفرەهی یا خەلکێ دی ل سەرڤەیی خوەستەکێن خوە ئوو بەرژەوەندی یێن خوە دابنن. خوەگۆریکرن بلندترین ئاستێ ڤیانا مرۆڤانە.

نها ل کۆرەیێ گەلەك خەلك بەهس دکن کا چاوا دبێ تۆڤێ گیای بکەڤت سەر ئاخێ ئوو نەپەن ببت هەتا دیسا سەر هلبدت ئوو شین ببت ئوو بەری بدت. ئەڤ خوەگوهاررتنا تۆڤی د راستیێ دا جۆرەیەکێ خوەگۆریکرنێ یە. تۆڤێ گیای دکەڤت سەر ئاخێ ئوو دهێت ڤەشارتن، پاشی رهان ددت ئوو دپشکڤت ئوو ل دوومـاهیێ ژی فێکی ددت. ئەگەر تۆڤێ گیای تەنێ د هزرا خوە دا بت، چاوا دێ بەری بدت ئوو شین ببت؟

ئەگەر تۆڤێ گیای ژ هلوەریان ئوو کەلشیانا خوە د ئاخێ دا خوە بدت پاش، وەکی وێ یە کۆ خوە ژ دانا بەری بدت باش. ئەڤ خوەدانەپاشا ژ خوەگۆریکرنێ دێ رێ یا

دەستڤەهاتنا ڤەدەرەکا زەهف ژ فێکی بگرت. کۆکا بابەتی گەلەك زەلالە: ئەگەر نڤشەك خوە گۆری بکت، نڤشێ پاشتر دێ بەرەکێ زەهف بدرووت. لێ دەما نڤشەك ژبۆ بەرژەوندی یێن خوە ڤی کاری ناکت، د راستیێ دا دەرفەتا چێبوونا هەمی جۆرەیێن ژینفرەهی ئوو سەرکەڤتنێ ژ نڤشێ پاشی خوە دستینت. کارەکێ هۆسا، خوەحەباندن ئوو ئەحمەقی یە.

وەسا دیارە کۆ جوانێن ئەڤرۆ یێن کۆرەیێ ژ بهیستنا پەیڤا خوەگۆریکرنێ بێزارن. هزرینەکا هۆسا ژبەر کارتێکرنا جڤاکێن رۆژئاڤایی کۆ زێدە ل سەر کەسینی یا کتەکەسێن ناڤ جڤاکێ ئوو ژیانا بێ‌ژان یا ڤێ گاڤێ تەکەز دکن پەیدا بوویە. ڤێجا، هون دەرهەڤا پەیڤا "خوەگۆریکرنێ" چاوا دڤکرن؟

خوەگۆریکرن پەیڤەکە کۆ نڤشێن نە گەلەك دوور گەلەك بکاردئینا. لێ وەسا دیار دبت کۆ جوانێن ئەڤرۆ چ مەعنەویاتەکا هۆسا فێر نەبوونە. کەس ب بیرا جوانێن ئەڤرۆ نائینت کۆ ژبۆ ئارمانجێن بلند دبێ خوەگۆریکرن هەبت.

ژبەر وێ کۆ کەس ڤان گۆتنان ب بیرا هەوە جوانان نائینت، رێیێ بدن من ئەز ڤی کاری بکم. ژبۆ پاشەرۆژێ ئوو ژبۆ باشتربوونا جڤاکێ خوە گۆری بکن. بجهئینانا خوەستەکێن کەسۆکی گەلەك شرینە، لێ خوەستەکێن خوە یێن کتەکەسی گۆری ئارمانجێن بلندتر بکن. ئەڤ رێ یا بهادارکرنا ژیانێ یە.

نڤشێ من نڤشەکە کۆ ژبۆ نڤشێ پشتی خوە وەکی تۆڤێ گیای ب خوەگۆریکرن د ئاخێ دا هات چاندن، ئوو هون جوانێن ئەڤرۆ ئەو کەسن کۆ دێ بەرێ وێ خوەگۆریکرنێ بچنن. ژ بیر مەکن کۆ هون ژی دبێ بهێن چاندن دا نڤشێ پشتی هەوە ژی تشتەك د جوخینێ دا هەبت.

### بەهرا دوییّ

# رەنگڤەدانێن هزریّ

من هەمی دەمان ژبۆ کاریّ خوە هەڤال ئوو دۆستێن باش ئوو بهاگران هەبوونە- ئێك ژ وان کەشە "رۆبرتیّ شوولێر" مزگیندەریّ ناڤدار ئوو ناڤنەتەوەیی یێ فرقە یا ئێڤانجلی[1] یە. بەری هەیامەکێ من ژ وی خوەست کۆ د ئێك ژ خولێن فێرکرنیّ ژبۆ رێکئێخستنیّ ژبۆ سەرۆك پشکێن شەریکەیا "دێوو"یێ بئاخڤت.

کەشە "شوولێر"ی د ئاخڤتنا خوە دا گۆت سەرۆك پشکان کۆ ئەگەر ئەو بخوازن بگەهن خوەستەکێن خوە یێن درست، دبیّ ب ریّ یا هێزا هزرینیّ هەستا پشت-خوە- بەستنیّ خورتتر بکن. ب گۆتنەکا دی هون ب هێزا هزرینیّ دکارن پاشەرۆژا خوە ئاڤا بکن. ئەگەر هون د راستا خەلکیّ دی دا خوە بچووك ببینن، سەدەما ویّ ئەوە کۆ هزرێن هەوە نەیینی نە ئوو هون خوە گەلەك ئاسایی دحەسبینن. هێدی-هێدی ئەڤ سالۆخەت ژی د هوندریّ هەوە دا پەیتتر بوونە ئوو هون بوونە ناڤەندا هەمی سالۆخەتێن وەسا.

ژبۆ میناك ئەگەر هون ب راستی بخوازن ببن کەمانژەن (= ڤیۆلۆنیست) ئان ئاڤۆکاتەکیّ (= محامیەکیّ) بەرچاڤ، دبیّ هەمی گاڤان وەسا هزر بکن کۆ هون ب راستی مرۆڤەکیّ مەزن ئوو بەرچاڤن. ب ڤی ئاوایی هون دیّ بشێن هەمی ئاریشە یێن خوە چارەسەر بکن ئوو هیڤی ئوو خوەزی یێن خوە ژی ب جه بئینن.

---

(١) ئێڤانجلیزم (Evangelism) بزاڤەکا دینی یا فەلەیێن پرۆتێستانتە کۆ باوەری یا وان ب شرۆڤەکرنا ئنجیلیّ نینە، ئەو ئنجیلیّ پەیڤ ب پەیڤ وەکی هەیی دپەژرینن ئوو ویّ ژێدەرا ئێکانەیا ئیمانا خوە دحەسبینن. ئەو د بەلاڤکرنا دینیّ فەلاتییّ گەلەك رژدن ئوو نها وەکی مەزهەبەکیّ توندریّ ل ئەمریکاییّ گەلەك ماییّ خوە د سیاسەتیّ دا دکن.

دەما ئەز جوان بووم، هەرگاڤ مـن دخوەسـت کـاروەرەکێ سـەرکەڤتی بم. هـەر چـندە هنگـی هـزرا مـن نـە گەلـەك زەلال بـوو، لـێ ئـەو خـوەزی ئـوو هیڤـی چ جـاران ژ مـن ڤەنەبوون. من دخوەست کاروەرەکێ سـەرکەڤتی بم کـۆ ژبـۆ ژینفرەهـی ئـوو پیـشکەڤتنا گەلێ خوە گەلەك بانـدۆردار بـت، ئـوو هـەرگاڤ مـن بـاوەری هەبوویـە کـۆ دێ بکارم وی کاری بکم. بابێ من، یێ رەحمەتی، ژی ژبەر وێ کۆ دزانی ئەز هـەر دێ بـبم کـاروەرەکێ سەرکەڤتی، گەلەك ئەز هاندەدام. ژ وێ دەمێ وەرە، هەرگاڤ ئەڤ هزر د مـەژی یـێ مـن دا بوویە کۆ دێ رۆژەکێ ببم کاروەر.

من ژ خوە را دگۆت کۆ دخوازم ببم کاروەر ئوو دێ ببم کـاروەر. ئـەز هـەما دبـنی را کـاروەرم ئـوو ڤـان تـەلقینان بـاوەری- ب-خوەبوونـەکا پـوولایین د مـن دا چـێ کـر. هـەر چندە ئەز سەر ب چ فرقە یێن چ دینەکی نیـنم، لـێ دەمـا ئـەز جوان بـووم مـن هـەمی جاران هەست دکر کۆ خودێ یێ مەزن ل جهەکی تەماشەڤانێ ژیانا منە.

من هەست دکر هەر کارەکی دەست پێ بکم، دێ سەربکەڤم، تشتێ پێدڤی تەنێ ئـەو بوو کۆ خوە ئێکدل بکم- هنگی ئەز پشت راست دبووم کـۆ دکـارم وی کـاری بکـم. هنگـی کو من ژ جوانی یا خوە پێڤەتر چ سەرمایەیەك نەبوو، باوەری-ب-خوەبوونا مـن چـەکێ مـن یـێ ئێکانـە بـوو. هەلبـەت، دبـێ ببێـژم کـۆ ئـەو چـەك مـەزنترین ئـوو کێراتـرین چەك بوو.

دامەزرێنـــەرێ دامـــەزرییایی یـــا پیـــشەسازی یـــا ناڤـــدار یـــا ژاپـــۆنێ ســـەیدایێ "تۆکۆتۆشـیۆ"ی جـارەکێ هنـدەك گـۆتنێن بهـادار ل سـەر بـاوەری-ب-خوەبـوونێ ئـوو ماندیتی-نەنیاسیێ گۆتن. ئەوی گۆت کـۆ ژبـۆ سـەرکەڤتنا د هـەر کـارەکی دا دبـێ هـەوە شیانا کرنا وی کاری هەبت. لێ شیان ئوو هێز ب تـەنێ تێـرا هـەوە نـاکن. دگـەل شـیانێ دبێ پێکۆل ئوو خوەراگری ئوو خوەئێکدل- ئوو ئێکهزرکرن ژی هەبت.

وی ژ تێکهەلەکا ڤان هەر سێ سالۆخەتان را دگۆت ماندیتی-نەنیاسی ئـوو دگـۆت کـار ئوو چالاکی د هەمی حالان دا ئاریشە ئوو شکەستان ب خوە رادئینن. ماندیتی-نەنیاسـی شیانا بەرسـینگگرتنا تـەهلی ئـوو دژواریـان ئـوو نـەرەڤینا ل دەمـا شکەسـتێ یـە. رەنگـە کارێن گەلەك نوو ئوو ئەجێبێن هەوە ژی شکەستن ئوو ئاریشەیان ل پەی خـوە بئیـنن. لێ خالا گرنگ ئـەوە کـۆ هـون ل برریـارا خـوە نـەهێن خـوارێ. کـارێ خـوە، هـەر تـشتێ

هەبت، داوی بکن. چ تشتێن نەمومکین نینە، تەنێ مانديبوونا هەوە یە کۆ کاران نەمومکین دکت.

هیڤی دکم هەوە هەمیان باوەری، ئوو باوەریەکا تڤاڤ، ب وی کاری هەبت کۆ هون دکن. ژبەرکۆ هەر کارەك مومکینە. ئەگەر هەوە باوەری ب خوە هەبت ئوو هزرێن هەوە ئەرینی بن، چ تشتەکێ نەمومکین نینە. دەلیڤەیان دۆرا هەوە گرتی یە ئوو ل سەر هەوە دمینت کۆ تشتێن مومکین ڤەببینن ئوو ژبۆ سەرکەڤتنا خوە وان بجه بکن. جیهان دەری یێن خوە ل بەر وان کەسان ڤەدکت کۆ ب ئاوایەکێ ئەرینی کار دکن، باوەرمەندن، باوەری ب خوە هەیە ئوو ب هێز ئوو شیانێن خوە ڤەبێن ژیانێ دخوازن. کەشە "شوولێر" دبێژت: هەر تشتێ مە ئەڤرۆ هەیە، مە ئەو دەمەکێ نەمومکین دیتنە. ئەگەر ئەو باوەری هەر وەکی خوە بمابان، مە ئەڤرۆ نە پەنیسلین، نە فررۆکە ئوو نە گەلەك تشتێن دی، یێن کۆ ئەڤرۆ گەلەك ئاسایی ئوو ئەدەتی نە، نەدبوون.

تشتێن نەمومکین بوون تشتێن مومکین، ژبەرکۆ هندەك کەسان باوەری ب هزر ئوو رامانێن خوە هەبوو. ئەڤ ئەو کەسن یێن کۆ دیرۆکا جیهانێ دگوهێررن. لی مرۆڤێن نەیینی ئوو هزرکورت ئوو کەسێن کۆ ب ساناهی خوە ددن دەستێ رەوشان، چ جاران چ سەرکەڤتنان ب چاڤێن خوە نابینن ئوو هەمی دەرێن ژیانێ ل بەرانبەری وان گرتی نە. کەسێن وەها هەر چندە خودانێن شیانێن وەسانە کۆ بشێن چالاکیان بکن، لێ ب سادەیی ئوو ب ئاوایەکێ دەستپێکانی ژیانێ دەرباز دکن. چ ئێشەك ژ ڤێ گرانتر ئوو کوژەکتر نینە کۆ کەسەکی شیانا هندێ هەبت ببت سازژەنەکێ ژێهاتی ئوو ڤێ ئێکێ نەزانت ئوو ل کوژیەکی بروونت ئوو زێمارێ بکت کۆ چما نکارت ببت وینەکێشەك.

هون دبێ بزانن کۆ روونشتنا ل کوژیەکی ئوو خوە کێم ئوو بێشییان دیتن خیانەتەك ل ئافرینەرێ مرۆڤانە. ئەز باوەرم کۆ هەر کەسەك ب شیانەکا ئەجێب هاتیە سەر دنیایێ، ئوو ژبۆ هندێ هاتی یە ئافراندن دا وان شیانان ژی بگەهینت کۆپیتکان. بکارنەئینانا وان شیانان نە هەما زیانێ ل وی کەسی ددت، جڤاکێ ژی تووشی زیانێ دکت. خوە کێم مەبینن! هەلبەت خوە زێدەتر دیتن ژ تشتێ هەیی ژی پرسگرێکەکا مەزنە، لێ چ تشتەك ژ خوە‌کێم‌دیتنێ نەنگینتر ئوو فهێتتر نینە.

رەنگە هندەك كەس هەبن كۆ، ژبۆ مینـاك، د ریازیـات ئـانكۆ ماتـەماتیكیێ دا گەلـەك بـاوەری ب خـوە نـەبت. هنـدەك كـەس ژ وەرزشـێ حـەز نـاكن ئـوو هنـدەك كـەس ژی ژ ئاخفتنا ل بەرانبەری كۆمەكا خەلكی دبەهجن. لێ دیسا ژی هندەك ژ هەوە دخوازن كۆ بـبن سیاسـەتڤان، وینـەكێش، زانـستڤان ئـان، وەكـی مـن، دامەزرینـەرێ دامەزرییایـەكا پیشەسازی. تشتێ كۆ ئەز وەكی پیـشەكارەكێ پێـشەنگ دخـوازم ببێـژم ئـەوە كـۆ گـرنگ نینە كا پیشە یا هەوە یا پاشـەرۆژێ دێ چ بـت ئـوو هـون دخـوازن بـبن چ، گـرنگ ئـەوە هـەوە بـاوەری ب خـوە هـەبت ئـوو تـشتێ هـون ژێ حـەز دكـن د هنـاڤێن خـوە دا ئـوو د هوندرێ خوە دا بحەوینن. هنگی ئەگەر هون بخوازن دێ سەربكەڤن.

ژبیر مەكن هەر تشتێ مە ئەڤرۆ هەبت، رۆژەكێ نەمومكین بوویە.

# بخەبتن باشترین بن

ل دەما شەرریێ کۆرەییێ[1] ئەز ئوو مالباتا خوە ژ سیۆلێ رەڤین ئوو وەکی ئاوارە یێن شەرری ل "دائێگۆ"یێ ئاکنجی بوون. بەری هنگی بابێ من رەڤاند بوو ئوو بر بوو کۆرەیا باکور ئوو برا یێن من یێن مەزنتر ژی د ئارتەشی دا خزمەت دکر. لەوما، ل ژی یێ ١٤ سالییێ نەچار مام ژیارا مالباتا خوە ئەولە بکم. د ئالۆزی یێن دەما شەرری دا، ژبۆ کەسێن ل ژی یێ من چ کارەکێ وەسا نەبوو، لێ خوەشبەختانە ئێك ژ شاگردێن پێشتر یێن بابێ من ل رۆژنامەیەکێ کار دکر ئوو کارەکێ وەسا کر کۆ ئەز رۆژنامەیان بفرۆشم.

ب ئاوایەکێ ئەدەتی من رۆژنامە دبرن ل دکانێن سووکا قەرەبالغا "پانچۆنێ" ل "دائێگۆ"یێ دفرۆشتن. هەما پشتی وەرگرتنا رۆژنامەیان، بێ خوەگێرۆکرن بەر ب ئالی یێ سووکێ دبەزیم، ژبەرکۆ ئەگەر من خوە ل نیڤا رێییێ ب فرۆشتنا رۆژنامەیان ب چەند رێڤینگەکان ڤە مژوول کربا دا شانسێ فرۆشتنا رۆژنامەیان ل سووکا "پانچۆن"ێ ژبۆ رۆژنامەفرۆشێن دی ڤەهێلم. ژبەر وێ ئەز هەر رۆژ ئەو رۆژنامەفرۆشێ سڤك-پێ

---

(١) بەری شەرریێ جیهانی یێ دوییێ، ژاپۆنیان کۆرە داگیرکربوو. پشتی شکەستنا ژاپۆنیێ، هەڤالبەندان (ئەمەریکا ئوو سۆڤیەتێ) کۆرە دناڤبەرا خوە دا ڤەبەشی. بزاڤێن ئێککگرتنا وان، ژبەر بەرژەوەندی یێن هێزێن جیهانی بێ ئەنجام مان. ل سالا ١٩٤٨ێ کۆمارا کۆرەییێ (باشوور) ئوو کۆمارا دەمۆکراتیکا کۆرەییێ (باکور) دامەزریان. سالەکێ پاشتر شەرێ فەرمی دەست پێ بوو. ل سالێن ١٩٥٠ێ هەتا ١٩٥٣ێ ب پشکداری یا سۆڤیەتێ ئوو چینێ کۆ پشتەڤانی یا کۆرەیا باکور دکر، ل ئالیەکی ئوو ئەمەریکاییێ، بریتانیاییێ، ئوستڕالیاییێ، کەنەداییێ ئوو نرکییێ کۆ پشتەڤانی یا کۆرەیا باشوور دکر، ل ئالی یێ دی شەررەکێ گران بەردەوام بوو ئوو ب ملیۆنان خەلکێ بێگونەه ئوو ئارتەشی هاتن کوشتن. ئاگربەسەك ژ وێ دەمێ وەرە ل کارە، لێ هێشتا ئاشتیەکا فەرمی نینە.

بووم كۆ پێشى هەمى رۆژنامەفرۆشێن دى ل سووكێ بووم. لێ ديسا ژى ئەز نەدشيام هەمى بازارى (= موعاملەيێ) بكم يێ خوه، ژبەركۆ هەما ل سەرێ سووكێ دەما من دەست ب فرۆشتنا رۆژنامەيان دكر، گەلەك ژ وەختێ من ب هندێ ڤە خسار دبوو كۆ بەرمايى يا پارەيێ دكانداران بدم وان ئوو د وان گاڤێن گرانبها دا، رۆژنامەفرۆشێن دى ژى دگەهشتن، ئوو ب پێش من دكەڤتن ئوو ب لەزگينى بەرمايى يا بازارى ژ من دستاند.

دا بشێم مالباتا خوه تێر بكم، دبێ من رۆژانە ب كێمانى سەد رۆژنامە بفروشتبان. دايكان من ئوو دو برايێن من يێن بچووك ب ئالۆزى ڤە ل مالێ ل بەندا من دبوون. من هندەك رێ يێن نوو ڤەديتن دا بشێم زێدەتر رۆژنامەيان بفرۆشم. من هەررۆژ پارەيەكێ هوورێ زێدە دگەل خوه دبر ئوو بەرمايى يا پارەيێ خەلكى د ناڤ رۆژنامەيێ دادنا ئوو ب لەزڤە رۆژنامە دهاڤێتن ناڤ دكانان ئوو پارەيێ وان ژى ژ دەستێن دكانداران درەڤاند ئوو ب لەز بەر ب دكانا دى دچووم. ب ڤى ئاوايى ئەز شيام زێدەتر ژ دو سێيەكێن (دو سێكى يا) بازارى بكم يا خوه. لێ هێشتا رۆژنامەفرۆشێن دى ژى دگەهشتن من.

دبيا بوو من تەكنيكا خوه بگوهاررتبا، ئوو من ئەڤ كار ژى كر. ڤێ جارێ، دەما ئەز دگەهشتم سووكێ من ب لەز رۆژنامە دهاڤێژتن ناڤ هەر دكانەكێ ئوو پاشى ل ڤەگەرريانێ ب هەمدا خوه من پارەيێ وان ژ دكانداران وەردگرت. ب ڤى ئاوايى چ رۆژنامەفرۆشەك نەدگەهشت من. هەلبەت هەميان د رۆژێ دا پارە نەددا، لێ ئەز دشيام هەمى رۆژنامەيان بفرۆشم ئوو پشتى چەند رۆژەكان هەمى پارەيێ خوه وەربگرم. پشتى دو هەيڤان هەمى رۆژنامەفرۆشێن دى ب گشتى واز ژ فرۆشتنا رۆژنامەيان ل سووكێ ئينا ئوو هەمى بازار (= موعاملە) كەڤت دەستێن من.

ب نهێررينا من، پشتى وێ سەربهورێ ئەز فێربووم كۆ هەمى جاران دكارم ب خوه-وەستاندنەكا زێدە ب سەر هەمى ئاريشەيان دا سەربكەڤم. ژ دەستپێكا چەلەنگى يێن كاروەرى يێن خوه، ئەز گەلەك خەبتيمە كۆ باشترين بم. هەلبەت چ جاران ئەز ب درستى رازى نەبوومە، لێ دكارم ببێژم كۆ ب هەر ئاوايەكى بت من هندەك سەركەڤتن هەبوونە كۆ دكارم شەهنازيێ پێ بكم.

کەسێن کۆ دخوازن ژ باشترینان بن، دبێ هەرگاڤ هەمی شیانێن خوە ژبۆ گەهشتنا ب ئارمانجان بکاربئینن. ئەگەر هون هەمی شیانێن خوە بدن کاری، بەرهۆزە کۆ هەمی جاران باشترین نەبن ژی، لێ بێگومان، دێ تەنێ پێنگاڤەکێ ژ باشترینان دوور بن. ژ ئالیەکێ دی، ئەگەر هون هزر بکن کۆ هون نەشێن کارەکی بکن ئوو شیانا خوە-باشترکرنێ د خوە دا نابینن، هنگی بزانن کۆ د چ کارەکی دا سەرناکەڤن. ئەز دزانم کۆ کارێن هون دکن گرنگن، لێ ژ وێ ژی گرنگتر ئەوە کا هون چاوا ل کارێ خوە دنهێررن. دبێ هون وەسا ل کارێ خوە بنهێررن کۆ هەر تشتێ هون دەست پێ بکن دێ بگەهینن بلندترین ئاستێ. ئەگەر هون بخوازن ببن سیاسەتڤان ئان کاروەر ئان نیگارکێش ئان لێڤەکۆل ئان هەر تشتەکێ دی، بزاڤێ بکن د کارێ خوە دا بلندترین کەس بن. کەسەك نەبن کۆ تەنێ ژبۆ هلانینا بارێ ل سەر ملێن خوە کاری دکت. ژ باشترینان بن ئوو ب هەمی شیانێن خوە د راستا ئارمانجێن خوە دا بخەبتن. هندی هون خوە ماندی بکن، شانسێ سەرکەڤتنێ دێ زێدەتر ببت. ئەز وەسا باوەرم کۆ کەسێن د کارێ خوە دا دبن بلندترین کەس، خودانێن ئارمانجێن بلندن ئوو زێدەتری هەر کەسەکی ژی خوە ژ بۆ وان ئارمانجان ماندی دکن. بزاڤێن دودلانە چ جاران چ کەسەکی ناگەهینن پەیپسکێن بلند.

چەند سالان بەری نها، دگەل ئێك ژ ئەندامێن تیپا مەجارستانێ کۆ د کێبرکێ یێن ئەورووپایێ دا بسەرکەڤت بوون هەڤپەیڤینەك هات کرن. ئێك ژ رۆژنامەڤانان نهینی ئانکۆ کلیلا سەرکەڤتنێ ژ وی لیستکڤانی پرسی. وی بەرسڤاند کۆ هندی بگەهەت ل تۆپێ ددت ئوو دەما ل تۆپێ نەدت دەرهەڤا تۆپانێ دئاخڤت ئوو دەما ل سەر تۆپانێ نەئاخڤت ژی ل سەر وێ دهزرت.

ب ڤی ئاوایی هون دبینن کۆ لیستکڤانەکێ بەرچاڤ یێ تۆپانێ، لیستکڤانەکێ زگماك نیە، وی خوە ماندی کری یە. هەر کەس دکارت ببت باشترین، کەسێن کۆ خوە ب تڤاڤی ژبۆ ئارمانجێن خوە تەرخانکری یە. چ موعجیز ژی نیە. گەلەك کەس بەهسا پیشکەڤتنا ئەجێبا "دێوو"یێ دکن، لێ سەرکەڤتنا "دێوو"یێ ژبۆ مە چ ئەجێب نییە. ئەم تەنێ گەلەك خەبتینە ئوو مە خوە گەلەك ماندی کری یە دا د کارێ خوە دا باشترین بین.

هەمی بزاڤا من ئەو بوویە کۆ "دێوو"یێ بگەهینم بلندترین ئاستی ئوو من هەمی گاڤان پێکۆل کری یە ئوو دێ بکم ژی کۆ کارمەندێن شەریکەیێ ب رێ یا باشترین سەرکەڤتنان بگەهن بلندترین ئاستێ کاری یێ مومکین. ئەز چ جاران ژ سەرکەڤتنێن نها یێن خوە رازی نەبوومە ئوو چ جاران ژی ژ بزاڤ ئوو خەباتا ژبۆ گەهشتنا ب ئارمانجێن بلندتر ماندی نەبوومە. ئەز پێ حەسیامە کۆ خوەماندیکرن د هەر کارەکی دا رێ یا ئێکانە یا رەڤین ئوو خوەقورتالکرنا ژ مخابنی ئوو خوەزی ئوو ئەگەر ئوو مەگەرێن پاشەرۆژێ یە.

ژبەر وێ، هیڤیدارم کۆ هون جوانێن وەلاتی بزاڤێ بکن د هەر کارەکی دا کۆ هون پێڤە مژوول دبن بگەهن بلندترین ئاستان. هەما د هزرا خوە دا ژی نەبهورینن کۆ دێ کەسەکێ دی ل سەرێ سەری بت.

گۆتنا "بەلێ ئەزبەنی"یێ تشتەکێ گەلەك نەخوەش ئوو کارەکێ گەلەك کێم ئوو نەڤی یە. چ جاران ب پلە یا دوییێ رازی مەبن ئوو مەفکرن کۆ سەرێ سەری ژبۆ هەوە نیە ئان ژ هەوە زێدە یە. برریارێ بدن کۆ کورسی یا هەری ژۆرین ب ماف ئوو هەقی یا هەوە بت ئوو دێ ببت یا هەوە. ئەگەر هون باشترین ئوو زێدەترین بزاڤێ ژبۆ گەهشتنا ب ئارمانجێن خوە بکن، ل دووماهییێ دێ خەلاتەکێ باش وەربگرن.

**بەهرا چارێ**

# جیهان یا هەوە یە

ل سالا ١٩٧٦ێ، جارا ئێكێ پشتی وەرگرتنا "شەریكەیا ماكینەسازی یا كۆرەیێ"، ئەز ب گرنگی یا بێڤاما وەرار ئوو پێشداچوونا تەكنۆلۆجییێ حەسیام ئوو ژبەر وێ كۆ من پێشكەڤتنا تەكنۆلۆجیك ب هۆكارا سەرەكی یا سەركەڤتنا "شەریكەیا دێوویێ" دزانی، من برریار دا كۆ هندەك ژ كارمەندێن ڤێ شەریكەیێ ژبۆ فێربوونا تەكنیكان بەرب شەریكەیا "مان" یا ئەلمانی بهنێرم. وی چاخی "دێوو"یێ دگەل شەریكەیا "مان"ێ رێككەڤتنەكا هاریكارییێ ئیمزا كربوو. من ژ ناڤ سەرۆك ئوو جێگرێن یەكینێن (= وەحدەیێن) شەریكەیێ كۆ هەمی ژی دەرچوو یێن ئەندازیارییێ بوون دازدەه كەس ژبۆ فێربوونا ل دەرڤەیی وەلاتی هلبژارتن.

هندەك كەس ژ ڤێ بەرنامە یا من نەرازی بوون، نەمازە بەرپرسێن پشكا بەرهەمئینانێ. ئەوان هەست دكر كۆ ژدەستدانا ١٢ ئەندازیارێن مژوولێ كاری د جهێن كلیلی یێن شەریكەیێ دا دێ كارەكێ نەیینی ل بەرهمئینانێ بكت. هەلبەت ئەو ئالۆزێن شەریكەیێ بوون، لێ ئەز باوەربووم كۆ وێ بەرنامەیێ دێ خزمەتا بەرژەوەندی یێن درێژدەمێن شەریكەیێ كربا. من ل فەراتی ئوو حەوجەداری یێن وێ گاڤێ یێن شەریكەیێ تەماشە نەدكر. من هەست دكر بێ تەكنۆلۆجی یا بلندتر ئەم نەدشیان شەریكەیێ بێئێخین سەركەرخا پێشكەڤتنێ. ل دوومـاهیێ، من بەرپرسێن پشكا بەرهەمئینانێ رازی كرن كۆ كێماسی یێن بەركورت ژبۆ سەرمایەدانان ئوو پێشكەڤتنێن درێژدەمێن شەریكەیێ بپەژرینن.

سالەكێ پشتی ڤەگەرریانا ئەندازیاران ژ ئەلمانیایێ، كارمەندێن پشكا بەرهەمئینانێ پێ حەسیان كۆ برریارا من د جهێ خوە دا بوویە. ژبەركۆ زانست ئوو سەربهورا

تەکنیکی یا کۆ وان ئەندازیاران د هەیاما سالەکێ دا کۆم کربوو، ستاندەر ئێوو ئاستا تەکنیکی یا شەریکەیێ پێنج سالان بەرزتر کربوو.

هەر وەکی من بەری نها ژی ئیشارەت پێکر، هون دێ نڤشێ ئێکێ یێ کۆرەیایێ بن کۆ ژ نەتەوەیێن پێشکەڤتی دهێن حەسباندن. پێشکەڤتنەکا کۆ ژبەر خوەگۆریکرنا کەسێن وەکی من بدەستڤە هاتی یە. مە دخوەست کۆ نەتەوە یا کۆرەیێ وەکی نەتەوەیەکا پێشکەڤتی ئێوو نە وەکی نەتەوەیەکا بەرب پێشکەڤتنێ بدین دەستێ هەوە جوانان. ژبەر وێ، هون حەوجەدارن کۆ نهێررینا خوە بەرفرەه بکن ئێوو هەر د وێ دەمێ دا ژی، دبێ خودانێن وان بهایان بن کۆ هەژی یێ پلە ئێوو بەرپرسیاری یا نێوو یا هەوە د جیهانێ دا بن.

د پێنگاڤا ئێکێ دا دبێ هون دووربین بن. هندەك کەس تەنێ هزرێ ل دەمێن چوویی دکن ئێوو هەمی ئاخڤتنێن خوە هۆسا دەست پێ دکن: "جاران ئەز هۆسا بووم، هۆسا بووم..." ئەڤ جۆرە یێن کەسان ب دوهی یا خوە کۆرە بوونە ئێوو ب چ ئاوایەکی نکارن سبەهی ببینن. لێ خوە زێدە مژوولکرنا ب هزر ئێوو خەیالێن ڤێ گاڤێ ژی ئاریشەیان دئافرینت.

بلا ژبۆ هەوە بەهسا چەند مەتەلەکێن کۆرەیی بکەم. "سەیەکێ زیندی ژ خودان-مەنسەبەکێ مری باشترە"، "زکێ تێر خوەزیکان ناهێلت". ئەڤ مەتەل، هەر چندە کەڤنن، لێ رەوشا ئیرۆ ژی روهن دکن ئێوو ب گشتی مژوولی یا هزری یا کۆرەییان ب بابەتێ واقعبینی ئێوو تەماشەکرنا ل ئەڤرۆ نیشاددن. دیل ئێوو گرتیێ دوهی بوون ئێوو داخوازکرنا رەهەتی ئێوو ئاسوودەیی یا ئەڤرۆ ناهێلت کۆ هون ئاسۆ یێن سبەهی ببینن.

ژبۆ ئاڤاکرنا جڤاکێ، هون حەوجەدارێن بها یێن وەسا نە کۆ سبەهی ئاڤا بکن. ئەو بها ئەڤن: خوەگۆریکرن ئێوو سەرمایەدانانا ئەڤرۆ ژبۆ گەهشتنا ب خوەشی ئێوو رەهەتی یێن سبەهی.

هون دبێ ل ئاسۆ یێن دوور بنهێررن. ژیان سەفەرەکا بەردرێژە. هونەرێ مفاوەرگرتنا ژ دەلیڤە یێن ئەڤرۆ ژبۆ ئاڤاکرنا سبەهی د خوە دا بپەروەرینن.

بەزینا ماراتۆنێ ٤٢,١٩٥ کیلۆمەترە. کەسێ کۆ ماراتۆنێ دبەزت دبێ ب نهێررینا ل هێلا داوی یا بەزینێ ل درێژاهی یا وان ٤٢ کیلۆمەتران بەزا خوە رێك بئێخت. هون ژی دبێ ژبۆ سبەهی یێن باشتر، ئەڤرۆ قوربانیان بدن. نهێررینێن بەرتەسك بهێلن ئێوو

ژبەر نەزانى ئوو بێئاگەهيێ بەرژەوەندى يێن درێژدەم گۆرى مفا يێن بەركورت مـەكن. ژيـان هـەمى رۆژەك نينـە. هـەمى جـاران بهـزرن كـۆ هـون دێ رێبـەر ئـوو قـەهرەمانێن سبەهى بن. ئەگەر هـون هۆسا نـەكن، دێ د لەيپـستنا ژيـانێ دا ل شـوونا دەورێ كەسـێ ئێكێ، دەورێ رەشووروتان بگێرن.

هەر وەسا شيرەتەكا دى ژبۆ هەوە جوانێن كۆ دێ وەكى نڤـشێ پێـشكەڤتى يـێ ئێكـێ يێ كۆرەيێ چاڤێن خوە ل جيهانێ ڤە بكـن هەيـە. راسـتە جيهـان گەلـەك مەزنـە، لـێ ل ڤان سالێن دووماهيێ وەكى كۆمەكێ ژ هەڤسى ئوو جيرانان لێ هاتى يە. نها ئەم دكارين د رۆژێ دا سـەفەرەكا ژاپـۆنێ بكـين ئـوو ڤەبگـەرين. تـشتەكێ كـۆ بـەرى ٥٠ سـالان هـەر مومكن نەبوو.

بەڤا د بنێ بيرێ دا چ تشتەكى ژ جيهانـا دەردۆرا خـوە نزانـت. هـون چـەند ب سـەر چيای بكەڤن دێ هند ديمەنەكێ بەرفرەهتر ببينن. ديتنا جيهانەكا مەزن، دێ نهێررينـا هەوە بەرفرەهتر بكت ئوو هەوە پێ بگەهينت، دێ هاريكارى يا هـەوە بكـت كـۆ ژ خـوە-رازيبوون ئوو بەرچاڤ-تەنگى ئوو هزرتەسكيێ ژ خوە دوور بكن.

هـەما ژ دەسـتپێكا كـارێ خـوە، سـووكێن جيهـانێ ل بەرچـاڤێن مـن بوونـە. لـێ، وێ دەمـــێ چ شـــەريكەيەكا كـــۆرەيێ پووتـــە ب ســـووكێن ناڤنەتـــەوەيى نـــەدكر. ئـــەڤ پووتەپێنەكرن د راستيێ دا د بەرژەوەندى يا مە دابوو، ژبـەر وێ كـۆ سـووكێن جيهـانى ل چاڤ يێن ناڤخوەيى بێ بنن. هـەر ژبـەر وێ، مـن كۆسـپە يـێن ل سـەر رێ يـا سـووكێن جيهانى هلگرتن ئوو گەهشتم سووكێن بێبن ئوو شيام "دێوو"يێ پێش بئێخم.

هەر ژ دەستپێكێ مە ئەو كەس دپێشدا دامەزراندنە كۆ حـەزا قـەبخوازيێ هەبوويـە دا جيهانەكا نوو ئاڤا بكن، ئوو چ جاران خوە ژ سـووكێن جيهـانى بێئاگـەه نـەدكر. ئـەڤ رەنگڤەدانەكا روويێ درست يێ شەريكەيا "دێوو"يێ يە.

هون جوان، قەهرەمانێن جيهانێ نـە. ژبـەر وێ دەمـا كـۆ هـون وەكـى نڤـشێ كۆرەيـا پێـشكەڤتى ب پێنگـاڤێن مـوكم هونـدرى قـادا جيهـانێ دبـن، ژ هـەوە دخـوازم كـۆ ب نهێررينەكا بەرفرەه ل جيهانا بەر ب روويێ خوە تەماشە بكن. ب ڤێ نهێررينێ بـەر ب پاشەرۆژێ بلەزينن ئوو بمەشن. خوە د دەمێن چوويى ئوو نها دا نقووم مەكن ئوو خـوە د توخيبێن جهناسكى (= جۆگراڤى) يـێن وەلاتـێ خـوە دا زينـدانى مـەكن. پاشـەرۆژ ئـوو جيهانا پاشەرۆژێ يێن هەوە نە.

## بەهرا پێنجێ

# ئاڤرریەك ل زانستێن بنگەهین

کۆرەیا باشۆر هەما ببێژە ژ سەرووکانی یێن خوەرسکی بێبەهرە ئوو گەلێ وێ گەلەکێ بچووکە کۆ ئاخا وێ ل چاڤ هێشەتا وێ هێشتا بچووکترە ژی. ل بەرانبەری ڤێ نەدارییێ، ئەم ژ ئالیەکێ دی ڤە گەلەك زەنگینین ئوو ڤێ زەنگینییێ هێز دایە مە کۆ خوە بگەهینین ئاستا وەلاتێن پێشکەڤتی. ئەڤ سەرمایە هێزەکا کاری یە کۆ گەلەك باش ئوو خویندا یە. ئەڤ هێزا کاری ئامادە یە ب هەمی جۆرەیەکی خوەگۆری وەلاتێ خوە بکت.

ژ بەرەکەتا ڤێ هێزا کاری ئەم شیانە شیانێن تەکنۆلۆجیکێن خوە هەتا بلندترین ئاستێن جیهانی بلند بکین. ئەم نەتەوە یا ئێکانە نە کۆ گەلەك جاران ل پەی ئێك د کێبرکێ یێن پیشەیی ئوو پیشەسازی ئوو خولێن فێرکرنێ یێن ناڤنەتەوەیی دا مەدالیا ئوو خەلات وەرگرتنە. ژبەر تەکنۆلۆجیا یا پیشەسازی یێن بەرهەمئینانێ ئوو بسەرئێکڤەنانێ (= مۆنتاژی)، بەرهەمێن کۆ ئەم دەرڤەدهنێرین رکەبەرێی دگەل بەرهەمێن وەلاتێن پێشکەڤتی دکن.

لێ هەبوونا پیشەسازی یا بەرهەمئینانێ تەنێ تێرا مە ناکت. تەکنۆلۆجیا یا بەرهەمئینانا ئەڤرۆ ب نووخوازی ئوو ئافراندنێ ڤە گرێدایی یە. دەما بەهسا نووخوازی ئوو ئافراندنێ دهێت کرن، وەلاتێ مە تشتەکێ مەزن نینە. ژبەر وێ کۆ هەتا نها مە تەنێ پووتە ب تەکنۆلۆجیا یا زانستێن کریارکی کری یە ئوو هەمی گاڤان مە بزاڤ کری یە کۆ بەرهەمێن وەکی بەرهەمێن بیانی چێ بکین ئوو رەوانەیێ سووکێن جیهانی بکین. ژبەر وێ مە سەرمایەدانانا د زانستێن بنگەهین دا پشتگوهڤە هاڤێتی یە. د راستیێ دا، ئەم بێ زانستێن بنگەهینین. ئەگەر ئەم لێکۆلینێن د وارێ

زانستێن بنگەهین دا چەلەنگ نەکین، ئەم تەنێ دێ بشێن زاری بەرهەمێن دی ڤە بکین. ژبەر وێ، دبێ ئەم گەلەك پووتەی ب زانستێن بنگەهین بکین ئوو سەرمایەدانانا د ڤی واری دا دەست پێ بکین، هەتا بکارین ل جیهانا ئەڤرۆ ل شوونا هندێ کۆ زارڤەکەر ئوو دووڤەلانکێن خەلکێ دی بین، ئافرینەرێن تەکنۆلۆجیایێ بین. سرێما نها ئەوە کۆ وەلاتێن بێ تەکنۆلۆجیا هندێ دی ژ وەلاتێن پێشکەڤتی پاشڤەدمینن.

ئەگەر هون د خانیەکی دا بژین کۆ بناغەیەکێ پەیت نەبت، هون هەر د ترس ئوو نەتەناهیێ دا دژین. چاوا خانیەکێ بێ بناغە خانیەکێ بێ دەوامە، وەسا ژی نابت هون بێ زانستێن بنگەهین چاڤەرێ یێن پێشکەڤتنا پیشەسازی ئوو تەکنۆلۆجیایێ بن. ئەگەر برریارە دارەك بەری بدت، دبێ رهێن ستوور هەبن. ئاڤاهی ژی چەند بلندتر بت، دبێ بناغەیێ وی هند موکمتر بت.

ژبەر وێ، دەم هاتی یە کۆ ئەڤ وەلات ژ قۆناخا زارڤەکرنێ ئوو وەرگرتنا تەکنۆلۆجیا یا بیانی دەربچت ئوو پیشەسازی ئوو تەکنۆلۆجیا یا خوە گەش بکت. شەریکەیا "دێوو"یێ هەتا نها گەلەك ژ دەرچوویێن وارێن زانستی ژبۆ بەردەوامبوونا ل سەر خویندنێ هنارتنە دەرڤەیی وەلاتی. ل سەرێ سالا ٢٠٠٠ێ، دێ نێزیکی هزار کارمەندێن مە باوەرنامەیێن دکتۆرا یا زانستی هەبن.

"بنگەهێ دێوویێ ژبۆ لێکۆلینێن زانستێن بنگەهین" هاریکاری یێن تایبەت پێشکەش دکت ئوو ڤەرێژین وان لێکۆلینان د کۆڤارێن زانستی یێن "دێوو"یێ دا بەلاڤ دبن. مە باوەری هەیە کۆ زانستێن بنگەهین شەنگست ئوو بناغەیێ بازاریێ نە. لەوما، ئەم سیاسەتەکا هۆسا ب رێڤەدبین. ل کۆرەیێ مە چ سەرمایە ژ هێزا کارێ بەرکەڤتی ئوو خویندا گرانبهاتر نینە. ژبەر وێ، ئەگەر ئەم بخوازین هەڤرکی یا وەلاتێن پێشکەڤتی بکین، دبێ جوانێن مە زێدەتر ژ یێن دی فێری زانستی ببن ئوو خوە ماندی بکن. ئەز ب باوەری ڤە، هیڤیدارم کۆ گەلەك ژ هەوە جوانان ل بیاڤێن زانستێن بنگەهین یێن کۆ هون ژێ حەز دکن ئوو ل گۆرەیی شیانێن خوە بخوینن.

هەلبەت زانستێن نوو ئوو پێشکەڤتی گرنگن. لێ بناغەیێ هەمی زانست ئوو پێشکەڤتنان زانستێن بنگەهینن. بێ زانستێن بنگەهین، زانستێن دی نکارن وەسا پێش بکەڤن.

بلا ژ ئالی یێ بوویەرێن رۆژانە ڤە ل زانستێن بنگەهین تەماشە بکین. کۆرەیا باشور ئێك ژ وان وەلاتانە کۆ مەزاختنا سەرانە یا ڤەخوارنێن جۆر-ب-جۆرێن وێ ژ هەمی وەلاتان زێدەترە. نها پرسیارەکێ ژ هەوە دپرسم: چەند کەس ژ هەوە تشتەکی ل سەر پەیدابوون ئوو دیرۆکا جۆرەیێن ڤەخوارنان دزانن.

ب سەر هندێ را کۆ ئەم هند ڤەخوارنان ڤەدخوەرین، هێشتا ئەم نەشیانە ڤەخوارنەکێ چێ بکین کۆ ل جیهانێ ناڤدار ببت، ژبەر وێ کۆ ئەم بنەما یێن دەستپێکی نزانین.

ئەڤ نە تەنێ ل سەر پیشەسازی یا ڤەخوارنان راستە، لێ ژبۆ بەرهەمێن دی یێن کۆ ئەم دکررین ژی راستە: ژبۆ پاتەیان (= قوماشان)، ماکینەیان، ئامیرێن ئەلکترۆنیکی ئوو ئالاڤێن هاتنووچوونێ. ژبەر وێ ئەم تەنێ زاری تەکنۆلۆجیا یا وەلاتێن پێشکەڤتی ڤە دکین. ب سەر ڤێ را ژی، هندەك ژ دامەزرییایی یێن ناڤخوەیی ل سەر شیانێن خوە یێن پیشەسازی ریکلامان دکن ئوو هندەك ژی ب رێ یا نیگارێن کۆمپیۆتەری شیانێن خوە یێن تەکنۆلۆجیك ب ئاوایەکێ گەلەك دوور ژ راستیێ بەرز نیشا خەلکی ددن. لێ د راستیێ دا، تشتەکێ هند گرنگ ل پشت ڤان ریکلامان نینە. مۆدە یێن بێ بناغە زوو دەرباز دبن. هەر چندە کۆ هەمی تشت د گوهاررتن ئوو نووبوونێ دانە، تشتێ کۆ ناهێت گوهاررتن بنەما یێن نەگوهێرێن ژیانێ نە. هەر ب وی ئاوایی ژی، زانستێن بنگەهین بناغەیێ زانستی نە ئوو چ جاران ئەڤ ناهێت گوهاررتن. بەری کۆ هون جوان ل پەی مۆدە یێن بێدەوام بچن ئوو ژبۆ چەند بیستکەکان بژین، هیڤیدارم پووتەی ب بنەما یێن ژیانێ بکن.

ل چاخەکی کۆ بنەما یێن بنگەهین ئوو بناغەیی زێدەتر ژ هەر وەختەکێ دی ژ ئالی یێ جڤاکێ ڤە دهێن پشتگوهڤە هاڤێتن، پووتەپێکرنا ب وان ژ هەر وەختەکێ دی زێدەتر ژبۆ جڤاکێ مفادارە. جڤاکا ئەڤرۆ یا کۆرەیێ ئالۆز، بێ تەبات، نەمسۆگەر ئوو بێ ستاندەرە ئوو دکارم ببێژم کۆ ب ساناهی دێ بگەهی هەمی تشتان.

هندەك جاران هزر دكم كۆ بنەما يێن سەرەكی يێن ژيانێ ژبۆ نڤشێ نها تشتێن ژبيرچوويی ئوو وندا نە. ئەگەر نڤشەكی چەمك ئوو تێگەهێن درست نەبن ئوو ل دووڤ رێنومايی يێن درست نەچت، جڤاك دێ بێ تەبات ببت. بێ پاراستنا بنەمايان، بناغە يێن جڤاكێ دێ ڤەبلەرزن. هەر ب وی رەنگی ژی، ئەگەر كت-كتا كەسێن ناڤ جڤاكێ ژی بنگەهێ ژيانێ ئوو تێگەها راستين يا ژيانێ نەفامن (= فەهم نەكن)، ژيانا وان دێ وەكی نەخشێن سەر نەينك ئوو خوەديكێن كۆ تشتان جوان نيشا ددن بێ بنەما بت. لەوما پێدڤی يە ئەم بنەما ئوو بها يێن راستين يێن ژيانێ ڤەببينين. ئەم دبێ وان تێگەهێن كۆ رێ يێن درست ئوو شاش نيشا مە ددن ڤەببينين. ئەم دبێ هايدارێن بها يێن ژيانێ بين ئوو وەكی مرۆڤێن راست بژين.

چما كتێبا "تشتێ كۆ ژبۆ ژيانێ پێدڤی بوون ل زارۆكبەخچەيێ (= باخچەيێ زارۆان) فێر بووم" كتێبەك بوو كۆ زێدەتر ژ هەمی كتێبان هات فرۆشتن. رۆبێرت فولهۆمی[1] ئەو كتێب نڤيسی يە ئوو د كتێبا خوە دا ئيشارەتێ ب بنەما يێن ژيانێ دكت، بنەما يێن كۆ مرۆڤ ل زارۆكبەخچەيێ فێر دبت، نە پشتی وەرگرتنا باوەرنامە يێن زانينگەهان. ئەڤ كتێب رێ ئوو رێبازا خوەرسكی ئوو سادە يا ژيانێ ب ئاوايەكێ گەلەك كێرهاتی دوەسفينت. ب ڤی ئاوايی، مرۆڤ پێ دحەست كا چ بنەما هندا كرنە ئوو دبێ ل چ بنەمايەكی بگەرت. هەياما جوانی ئوو لاوينیێ قۆناغا فێربوونا بنەما يێن ژيانێ يە. ئەگەر هون وان ب درستی فێربن، دێ ژيانەكا پر خوەشی ببن سەری ئوو دووماهی يا ژيانا هەوە ژی هەر دێ خوەشی بت. لێ ئەگەر هون وان بنەمايان پشتگوهڤە بهاڤێژن ئوو ژيانا خوە ل سەر بنگەهێ خوەشی يێن دەمكورت ئاڤا بكن وەكی هندێ يە كۆ خانيێ خوە ل سەر بەفرێ ئاڤا بكن.

---

(١) رۆبێرت فولهۆم (Robert Fulghum) نڤيسڤان، كەشە، مووسيقيڤانەكێ ئەمەريكايی يە كۆ ل سالا ١٩٣٧ێ هاتی يە دنيايێ. ئەو كەشەيێ دێرەكا فەلەيانە كۆ باوەری يا وان ب سێكانی يا فەلەيان (باب، پس (=كورر) ئوو روحێ پيرۆز) نينە ئوو دبێژن خودێ ئێكە ئوو عيسا پێغەمبەرێ وی يە. رۆبێرت ب كتێبا "تشتێ كۆ ژبۆ ژيانێ پێدڤی بوون ل زارۆكبەخچەيێ فێربووم" (All I Really Need to Know I Learned in Kindergarten) ناڤدار بوو. ئەو كتێب ل سالا ١٩٨٦ێ چاپ بوو ئوو دو سالان ل ئەمەريكايێ پرفرۆشتنترين كتبا سالێ بوو.

**بەهرا شەشێ**

# پارە چ تشتەکی ناکت

مرۆڤەکێ زانا دزانت کا چاوا پارە ئوو دەما خوە ژیرانە بکاربئینت. لەوما، ژبیر مەکن کۆ نابت هەما پچەکا پارە ئان دەما خوە ژی زرر بکن. هەر ژ دەستپێکا لاوینی ئوو جوانییێ، ب ئاوایەکێ درست سەرەدەرییێ دگەل پارەی بکن. هەلبەت پارە ب تەنێ نە باشە نە خراب. چاوایی یا بکارئینانا پارەیی ڤێ دیار دکت.

پارە دبێ ل وی جهی بهێت مەزاختن کۆ هەژی یە، هەتا فاییدە یا وی دیار ببت، ئانکۆ ژبۆ هەوە ئوو ژبۆ خەلکێ دی مفادار ببت. مەزاختنا دراڤی ژبۆ فێربوونا زانستی، چارەسەرا نەساخیان ئان ڤەتاندنا حەوجەداری یێن کەسێن حەوجەدار، ژیرانە یە. درست نینە کۆ ل دەراڤێن وەسا هون خوە رەزیل بکن. تەنێ ژ خوە پرسیار بکن کا دراڤێ دهێت مەزاختن ژبۆ هەوە ئوو کەسێن دی مفادارە ئان نە.

ژبەر وێ، دینارەکێ تەنێ ژی ژ دراڤێ خوە زرر مەکن. دراڤی ب بەترانی مەمەزێخن. تشتێ کۆ نەپێدڤی بت چ جاران نەکررن. هندەك كەس هندەك تشتان ژبەر ئەرزانی یا وان دکررن، نە ژبەر پێدڤیتی یا وان. ئان ژی بێ هندێ کۆ گوهێ خوە بدن گرانی یا وی تشتی، هەما ژبەر چاڤلێکرنێ دکررن. ئەڤ کارێ ئەحمەقانە.

دەما مە "شەریکە یا ماکینەسازی یا کۆرەیێ" وەرگرت، من ژبۆ بلندکرنا ئاستێ دلسۆزی یا کارمەندان ئوو زێدەترکرنا هەڤالینیێ ئوو نێزیکیێ، برریاردا کۆ ئیمکانێن ژینفرەهی (= ریفاهیەتێ) ژبۆ وان دەستەبەر بکم.

ل سالا ١٩٧٦ێ، بەرنامە یێن ژینفرەهی یا کارمەندان ل کۆرەیێ تشتەکێ بەرنیاس نەبوو. لێ ل وێ دەمێ من هەست دکر کۆ گاڤا وێ هاتی یە ئەم زێدەتر پووتەی پێ بکین. ژبەر وێ من فرمان دا کۆ گەرماڤ (= حەمام)، سەرتراشخانە، جهێ نڤستنێ ژبۆ زگوردیان ئوو خوارنگەهـ بهێن چێکرن.

سەرۆكێن پشكان ل سەر ڤێ نەرازی بوون. ژبەر وێ كو بهایێ وان پرۆژەیان دگەهشت چەند ملیۆن دۆلاران كۆ بۆ وێ دەمێ پارەیەكێ ستوور بوو.

ئەز د ئاخفتنا سەرۆكێن پشكان دگەهشتم، ژبەر وێ كو هەمی سەرمایە یا شەریكەیێ تەنێ دوڤاتی دراڤێ ئاڤاكرنا وان بوو. وان دگۆت كۆ ئەگەر ئەو دراڤ ل پرۆژە یێن وەسا هاتبا مەزاختن كو ب ئاوایەكێ راستووراست بەرهەمێ شەریكەیێ زێدەتر كربا دا باشتر بت. ب سەر هندێ را، دراڤنامەیا (= بوودجەیا) شەریكەیێ ل وێ دەمێ ل كێمیێ ددا. سەرۆكێن پشكان هەست دكر كو دانەڤە یا قەران دبێ ل هەر پرۆژەیەكا دی پێشتر بت.

هەلبەت ئەز نەدشیام بێژم كۆ ئەو شاشن. لێ من چ دودلی ژی ل سەر پرۆژە یا خوە نەبوون. برریارا من ئەو بوو كۆ ئەو پارە دپێشدا ژبۆ كارمەندان بهێت مەزاختن. باوەری یا من ئەو بوو كو كارمەند دێ ب دلگەرمیەكا زێدەتر كاربكن، ئاستێ بەرهەمئینانێ دێ بلندتر ببت ئوو شەریكە ژی ب وی رەنگی دێ پێش بكەڤت. هنگی مە چ پارەیەكێ دانایی نەبوو، ئەو پارەیێ هەیی ژبۆ سەرمایەدانانا درێژدەم بوو. هەلبەت، وەسا نەبوو كۆ هەما ئەز چ پووتەیی ب پارەیێ كۆ دبێ بهاتبا مەزاختن نەكم. باوەری یا من ئەو بوو كۆ دبیا ئەو پارە ب درستی هاتبا مەزاختن ئوو چەندی یا وی گرنگ نەبوو. ئەز ب ئاوایێ ئەدەتی هۆسا كاردكم. ئەگەر تشتەك ژبۆ من بهادار بت، چ جاران خەما هژمار ئوو ئاماران ناخوەرم. هەلبەت ئەگەر بزانم پارە ب ئاوایەكێ نەژیرانە دهێت مەزاختن، هنگی ئەز ب راستی دبم مرۆڤەكێ رەزیل ئوو دەستمچاندی.

هەر هنگی مە هندەك ئامانە (= ئۆتۆبووس) هەبوون كو رۆژانە كارمەندێن شەریكەیێ ژ سیۆلا پایتەخت دئینان كارخانەیێ كۆ ل "ئێنچۆنێ" بوو. رێیەكا نێزیكی ٢٠ مایلان بوو. هەر ئامانەیەكێ دبێ رۆژانە ٥٠٠ وۆن، كو هنگی دكر دۆلارەكێ ئەمریكی، ژبۆ باجا بكارئینانا جادەیێ دابان. پشتی هندەك لێكۆلینان، ئەز پێ حەسیام كۆ ئەگەر ئامانە بەری بگەهن كارخانەیێ پچەكێ ژ جادە یا سەرەكی لابدن ئوو ژ جادەیەكا دی بەر ب كارخانەیێ بهێن، هەر جارێ دێ ٢٥ سەنت ژبۆ مە ڤەگەرریابان. هەر چندە ئەڤ پارە گەلەك كێم ئوو بێ بها ژی بوو، لێ من چ سەدەمەك نەددیت كو وی پارەیی زرر بكین.

بابەتێ هەژی یێ گۆتنێ ل ڤێدەرێ مـەزاختنا چـەند ملیـۆن دۆلاران ئـوو ئمبارکرنـا ٢٥ سەنتان نینە. تشتێ ژ هەمییێ گرنگتر ئـەوە کـۆ مـەزاختنا وان چـەند ملیـۆن دۆلاران ئوو ڤەهێلانا وان ٢٥ سەنتان هەر وەکی ئێك ژیرانە ئوو مەنتقی نە.

ئەز ب ئاوایێ ئەدەتی ژبۆ هەڤکارێن خوە دیاریان دکررم ئوو ژبۆ وێ ئاغلەب کـارێن هەررێی (= ئاخێ) ئوو کـارێن دەسـتکری هلدبـژێرم. گەلـەك جـاران، کەسـێن کـۆ تـشتان دفرۆشن ژبەر وێ کۆ ئەز سەرۆکێ دەستەکا رێڤەبەرا شەریکەیەکا مەزنا چەندئالی مە، بزاڤێ دکن کۆ بهایێ تشتێن خوە زێدە بکـن. لـێ ئـەز ب بێهنفرەهـی چـیررا خـوە دگـەل وان درێژ دکم ئوو بهایێ وان دئینم خوارێ. ژبەر وێ کۆ چ دەلیلـەکێ نـابینم پارەیـەکێ زێدەتر بدم. رەنگە ئەو فرۆشتنکار من وەکی کەسەکی ئەرزان- کرر ببینن، لێ ئەز خوە وەسا نابینم.

ئەم دبێ ڤێ هزرێ کۆ مرۆڤێن دەستبەردایی ئوو پررمەزێخ مرۆڤێن سەخی نە ئوو کەسێن کۆ پـارەیی ب ئاوایـەکێ ژیرانـە دمـەزێخن "ئـەرزان- کـرر"ن بگـوهێرین. رەنگـە ئـەز ئـەرزانکررەك بم کـۆ بزاڤـێ دکـت ٢٥ سـەنتان ڤـەبهێلت ئـان ژبـۆ کررینـا ئامـانێن هـەررییێ دگـەل فرۆشـتنکاران چـیرردرێژیی دکـت. لـێ ژبـۆ فێرکـرن ئـوو ژینفرەهـی یـا کارمەندان، بێ دودلی چەند ملیۆن دۆلاران دمەزێخم.

کارخانە یێن بەرهمئینانێ یێن "دێوو"یێ گەلـەك ژینگـەهێ پـیس نـاکن، لـێ ئەگـەر پێـدڤی بـت ئـەم بـێ دودلـی دێ دراڤـی ژبـۆ باشـترکرنا کارخانـەیێ بمـەزێخین دا کـێمتر ژینگەهێ پیس بکن. دەما بەهسا غەرامەت ئانکۆ خوینا پاشمایێن وان کارمەندان دهێت کـۆ ل دەمـا کـارکرنێ مرنـە، ئـەم دبـنی را "رەزیـل" ئـوو "دەسـت مـچیایی" نینـە. ئـەم دزانین ل کیدەرێ ئوو چاوا دراڤی بکاربئینین. دەما هەژی یا هەر تشتەکی ل سـەر هـش ئوو هزرا وی رادوەستت کۆ دراڤی دمەزێخت.

ئەگەر هەر ژ هەیاما جوانی یـا خـوە د هـزرا پاشـڤەهێلانا دراڤـی دا بـن، دەسـتپێکا ژیانا هەوە دێ خوەش بت. هەلبەت کارەکێ ئەحمەڤانی یە کۆ هەر تـشتێ هـەوە هـەبت بمەزێخن. رێ یا باش ئەوە کۆ ژ تشتێ هەوە ئـەڤرۆ هەیـە تـشتەکی ژبـۆ سـبەهی دابـنن ئالیەکی. "جان وورلی" کۆ گوهاررتنخوازەکێ دینی بوو، جـارەکێ گـۆت مـن هـەتا دکـارم دراڤـی بدەسـت بئـێخم ئـوو دانم ئالیـەکی ئـوو پاشـی ژی هنـدی دکـارم وی دراڤـی ژبـۆ خەلکێ دی بمەزێخم. ئەز دکارم ببێژم ئەڤ فەلسەفە یا من د پـارە کـۆمکرنێ دا یـە. لـێ ئەز دخوازم تشتەکێ دی ژی لێ زێدە بکم: هـون چـەند پـارەی کـۆم بکـن ژی ڤروشـەکی ژێ زرر مەکن.

**بەهرا هەفتێ**

# هەڤررکی

ئەم ل چاخێ هەڤررکی یێن دژوار دا دژین ئوو کار گەهشتی یە هندێ کۆ ژیان ب خوە ژی بوویە جۆرەیەکێ هەڤررکیێ. ئەگەر هون ل هێلا هەری پێشین یا هەڤررکیێ نەبن، هون دۆرییایی نە. ژبیر مەکن ژی کۆ هەڤررکیێ تەنێ مەدالیایەکا زێری هەیە.

هەر وەرزشەکێ قانوون ئوو ئایینێن خوە هەنە. ئەگەر وەرزشڤانەك قانوونێن یاریێ بن پی یێن خوەڤە بکت، دێ بهێت سزادان، دێ ئاگاهداریان وەربگرت ئوو جارنا ژی ژ یاریێ دهێت دەرکرن.

"دێوو"یێ تیمەکا تۆپاپێ (= فووتبولێ) یا پیشەکارانە (= موحتەرف) ب ناڤێ "دێوو رۆیالز"ێ هەیە. چەند سالان بەری نها، ئەز وەکی سەرۆکێ جڤاتا رێڤەبەرا فەدەراسیۆنا تۆپاپێ یا کۆرەیێ هاتم هلبژارتن. د تۆپاپێ دا، بل ژ گۆلپارێزی (= گۆلچی) کەسی ماف نینە دەستێ خوە بگەهینت تۆپێ، بەرپێنگدان ئوو گرتنا رێ یا یاریڤانێ تیما هەڤررك خەلەتیەك دهێت حەسباندن. تۆپاپێ یاریەکا درست ئوو دادوەرانە یە.

ژیانێ ژی وەکی تۆپاپێ قانوونێن خوە هەنە ئوو ئەم ژی یاریڤانێن یاری یا ژیانێ نە. ئەم دبێ هەڤررکیێ بکین، لێ هەر د وێ دەمێ دا ژی دادوەرانە یاریێ بکین. ئەگەر نە هۆسا بت، ژیان دێ تشتەکێ ڤالا ژ رامانێ بت، دێ ژیان ببت تشتەکێ پووچ. د یاری یا ژیانێ دا گرنگترین تشت ئەوە کۆ هەڤررکەکێ درست ئوو دادوەر بین. ئەڤ ژ برنێ ژی گرنگترە. ژبەر وێ کۆ دۆراندن ب ئاوایەکێ درست ژ برنا ب رێ یێن نەدرست باشترە. ئەم هەمی ژ یاریڤانێن دادوەر ئوو درست زێدەتر حەز دکین هەتا یاریڤانەکێ کۆ ژبۆ برنێ هەر کارەکی دکت.

درسته ئەم نها ل چاخێ هەڤرركی یێن دژوار ئوو گران دژین، لێ نابت كۆ خوە تووشی دژیتی ئوو ڤەدەركرنێ بكین. مەرەم ژ هەڤرركیێ نە ئەوە كۆ هەڤرركیێ خوە ڤەببرینین ئوو ژ ڤادێ دەربكین. هەڤرركی دبێ ب ئاوایەكی بت كۆ ژیانا هەمی ئالیان باشتر بكت. ئەگەر وەها بت، هەڤرركەكێ راستین دكارت ژ هەڤالەكی ئان ژ دەرسدێرەكی ژی مفادارتر بت.

ژبۆ میناك، ل بەزینا ماراتۆنێ تەماشە بكن. هژمارا تۆماركرنێ (= رەكۆرد) تەنێ یا وی كەسی نینە كۆ پێشبەری هەمیان دبەزت. تۆمارەكا نوو هنگی بدەستڤەدئێت كۆ بەزینكار ل بەرانبەری هەڤرركەكی ببەزت. دەما بەزینكارەك خوە ب پێش یێ دی دئێخت، بەزینكارێ دویێ تووشی كەلەجان ئانكۆ هەیەجانێ دبت، دهێت هاندان كۆ زێدەتر خوە ماندی بكت دا خوە ب پێش یێ بەراهیكێ بئێخت. ئەڤ تشت ل سەرانسەری هەڤرركیێ بەردەوام دكت ئوو هەر دو بەزینكار ب هاندانا هەڤرركیێ دكارن ب تۆمارەكا باشتر كێبركێیێ كۆتا بكن.

هون دبێ ب ڤی چاڤی ل هەڤرركیێ مێزە بكن. هەڤرركی تەنێ یا هەوە نیە ئوو نابت بنەتارا هەڤرركیێ ژی ژبیر بكن. هەڤرركی دبێ ژبۆ هەمیان مفادار بت ئوو پشكدارێن وێ هان بدت كۆ زێدەتر خوە ماندی بكن. ئەڤ بنەما یا سەرەكی یا هەڤرركیێ یە كۆ ئەگەر ب ئاوایەكێ درست بهێت بكارئینان دكارت هێزەكا بێ بن ئوو ئافرینكار بت.

هەڤرركی نابت مرۆڤان بكت دوژمنێن هەڤ ئان وان ژ هەڤ دوور بكت، ژبەر وێ كۆ ئارمانجا سەرەكی یا هەڤرركیێ خورتكرنا شیانان ئوو ئافراندنێ یە. ئەگەر هۆسا نەبت، هەڤرركی تەنێ دێ خەلكی ژ ناڤ ببت ئوو ئەخلاقێ باش ژی ناهێلت. هون دبێ بزانن كۆ ئەگەر هون وەسا بهزرن كو هەڤرركی تەنێ پارا هەوە یە، هنگی هون رێ یا نەمانا خوە خوەش دكن.

هون نكارن ژبۆ خوە ئوو دگەل خوە بژین، ژبەر وێ خوە ژ هەمی هەستێن ژ-خوە-رازیبوون ئوو خوەپەرێسیێ كۆ مومكنە جانێ هەوە پیس بكن پاكژ بكن. هون دبێ دگەل خەلكی هەڤكاریێ بكن، هاریكاری یا وان بكن.

بلا ئەم پچەکێ بالا خوە بدین پیشەسازی یا هاتنووچوونێ. ئەڤ پیشەسازی گەلەك گرێدایی یا ماکینە ئوو ئامیر ئوو ئامرازێن جۆربجۆرە. شەریکەیەکا ترومبێل-چێکرنێ نکارت هەمی تشت ئوو کەرستە یێن پێدڤی ژبۆ ترومبێلێ ب خوە ب تەنێ چێ بکت ئوو وان بسەرئێکڤە بکت ئوو رەوانەیێ سووکێ بکت. ترومبێلەك بەرهەما ل سەر هەڤ کۆمبوونا ب هزاران پارچەیانە کۆ د پیشەسازی یێن جۆربجۆر دا دهێن بەرهەمئینان. هەر ب ڤی ئاوایی، ئەم ژبۆ هەر تشتەکێ پێدڤی د ژیانا خوە دا ب رژدی گرێدایی خەلکێ دی نە.

شەریکە ژبۆ بەرهەمێن باشتر گەلەك ب خورتی هەڤرکی یا ئێك دکن، ژبەر وێ ژی بەرهەمەکێ باشتر دگەهت دەستێ کاربەران. ئەگەر تەنێ بەرهەمدێرەك هەبا، هنگی تەکنۆلۆجیا گەلەك ب پێش نەدکەڤت. ژبۆ میناك، رەنگە مە هێشتا مەکینە یێن دەستی یێن شوشتنا کنجان (= جلکان) بکارئینابان. هەلبەت، هندەك جاران دراڤ ئوو هێزەکا گەلەك بێقام ژبۆ پێشڤەبرنا تەکنۆلۆجیایێ ئوو باشترکرنا وێ دهێت مەزاختن. لێ شەریکە بەرهەڤن وێ بکن دا بکارن بەرهەمێن باشتر پێشکێش بکن ئوو ب پێش هەڤرکێن خوە بکەڤن. ئەڤ درست وەکی وێ کێبرکێیێ یە کۆ مە ئیشارەت پێ کر. ئەگەر ئێك ب پێش بکەڤت، یێ دی ژی دهێت هاندان کۆ ب خوەماندیکرنەکا زێدەتر وێ پاشکەڤتنێ نەهێلت.

ژبۆ میناك شەریکەیا "ئاڤیس" یا ئەمریکایی بئینن بەرچاڤێن خوە کۆ ترومبێلان کرێ ددت. شیعارا وان ئەڤ بوو: "ئەم دێ زێدەتر بخەبتین". د هەڤرکی یێن وەها دا، شەریکە نابن دوژمنێن هەڤدو، ئەو دێ ببن پشتەڤان. هەلبەت د ڤان هەڤرکیان دا، کەسێ کۆ ل داویێ دبتڤە کاربەر ئانکۆ بکارهینەرە. لێ هندەك شەریکە ژی هەنە کۆ د هەڤرکیێ دا زێدە دچن ئوو کارێن رەزیلانە ئوو کێم بها دکن. ژبۆ میناك، دیعایەیان ژبۆ هەڤرکێن خوە چێ دکن، ئان ب رێ یێن جداجدا بزاڤێ دکن کۆ سەرمایەدانانێن هەڤپشکێن نافنەتەوەیی ئوو بدەستڤەئینانا ئیمتیاز ئان ئانەهی یا چێکرنێ چێ نەبن. ل گاڤێن وەها، تێگەها راستین یا یاری یا دادوەرانە ئوو جوامێرنە ژ ناڤ دچت.

هەوە ژی بهیستی یە کۆ کرنا هەر کارەکی ژبۆ گەهشتنا ب ئارمانجان رەوا یە. لێ د هەڤرکی یێن راستین دا، رێ یێن چەوت نابن پالپشتێن چ ئارمانجان. یاری یێن

نەدادوەرانە ئوو نەجوامێرانە د راستیێ دا بنەما یێن هەڤررکی یێن راستین بن پێ دئێخن. ئوو ژبیر مەکن کۆ مرۆڤێن دادوەر ئوو درست ئەو کەسن کۆ ب راستی ب سەردکەڤن.

گەلەك باشترە کۆ هون د ئەزموونەکێ (= ئیمتحانەکێ) دا ب ماڤێ خوە دەرەجەیا ٩٠ێ بدەستڤەبئینن ئوو ب غەش ئوو فند ئوو فێل ١٠٠ێ وەرنەگرن. ژبەر وێ کۆ دەرەجە یا درست یا ٩٠ێ ئەوە یا هەوە ب ماندیبوونا خوە وەرگرتی. ژیان وەسا کورت نینە ئوو دەرەجە یا ١٠٠ێ یا ب فند ئوو فێل ژی دەرەجەیا هەوە یا دووماهیێ نابت. دەرەجەیەکا ٩٠ێ کۆ بێ فند ئوو فێل بدەستڤە هات بت، دێ ببت بناغەیەکێ پەیت ژبۆ دەرەجە یێن پاشەرۆژێ ئوو فێلباز ژی دێ هەر بکەڤت داڤێ.

د یاری یا "گۆ"یێ دا زاراڤەك هەیە دبێژنێ "دەستێ درست" ئانکۆ یاریکرنا ل گۆرە یێ بنەما ئوو ڤانوونان. هەر ب ڤی ئاوایی ژی، د ژیانێ دا بنەما یێن حەزکری هەنە. هون رەنگە د کێبرکێیەکێ دا ب فند ئوو فێل ب سەربکەڤن، لێ د یاری یا ژیانێ دا دێ هەر ل بەرانبەری وی کەسێ کۆ ل گۆرە یێ بنەما ئوو ڤانوونێن درستێن ژیانی دژیت بدۆرینن.

ژبەر ڤێ ئێکێ، هیڤدارم کۆ هەر کەسەك ژ هەوە ل دەما خویندنێ تووشی هەڤررکێن باش ببت دا نەچار ببت زێدەتر خوە ماندی بکت. هەڤررکەکێ هۆسا گەلەك ژ هەڤالەکی کۆ تەنێ ل نك هەوە دروونت ئوو دەمێ دبهورینت ژبۆ هەوە ڤەنجترە. هەمی جاران بزاڤێ بکن دگەل هەڤررکان ببەزن ئوو هون ب خوە ژی هەڤررکێن باش ژبۆ هەڤررکێن خوە بن. هنگی هون هەر دو دێ بگەهن سبەهی یێن حەزکریتر، روهنتر ئوو پربارتر.

بەهرا هەشتێ

# رێبەری

"ژ کانی یا زەلال، ئاڤەکا زەلال دزێت". ئەڤ مەتەلەکا کەڤن یا کۆرەیی یە ئوو گەلەك ژی درستە. کانی دبێ زەلال ئوو پاکژ بت هەتا رووبارێن پاکژ ئوو زەلال ژێ بزێن.

جڤاك ژی هۆسا یە. رێبەرێن جڤاکێ دبێ درست ئوو ساخلەم بن، هەتا جڤاك ساخلەم بمینت. ئەز باوەرناکم چ زێدە گاڤی بت کۆ ببێژین ژ کریار ئوو رفتارا رێبەرێن جڤاکەکێ، مرۆڤ دکارت وێ جڤاکێ هەلبسەنگینت. ژبەر وێ مەتەلا "ژ کانی یا زەلال، ئاڤەکا زەلال دزێت"، د راستییێ دا، تەکەزکرنا گرنگی یا دەورێ رێبەرێن جڤاکێ یە. ئەم حەوجەدارێن وان رێبەرانین کۆ ژبۆ خەلکێ نیشانا باوەری‌ب‌خوەبوونێ ئوو وێرەکییێ بن.

هەر کەس نکارت ببت رێبەر، لێ دبێ هەر جڤاکەکێ تێرا خوە رێبەر هەبن. د زمانێ کۆرەیی دا مەتەلەك هەیە دبێژت ئەگەر قایێقێ تێرا خوە سەولڤان (= کەسێن کۆ ل بێرێ دئێخن) هەبن، دکارت بگەهت سەرێ چیایان، لێ ئەگەر تێرا خوە نەبن نکارت ژ جهێ خوە بلڤت. ژبەر ڤێ، گەلەك گرنگە کۆ مرۆڤێن خودان‌شیان ئوو ژێهاتی ببن رێبەر. جڤاکەکا بێ مرۆڤێن هۆسا، هەر دێ ل کەندوولەندێن ئاریشەیان بمینت.

رێبەری دبێ چ سالۆخەت هەبن؟ وی دبێ گەلەك شیان هەبن. دبێ بکارت ڤنیاتێ ژبۆ خەلکی چێ بکت ئوو بکارت وان رێك بئێخت. ئاستێن جۆربجۆرێن جڤاکێ چاڤەرێ یێن شیانێن بێقامێن رێبەرانن. ئەو دخوازن کۆ رێبەرەکێ خورت ئوو ب هێز بکارت ژهەڤنەگرتن ئوو نەکێرهاتی‌بوونێن ناڤ جڤاکێ چێڤە بکت ئوو هێزا مرۆڤی ژبۆ ژینفرەهی ئوو پێشکەڤتنا جڤاکێ بهاژۆت. تشتەکێ گرنگ ژبیر مەکن، رێبەری تشتەکە،

دکتاتۆری تشتەکێ دی. ڕێبەرێ کۆ ئەز دبێژم نە ئەوە یێ کۆ دژبەری وان کەسان ژی کاربکت یێن کۆ بەرپرسیاری یا وان ژی ل سەر ملێن وی یە. د دیرۆکا ڤی وەلاتی دا، رەوشەکا تایبەتی هەبوویە ئوو ئەم دکتاتۆریێ ب شاشی ڤە ب رامانا ڕێبەری یا خورت ئوو ب هێز تێ دگەهشتین. لێ، ئەڤرۆ ئەم زێدەتر ئالۆزێ هندێ نە کۆ هندەك کەس خوە ژ وەرگرتنا هندەك ژ بەرپرسیاریتی یێن پێدڤی ژبۆ ڕێبەریێ ددن پاش. چاخێ دەمۆکراسیێ نە ئەوە کۆ مە ئێدی چ حەوجەداری ب ڕێبەران نینە. بەرڤاژی وێ، نها ئەم زێدەتر ژ هەر دەمەکا دی حەوجەدارێن ڕێبەرێن راستینین، ڕێبەرێن کۆ ب رایا گشتی هاتنە هلبژارتن ئوو ل گۆرەیێ داخوازێن خەلکی کاردکن. ژبەر وێ، ژبۆ موکمترکرنا پێگەها ڕێبەریێ، پێدڤی یە دەستەکێن جڤاکێ ب نهێرینەکا عاقلانە ئوو هشیارانە سەردەریێ بکن. ئەم حەوجەدارێن سیستەمەکا ڕێبەری یا گەلێری نە کۆ ل گۆرەیێ داخواز ئوو رازیبوونا خەلکی کاربکت.

ڕێبەری دبێ سالۆخەتەکا گرنگ یا دی ژی هەبت. دبێ ب ئاوایەکێ سەربەردایی (= موتلەق) ل بەرانبەری بەرپرسیاریتی ئوو ئەرکێن خوە هەست ب بەرپرسیاریێ بکت. ڕێبەر دبێ بەرپرسیاریتی ئوو ئەرکێن خوە دناڤ جڤاکێ دا وەکی بەرئەمریەکا (= مەئموورییەتەکا) ژ ئالی یێ خودێ ڤە بحەسبینن ئوو هەرگاڤ وەسا بێینن هزرا خوە کۆ ژبۆ بجهئینانا وی ئەرکی هاتنە دنیایێ. ئەو دبێ ژیان ئوو مانا خوە گۆری ئوو قوربانی بەرپرسیاری یا خوە بکن ئوو وێ بەرپرسیاریتی ئوو ئەرکی بەرئەمری یا (= مەئموورییەتا) هەمی ژیانا خوە بحەسبینن. ئەگەر ڕێبەران هزر ئوو رامانێن وەها نەبن، دێ جڤاکا خوە وەسا تووشی شەوشین ئوو ئالۆزیێ بکن کۆ کەس نکارت کار ئوو بەرپرسیاری یا خوە ب درستی بجه بێینت. کەسێ کۆ ڕێبەریێ وەکی ئالاڤەك دبینت دا پێ بگەهت بەرژەوەندی یێن خوە یێن کەسینی، د راستیێ دا، باوەرنامە یا ڕێبەریێ نینە. ڕێبەران دبێ هەستەکا خورت یا خوەگۆریکرنێ هەبت. ئەڤ هەست ژ هەستا بەرپرسیاریێ دهێت. ئەڤ هەست بێ ئێك نابن. ڕێبەری هەما ئەو نینە کۆ ئێك ل سەرێ ژۆری بروونت. ڕێبەری یا درست هەژی یێ وان کەسانە کۆ ژبۆ پێشکەڤتن ئوو گەشبوونا جڤاکا خوە هەست ب خوەگوریکرنێ ئوو بەرپرسیاریێ بکن. ریبەری وەکی رێڤەچوونا ل جادەیەکا تژی ستری یە. تەنێ کەسێ کۆ بەرهەڤە داخوازێن ژیانا خوە یا

کەسینی ئوو مالباتی بن پێ بئێخت دکارت ببت رێبەر. ئەڤ هەمی ئاستێن رێبەریێ ڤەدگرت. هەر کەس دکارت ببت رێبەر. تەنێ ل سەر هندێ دمینت کا ئەو کەس بەرهەڤە ژبۆ رێبەریکرنێ خوەگۆری بکت ئان نە.

ژبۆ سەرکەڤتنا "دێوو"یێ، ئەز ب سالان نەچار مام ژیانا مالباتی یا خوە گۆری بکم، ژ خەو ئوو خوارنا خوە بدزم. من چ دەم ژبۆ پەروەراندنا زەوقا خوە ئوو ژبۆ رابواردنێ نەبوو. من خوەشی یا ژیانا خوە یا مالباتی گۆری ژیان ئوو سەرکەڤتنا "دێوو"یێ کر.

ل دەستپێکێ، ژنا من گەلەك ژ ڤێ ب گلەیی ئوو گازندە بوو. لێ نها، وێ ژی سەرکەڤتنا کارێ من پەژراندی یە. رەنگە ئەو بهزرت کۆ چ رێ یێن دی ل بەرانبەری وێ نینە. ئەز دبێ هەر ب وێ خەمێ بژیم کۆ من چ جاران زارۆ یێن خوە ژبۆ بێهندانەکێ نەبرن دەرڤە. لێ ئەز هیڤیدارم کۆ پشتی ڤان هەمی سالێن درێژ، ئەندامێن مالباتا من د رەوشا من گەهشتبن ئوو هەما ببێژە پچەکێ فەخرێ ژی ب من بکن. ژبەر ڤێ ئێکێ، ئەز هەست دکم کۆ مرۆڤەکێ بەختەوەرم ئوو سپاسی یا تێگەهشتن ئوو هەستێن مالباتا خوە ژی دکم. هەلبەت، ئەم هەمی گرنگی یا ژیانا مالباتی یا دلخواز دزانین ئوو ئەم هەمی ژی دزانین کۆ بەختەوەری ژیانەکا خوەش یا مالباتی یە. لێ بەرپرسیاری ئوو ئەرکێن رێبەرەکی دبێ ب سەر خوەستەك ئوو رەهەتی یا وی یا کەساتی بکەڤن. ئەگەر هەمی کەس ل پەی خوەستەکێن خوە یێن کەسۆکی بچن، هنگی کی دێ رێبەری ئوو سەرکێشی یا جڤاکێ بکت؟

جڤاکێ دبێ هندەك کەسێن وەها تێدا هەبن کۆ د خەما کەسێن دی دا بن ئوو ئامادە بن کۆ رەهەتی یا خوە د رێ یا رێبەریکرنا جڤاکێ بەر ب وارێ دلخواز دا گۆری بکن. ئەگەر هون بخوازن ببن رێبەر، دبێ هون ئامادەیی خوەگۆریکرنێ بن.

سیاسەتا کارمەندی یا "دێوو"یێ ل سەر ڤی بنگەهی هاتی یە ئاڤاکرن. ئەم ژ وان کارمەندان حەز دکین کۆ ئافرینەرن، ڤەبخوازیێ دکن، خوەگۆریکەرن ئوو گەلەك خوە ماندی دکن. کەسێن وەها خودانێن سالۆخەتێن رێبەرانن، کەسێن وەسا ل داویێ دکارن ببن رێڤەبەرێن "شەریکە یا دێوویێ". ئەگەر هندەك ژ وان هند ئافرینەر ژی نەبن،

دیسا ژی ئەم ژ وان حەز دکین، ژبەر وێ کۆ ئەم دزانین ئەو ژ کارێ خوە حەز دکن ئوو ژبۆ سەرکەڤتن ئوو گەهشتنا ب ئارمانجان هەمی بزاڤان دکن.

کەسێن وها، دێ ببن رێڤەبەرێن کارگێری یێن پاشەرۆژێ یێن "دێوو"یێ. ژبەر وێ کۆ ئەو بەرژەوەندی یێن گشتی ل سەرڤەیی بەرژەوەندی یێن کەسۆکی دادنن ئوو باوەرن کۆ بزاڤکرن ژبۆ پێشکەڤتن ئوو باشترکرنا ئابۆری یا جڤاکێ ژ پێگەهێ وان یێ جڤاکی ئوو کەسۆکی گەلەك گرنگترە. کەسێن وها دێ ببن هێڤێنێ سەرکەڤتنا شەریکە یا "دێوو"یێ، ژبەر وێ کۆ هێسایی ئوو خوەشی یێن ژیانا خوە یا کەسۆکی گۆری رازیبوون ئوو خوەشی یێن بلندتر دکن.

هندەك کەس ژی تەنێ ژبۆ بەرژەوەندی ئوو مفا یێن خوە کاردکن. ئەو زێدەتر د هزرا ژیانا خوە یا کەسۆکی ئوو مالباتی دا نە. کەسێن وەها ب چ ئاوایەکی ب کێری شەریکە یا "دێوو"یێ ناهێن. ئەو نزانن بەرژەوەندی یێن کەسۆکی ئوو تەڤانە ژ هەڤ ڤابڤێرن. شەریکەیا "دێوو"یێ حەوجەدارا کەسێن وەها نینە.

خەلك رێزێ ل رێبەرەکێ وەسا دگرن کۆ ب هەمی هەبوونا خوە رێبەریێ بکت، ب هەستا بەرپرسیاریتی ئوو خوەگۆریکرنێ ئوو بها یێن راست رێبەری یا جڤاکێ بکت. دبێ رێز ل رێبەران بهێت گرتن. ب ڤی ئاوایی ئەم دکارین دکتاتۆران ئوو رێبەرێن راست ژ هەڤ ڤەبنیاسین. خەلك ژ ترسان، نە ژ رێزگرتنێ، گوهداری یا دکتاتۆران دکن. لێ خەلك ژ رێبەرێن راست ناترسن ئوو ژ دل رێزێ ل وان دگرن. چاوا کۆ مرۆڤ نابت هەر دەستهەلاتەکێ دگەل دەستهەلاتا راست تێکهل بکت، وەسا ژی نابت دەستهەلاتەکا دکتاتۆرانە دگەل رێبەری یا راست تێکهل بکت. دەستهەلات ئوو مەزناهی یا راستی ژ رێزگرتنێ چێ دبت. رێبەر دبێ ب خوەماندیکرنا خوە ڤێ دەستهەلاتێ ئوو مەزناهیێ بدەستڤە بئینت. ئەگەر بدەستڤە نەئینا، نکارت ئوو نەشێت رێبەری یا جڤاکێ ژی بکت. ئەم دبێ ب راستی ئوو ژ دل رێزێ ل دەستهەلاتا رێبەرەکی بگرین کۆ ب هەستا بەرپرسیاریتی ئوو خوەگۆریکرنا خوە ئەو دەستهلات بدەستڤە ئینابت.

ئەز دخوازم دیسا ژبۆ جوانان تەکەز بکم کۆ هەستا بەرپرسیاریتیێ د گیانێ خوە دا بەرفرەهتر بکن. رێبەرێن وەسا بن کۆ خوە ژ خوەشی یێن گاڤێن دپارێزن ئوو ژ چاردیواریێ ژیانا خوە یا نها دەردکەڤن ئوو هاریکاری یا پێشکەڤتن ئوو باشتربوونا

رەوشا جڤاکا خوە دکن. هەر کەسەك نکارت ببت رێبەر ئوو هەر کەس ژی نابت ببت رێبەر.

لێ ب رامانەکا دی هەر ئێك ژ هەوە رێبەرێ ژیانا خوە یە، ژبەرکۆ کەس نکارت ل شوونا هەوە بژیت. هون رێبەرێن خوە نە، ژبەر وێ هەمی تشتێن مە دەرهەڤا رێبەران دا گۆتن، دەرهەڤا هەر ئێك ژ هەوە دا ژی راستن.

هیڤیدارم کەسێن کۆ دخوازن ببن رێبەرێن جڤاکا خوە، شیرەتێن من بجە بئینن. ئانکۆ شیانا رێبەریێ، هەستا بەرپرسیاریێ، خوەگۆریکرنێ ئوو خوەئێکدلکرنێ ژبۆ بەرهەڤکرنا ژیانەکا داخوازکری ئوو سەرکەڤتی د خوە دا بپەروەرینن.

**بەهرا نەهێ**

# ئەم هەمی کۆریی نە

ئەز نزانم ژبۆ چ دەمارگری یێن هەرێمی ب ڤی ئاوایی ئاریشەیان چێ دکن.

ئەز کۆرەییەکم. کۆکێن مالباتا من ڤەدگەرن گزرتا "چنجۆ"یێ ل باشورێ هەرێما "چولا"یێ. بابێ من ل وێدەرێ هاتی یە دنیایێ ئوو شەهرەدارێ دویێ یێ وێ گزرتێ بوو. ژبەر ڤێ ئێکێ، ئەز "هونامی"یەکم. هەروەسا ئەز ل "پونگ سان"ێ، ل هەرێما "دائێگۆ"یێ هاتمە دنیایێ. من دبستانا بەرهەڤی ئانکۆ دبستانا بلند ژی ل وێدەرێ خویند ئوو ل دەما شەررێ کۆرەیێ ژ "سیۆلێ" بەرب "دائێگۆیێ" رەڤیم. ژبەر ڤێ ئێکێ ژی ئەز "یونگ نامی" مە. هەر وەسا ئەز ل بازارێ سیۆلێ مەزن بوومە، دبستانا ناڤین ئوو بەرهەڤی ئوو زانینگەهـ من ل وێدەرێ دەربازکرنە. ژبەر ڤێ ژی دکارم ببێژم ئەز سیۆلی مە. بابەتێ گرنگ ئەوە کۆ ئەز ب ئاوایەکێ نەمازەیی ب چ ئێك ژ ڤان دەڤەران ڤە گرێدایی نینم. تەنێ ئەز دزانم کۆ ئەز کۆرەیی مە ئوو کۆرە ژی نەتەوەیەکا بچووکە ئوو ئەم گشت ب زمانێ کۆرەیی دئاخڤین.

ل هەر دەڤەرەکێ هندەك هەنە کۆ ژ یاری یا بێسبۆلێ حەز دکن ئوو هندەك ژی هەنە کۆ هەما ژ بنی را ژێ حەز ناکن. هندەك مرۆڤانی نە ئوو ژ تێکهلی یا ب خەلکی را حەز دکن ئوو هندەك ژی خوەڤەدەردکن ئوو تێکهل نابن. هندەك ژ مووسیقی یا کلاسیك ئوو هندەك ژی ژ سترانێن رۆژێ حەز دکن. هندەك گرێدایی ژیانا مالباتی نە ئوو هندەك ژی ژ ژیانا مالباتی حەز ناکن. جداتی یێن وها ل هەمی دەڤەران هەنە. لێ چ ژ ڤان جداتیان نەمازە ئوو خاسمە یێن چ دەڤەرەکێ نینە. قەت دو کەس ب هەمی ئاوایان وەکی هەڤ نابن. ئەگەر هون ب درستی بگەررن، دێ هون پێ بحەسن کۆ دەڤەرێن جداجدا ژ گەلەك ئالیان ڤە مینا هەڤن. ژبەر وێ، ئەگەر ل دەستپێکێ هون ل

شـوونا نەوەكهـەڤيان ل وەكهـەڤيان بنهێـرن، هنگـى دكـارن نەوەكهـەڤيان ب سـينگەكێ فـرەهتر بپـەژرينن ئـوو رێـزێ لـێ بگـرن. لـێ دەمـا هـون نەوەكهـەڤيان بكـن موهانـە يـا توخمپەرێـسى ئـوو دژيـتى يـا نـاڤخوەيى، هنگـى دێ ئاريـشە پەيـدا بـبن. جـداتى نيـشانا هنـدێ نـە كـۆ مـرۆڤێن ژ گەلـەك تەهـەران هەنـە. موهانـەكرنا جـداتيان ژبـۆ فەرقووجداتيێ كارەكێ هۆڤانەيە ئـوو هـەما وەكـى وى كـارى يـە يـێ هيتلـەرى دژبـەرى جهوويان كر. ل جڤاكەكا ساخلەم، خەلك رێزێ ل جـداتى ئـوو نەوەكهـەڤى يـێن هەڤـدو دگرن.

ل جڤاكا مە جهێ فەرقووجداتيكرنێ نينە. ئەز وەكى ئێك ژ ئەندامێن نڤشەكى كۆ ژ ئالى يێ سياسى ئوو جڤاكى ڤە ئەڤ فەرقووجداتى زێدەكرى، هەست ب بەرپرسياريێ دكم. دەما ژ جوانان دپرسن كا سـەرووكانى يـا فەرقووجـداتى يـێن دەڤـەرا وان چ نـە، د بەرسڤێ دا دبێـژن فەرقووجـداتيێ ژ دايبـابێن خـوە فێربوونـە. ئـەڤ گـۆتنێن هۆسـا وێ هزرێ بۆ مـن دئيـنن كـا ئـەرێ دايبـابێن ئـەڤرۆ ژ دەمـارگرى ئـوو فەرقووجـداتيى يـێن شەرمزارانە يێن باژارى پێڤەتر تشتەكى نـابينن كـۆ بـدن زارۆ يـێن خـوە، ئـانكۆ نڤـشێ جوان؟ هون جوان ژى دبێ دايبابێن خـوە ببهـورن يـێن كـۆ بزاڤـێ دكـن دەمـارگرى ئـوو فەرقووجداتى يێن باژارى فێرى هەوە بكن. نـەمازە نهـا كـۆ وەلاتـێ مـە زێـدەتر ژ هـەر دەمـەكا دى حەوجـەدارى ئێكـەتى، هەڤپێـژنى (= هەماهـەنگى) ئـوو ئێكگرتنـا هـەمى گەلێ مە يە.

ژبۆ يەكيتيێ، دبێ ئەم تێگەها "ئەز" بەر ب تێگەها بلنـدتر يـا "ئـەم" بگوهێرين. فەرقووجداتى ژ نهێررينا خوەپەرێسانە يا مرۆڤى دهێت. ئەگەر مرۆڤ ب چاڤێ جڤـاكێ ل ڤـان فەرقووجـداتيان مێـزە بكـت، دێ وان وەكـى جۆرەيـەكێ رێزگرتنـا ژ نەوەكهـەڤى يێن كتكەسى ببينت.

ئەگەر مرۆڤ تەنێ د هزرا خوە دا بت، دێ ببت مرۆڤەكێ خوەبين ئـوو خوەپـەرێس ئوو دێ ململانێ ئوو ژهەڤنەگرتنا دگەل خەلكى ژێ پەيدا ببت. لێ دەما هـون ل شـوونا "ئـەز" ل "ئـەم" بفكـرن، هـون دەرگـەهێ مرۆڤدۆسـتيێ ڤـە دكـن ئـوو تێكهلـى ئـوو دانووستانێن مفادار دگەل خەلكى دەست پێ دكن. سـەفەرێن ژبـۆ دەرڤـەيێ وەلاتـى دێ چاڤێن هەوە ڤە بكن ئوو هـشيارى يـا هـەوە دەرهـەڤا تێگـەها "ئـەم" زێـدەتر بكـن ئـوو

هون دێ پێ بحەسن کۆ خوە-مەزنکرن ئوو خوەپەرێسی چەند تشتێن ئەحمەقانی نە. دەمارگری یێن باژارکانی وەکی ئاسۆیێ نهێررین ئوو دیتنا بەڤەکێ یە کۆ د بنێ بیرەکێ دابت. ئەو نە هەژی یێ مرۆڤەکێ تێگەهشتی ئوو بەرچاڤ-ڤەکری یە.

مە ل "دێوو"یێ دەمارگری یێن هەرێمی نینە. رەنگە ئەڤ ژبەر وێ بت کۆ مە ل شەریکە یا خوە نهێررینەك ئان هزرەکا ناڤنەتەوەیی پەیدا کری یە. دەما هون دچن دەرڤەیی وەلاتی، هنگی هون ب ئەحمەقانی-بوونا دەمارگری یێن باژارکانی دحەسن. ژبەر وێ کۆ هون پێ دحەسن ب هەر رەنگی بت ئەم هەمی کۆرەیی نە.

دەما هون کۆرەییەکێ دی ل دەرڤەیی وەلاتی دبینن، هون دبن هەڤالێن ئێك ئوو ب دیتنا هەڤدو گەلەك کێفخوەش دبن. هون تەماشە ناکن کا هەر ئێك ژ هەوە خەلکێ کیدەرێ یە. وی چاخی ویلایەت ئوو ئستان (= پارێزگەهـ) گرنگ نینە.

ئەز باوەرم کۆ ب رێ یا بەرنامە یێن جۆربجۆر ئەم دکارین ڤان دەمارگری یێن باژارکانی ژناڤ ببین. ئێك ژ وان بەرنامەیان دکارت پێك گوهاررتنا خویندکارێن زانینگەهان ل هەیامێن بێهندانان بت دا خویندکارێن باژارەکی بکارن دگەل مالباتێن باژارێن دی بژین. بەرنامەیەکا دی ژبۆ کێمترکرنا فەرقووجداتیان، زێدەکرنا زەوجینا دناڤبەرا وان دا یە، نەمازە دناڤبەرا هەرێما "کونیك سانگ" ئوو "چۆلا"یێ دا. ئەگەر بەرنامە یێن وها بهێن بجهکرن، ئەز ب هەمی شیانێن خوە ڤە دێ پشتا وان بگرم.

بئینن بەرچاڤێن خوە من کێکەکا بچووك هەیە کۆ تەنێ تێرا ئێك کەسی دکت، لێ چار-پێنج کەس چاڤ-برسیانە چاڤنهێررێ خوارنا وێ نە. ئەگەر ئەز کێکێ ل پێش وان دابنم، بێگومان دێ ل سەر شەرری بکن. ئێك دێ نیڤەکێ رارەڤینت، یێ دی دێ ب نیڤەکا دی برەڤت ئوو دو کەسێن دی ژی دێ بێپار بمینن. ئان رەنگە ل دەما شەرر ئوو ئالۆزیێ دا ژی، کەییسپەرێس ئانکۆ هەلپەرێسەك ژ دەرڤە بهێت ئوو هەمی کێکێ ژبۆ خوە ببت ئوو برەڤت. هنگی یێن دی هەمی دێ بێ پار بمینن. ژ ئالیەکێ دی ڤە ئەگەر ئەو چار-پێنج کەس ب کۆمکرنا هشێ خوە کێکەکا مەزنتر چێ بکن، هنگی هەمی دێ کێفخوەش ئوو دلشا ببن. لێ ئەگەر کەسەك ژ وان کێکێ ب ملکێ خوە بزانت، هنگی کەساتی یا وی ژ کێکێ ژی بچووکتر دبت. لێ ئەگەر ئەو رێیەکێ ڤەببینت کۆ کێکەکا

مەزنتر ژبۆ هەمیان چێ بکت، هنگی کەساهی یا وی ژ کێکێ مەزنترە، بلا ژ کێکێ پرتەکا بچووکترێ ژی بگەهت وی.

ل ڤێدەرێ ئەم ب بابەتەکێ گرنگ دحەسین: بنەمایێ هاریکاری ئوو ئێکگرتنێ. دەما ئەم هاریکاری یا هەڤدو بکین ئوو بەرهەمێ کارێ خوە دگەل هەڤدو ڤەببەشین، هنگی هەبوونا مە ب ڤاسی کار ئوو بزاڤا هەڤپشکا مە مەزنتر ئوو بەرفرەهتر دبت. ئەز شیرەتان ل وان دایبابان دکەم کۆ ژبۆ دۆتا (= کیژا) خوە یا نوو-بووك خەمگینن، ل شوونا هندێ کۆ ب ژدەستدانا دۆتا خوە خەمگین ببن، بلا هزر بکن کۆ بوونە خودانێ پسەکی (= کورەکی). ئەڤ رێ یا درست یا هەڤرووبوونا دگەل ئاریشەیانە. ل پشت هەمی بوویەران، تشتێ هەری گرنگ ئەوە کا هون چاوا بوویەران شرۆڤە دکن. دەما خەلك بهەڤرا کار دکن، چ کەسەك ژ وان پشکا خوە ژ دەست نادت، ئەو بەرژەوەندی ئوو شیانێن خوە چەند ڤات دکن.

ئەم وەلاتەکێ بچووکین، بچووکتر ژ پررانی یا ویلایەتێن ئەمریکایێ. نێزیکی ٧٠ ژ سەدێ ژ ئاخا مە کویستان ئوو چیا یە کۆ ئاریشە یێن نەمازە ژبۆ مە چێ دکت. ژ هەمیێ خرابتر ژی ئەوە کۆ نیڤگزرتا (= شبه جزیرەیا) کۆرەیێ دو پارچە بوویە. ژبەر وێ هون دێ پێ بحەسن کۆ پەڤچوونێن هەرێمی چەند پێکەنۆك ئوو بێفاییدە نە. هەرێم-هەرێمکانێ وەکی وێ یە کۆ کەسەك ب تەنێ هەمی کێکا بچووك ژبۆ خوە بخوازت. بلا ل شوونا پووچکرنا هێزا خوە ژبۆ گەنگەشە ئوو کێشمەکێشێن بێ فاییدە، هزرا خوە ل پەهتنا کێکەکا مەزنتر بکین کۆ تێرا هەمیان بکت.

ژبەر ڤێ، ئەز دخوازم رێ یا پەهتنا کێکەکا مەزنتر نیشا هەوە بدم. ئێك ژ وان رێیان سەفەرکرنا ژبۆ دەرڤەیی وەلاتی یە. دەما هندێ هاتی یە کۆ ل شوونا شەررکرنا ل سەر کەری یێن بچووکێن کێکێ، هێزێن خوە یێن هەڤپشك د رێ یا پەهتنا کێکەکا مەزنتر دا بمەزێخین، دا هەر ئێك ژ مە پارەکا مەزنتر بەربکەڤت ئوو ئەم هەمی ژی دلشا ببین.

**بەهرا دەهێ**

# مەزنترین دەرسدێرێ هەوە

سەربهور ئوو تەجریبەیێن ژیانێ مەزنترین دەرسدێرێن مرۆڤی نە. ب رێ یا سەربهوران، هون دکارن ب راستی ئوو نەپەنی یێن ژیانێ بحەسن ئوو ب ڤی ئاوایی ژی کەساهی یا هەوە هێدێ هێدی گەش دبت.

چەندەکێ بەری نها، من کتێبەك دخویند کو ل سەد سالا ١٨ێ ب دەستێ سیاسەتڤانەکێ ئنگلێز ب ناڤێ "فلیپێ چێستەرفیلد"ی هات بوو نڤیسین. کتێب کۆمەکا نامەیانە کو وی ل دەما بالیوٚزی یا خوە ل هوٚلەندایێ ژبوٚ پسێ (= کورێ) خوە نڤیسینە. د ئێك ژ وان نامەیان دا، دهێت گوٚتن کو جڤاك مەزنترین کتێبا جیهانێ یە ئوو پسێ وی دکارت ب رێ یا ڤەخویندنا وێ زێدەتر ژ ڤەخویندنا کتێبێن چاپ‌بوویی فێری تشتان ببت. ئەز ژی گەلەك ل سەر گرنگی یا سەربهورێ تەکەز دکم، ژبەر وێ کو سەربهور کێراترین ئوو لەزگینترین رێ یا فێربوونا مرۆڤی ژ جڤاکێ یە.

هەمی شروٚڤەکارێن ئنگلێز، ژ "فرانسیسێ بیکەن"[1] هەتا "جوٚنێ لاك"[2] ئوو "دێڤیدێ هیوم"[3] تەکەز دکن کو هەمی زانینا وان دبن کارتێکرنا سەربهورا وان دا

---

(١) فرانسیسێ بێکەن (Francis Bacon) (١٥٦١–١٦٢٦) فەیلەسووفێ ناڤداری ئنگلیز کوٚ ب فەلسەفەیا خوە پشتەڤانی یا شوٚرەشا زانستی یا ئەوروویایێ کر ئوو بناغەیێ شێوازێن زانستی دانان.

(٢) جوٚنێ لاك (John Locke) (١٦٣٢–١٧٠٤) فەیلەسووفێ ناڤداری ئنگلیز کوٚ ژ پێشەنگێن فەلسەفەیا ئەزموونباوەری (ئیمپەریسیزمێ) یە. ئەو هەروەکی ژاك ژانێ روٚسوٚ د هزرا "رێککەڤتنا جڤاکی" دا گرنگە. کارتێکرنا جوٚنێ لاك ل سەر فەلسەفەیا سیاسی یا لیبەرالیزمێ، شوٚرەشا فرانسایێ ئوو ئەمەریکایێ ئوو ل سەر فەلسەفەیا ژاك ژانێ روٚسوٚ ئوو ئیمانوییێلێ کانت گەلەك زەهڤە.

(٣) دێڤیدێ هیوم (David Hume) (١٧١١–١٧٧٦) فەیلەسووف، ئابوٚریزان ئوو دیروٚکزانێ سکوٚتلەندی یە کوٚ مروٚڤ دکارت وی فەیلەسووفێ هەری پێشین د فەلسەفەیا خوەرسکی دا بحەسبینت. وی باوەری یا ب "خودێیی بوونا مروٚڤان" ئێخست بەر گومانێ ئوو گوٚت دبێ وەکی هەر بوونەوەرەکێ دی یێ خوەرسکی ل مروٚڤی تەماشە بکین. ئەو گەلەك د بن کارتێکرنا کەسێن وەکی جوٚنێ لاك ئوو ئادامێ سمیت دا بوو.

بوویە. ب گۆتنەکا دی، ئەم مرۆڤ ب هزرێن دەست-لێ-نەدایی ژ دایکێ دبین ئوو پشتی هنگی ب هاریکاری یا سەربهورێن ژیانێ ئوو ل گۆرەیی وان وەرارێ دکین ئوو پێش دکەڤین. ژبەر ڤێ هندێ، ل دەما لاوینی ئوو جوانییێ، هندی ژ هەوە بهێت ژبۆ بدەستڤەئینانا سەربهورێن زەهڤ ئوو بەرفرەهـ بخەتبن. ب ڤی رەنگی دێ هەبوونا هەوە بەرفرەهتر ئوو کوورتر ببت، دێ ب نەپەنی یێن ژیانێ بحەسن. "کۆنفۆسیۆس" باوەربوو کۆ ئەگەر هون دگەل دو کەسان پیاسەیێ بکن، ب کێمانی ڤە، ئێك ژ وان دەرسدێرەکێ هەوە یە.

فێربوونا من ژ جڤاکێ گەلەك زوو دەست پێ بوو، ژبەر وێ کۆ دەما ئەز وەکی ئاوارەیەکێ شەرری دگەل مالباتا خوە ل "دائێگۆ"یێ بووم، ژبۆ ژیارا مالباتا خوە دبێ خەبتیبام. هنگی ئەز ب هەڤراز ئوو نشیڤێن تێکهلی یێن مرۆڤان، چاوایی یا بدەستڤەئینانا پارەیی، بازارکرنێ، هەڤررکیێ، سەرکەڤتنێ ئوو راستی یێن دی یێن ژیانێ حەسیام. ڤان هەمی سەربهورێن دەستپێکانی باندۆرەکا مەزن ل سەر ژیانا من هەبوویە. دبێ هون هەمی تشتان د ژیانا خوە دا بجەربینن، تەنێ ئەو تشت نەبن یێن کۆ ئەخلاق رێیێ نادەتێ. ژ وان دەربچت، تشتەك د ژیانێ دا نینە کۆ ب کێری جەرباندنێ نەهێت. ب گەرمی وەرزشێ بکن، ب رژدی زانستی فێر ببن، هندی ژ هەوە دهێت دۆستینی یا خەلکی بکن ئوو ئەڤیندار ژی ببن. ئەردی بکێلن، ترومبێل هاژۆتنێ فێر ببن، هەرن چیای، جارەکێ جەرباندن ژ چ جاران نەجەرباندنێ باشترە. بەری هون بکارن ل سەر بابەتەکی ب کووری بئاخڤن، دبێ هەوە ئەو بابەت ب هووری جەرباند بت ئوو بەری هون تشتەکی ب هووری بزانن ئوو بنیاسن، دبێ هەوە جەرباند بت. جەرباندن ئوو سەربهور مەزنترین دەرسدێرن کۆ هون دکارن ڤەبینن.

ژبەر وێ، دخوازم هندەك ژ وان تشتێن کۆ ژ سەر بهورا خوە فێر بوومە، ب بیرا هەوە بئینم. هەرگاڤا دەراڤ هەبت، سەفەرێ بکن ئوو ئەگەر هون ب درستی سەرەدەرییێ دگەل ڤی بابەتی بکن، دێ ئاسۆیێن رەنگەرەنگ ئوو نوو ل بەرانبەری هەوە ڤەببن. تەنێ ژبۆ خوە مژوولکرنێ سەفەرێ مەکن. ئەگەر د هەر سەفەرەکێ دا تشتەکێ نوو فێر نەبن، سەفەرا هەوە تەوش (= خەلەت) ئوو خرش (= بێ بەر) بوویە. د سەفەرێن خوە دا هووربین بن ئوو ل هەمی تشتان ب هووری مێزە بکن. جداتی یێن دەڤەران

بەرئێكڤە بدن ئوو هایدارێ سالۆخەتێن هەر دەڤەرەكێ ببن. تەنێ نهێررینەكا گشتی بەس نینە. ژ روخسارێ وێڤەتر ژی ببینن، ئەڤینا فێربوونێ دبێ ئێك ژ تشتێن ناڤ پارزینكێ سەفەرێن هەوە بت. چ جهەك ل جیهانێ نینە كو ب كێری دیتنێ نەهێت. هەلبەت سەفەركرن بەر ب هندەك دەڤەران ژ دەڤەرێن دی مفادارتر ئوو هەژیترە، ژبۆ میناك وەلات ئوو ناڤەندێن خودان فەرهەنگ ئوو كولتوورێن زەنگین ئوو جهێن دیرۆكی یێن جیهانێ.

ئەز گەلەك دەیندارێ مالباتا خوە مە، ژبەر كو ئەز ژ بەر كارێ خوە دو ل سەر سێ یا سالێ ل دەرڤەیی وەلاتی مە ئوو ژ ڤێ چەندێ دلگرانم. چ جاران ئەز نەشیامە بابەكێ ئەدەتی بم. ژبەر ڤێ ئێكێ، ژبۆ تۆلەستاندنا هندەك ژ وان كێماسیان، ئەز زارۆ یێن خوە ژبۆ بێهندانێ دگەل خوە دبم سەفەرێن دەرڤەیی وەلاتی. هەلبەت ئەز ژبۆ فێركرنا وان ڤی كاری دكم، ژبەر وێ كو ئەز دخوازم زارۆ یێن من جان ئوو روحەكا جیهانی هەبت ئوو جیهانی بنهێررن. هەر چەندە كو ئەز چ جاران وان ناهنێرم سەفەرێن كێفخوەشیێ كو تەنێ دەمێ ئوو دراڤی دكوژن، ئوو بەر ب ناڤەندێن باژاروارى یا رۆژئاڤاییێ ژی سەفەرێ ناكن. ئەز بزاڤێ دكم كو ئەو سەفەر بكن وەلاتێن مینا مسرێ ئوو هندستانێ ئان جهێن كو شوونوارێن باژاروارى یێن وەكی "مایا"یان[1] لێ هەنە. ل وان دەران ئەو دێ زێدەتر ب دیرۆكا باژارواریێ ئوو هزرا بلندا مرۆڤان بحەسن. شیرەتا من یا دوییێ ئەوە كو هەڤال ئوو دۆستێن هەمیرەنگ بگرن. هەڤالەكێ باش ب ڤاسی سەفەرەكێ گرنگە. هەڤالێن زەهڤ ل دەما خویندنێ ژی گەلەك مفادار ئوو ڤەنجن. هەبوونا تێكهلی یێن جۆربجۆر ل جڤاكێ دكارت گەلەك ب كێری هەوە بهێت. ژبەر وێ كو هون چ جاران نزانن كا دێ هەڤالێن هەوە یێن پاشتر كی بن. لەوما بزاڤێ بكن گەلەك هەڤالێن هەوە هەبن ئوو دوژمنێن هەوە هندك ئوو كێم بن.

---

(١) باژاروارى یا مایایی (Mayan Civilization) ئێك ژ باژاروارى یێن ئەمریكایی یێن خوەجهی یێن بەری چوونا ئەورووپاییان بۆ وێ پارزەمینێ (=ڤاررەیێ) بوویە. ئەو باژاروارى ل هەرێمێن باشوور ئوو رۆژهلاتا مەكزیكایا نها ئوو وەلاتێن ئەلیاڤادۆر ئوو هۆندوراسێ ئوو گواتیمالایێ بوو. گەلەك ئاڤاهی یێن مەزن، هەرەم، پەرستگەه ئوو شوونوارێن باژارێن مەزن ل پاش وان مانە.

د هەمی ڤۆناخێن ژیانێ دا تشتەکی ژبیر مەکن. کووراتی یا هەڤالینی یێن راستین گۆری هژمارا هەڤالان مەکن. ئەگەر هەوە ب سەدان دۆست ئوو هەڤال یێن بێ هەڤالینیەکا راستین هەبن بێ مفانە. ناسیار رەنگە ل دەما حەوجەداریێ پشتا خوە بکن مرۆڤی، لێ هەڤالەکێ راستین چ جاران ل دەما حەوجەداریێ هەوە ناهێلن. ژبەر وێ چاوا کۆ هون بزاڤێ دکن هژمارا هەڤالێن خوە زێدە بکن وەسا ژی بخەتبن هەڤالینی یێن هەوە راستین ئوو کوور بن.

شیرەتا سێێ ئەوە کۆ د هەر کارەکی دا ئێکدل ئوو گەرم بن. ئەگەر هون ل دەردۆرا خوە مێزە بکن، دێ پێ بحەسن کۆ هەر تشتەکێ ل دەردۆرا هەوە وەکی دەرسدێرەکی یە ئوو هەر دەر ژی وەکی دبستانەکێ یە کۆ هون دکارن لێ تشتان فێر ببن. ژبۆ میناك، دەما هون ل شەقامێ پیاسەیێ دکن، هون دکارن ژ نیشانێن ل سەر شەقامێ فێری ئەلفوبێ یا چینی ببن. د ڤیتارا بنئەرد ئان ئامانەیێ دا، ب خوە-مت-کرن ئوو خەوۆکی (= دل د خەو بوونێ) روونشتن نیشانا بێ برریاری ئوو کێمی یا ڤیانا هەوە یە. ئەگەر ڤیانا هەوە موکم بت، هون ل هەر دەرەکی بن دێ مرۆڤێن ئافرینەر بن. دەما هون ل باژاری سەفەرێ دکن، کتێبەکێ بخوینن ئان ب واکمەنەکێ (= مسەجلێن بچووك یێن بەریکێ) ل بەکرە یێن زمانێن بیانی گوهداری بکن.

شیرەتا چارێ ئەوە کۆ چ جاران بێ کتێب مەبن. کتێب ئانکۆ سەربهورێن نەراستووراستێن ژیانێ. ژبەر وێ کۆ ژی یێ مرۆڤەکێ ئەدەتی تێرا وەرگرتنا هەمی سەربهورێن راستووراست ناکت، ئەم دکارین ب رێ یا کتێبان ب ئاوایەکێ بەرفرەه ژ سەربهورا خەلکێ دی، ئانکۆ کتێبان، مفایێ ببینین، سەربهورێن وەسا کۆ رەنگە بل ژ کتێبان چ جاران تووش نەبین. هەلبەت سەربهورێن راستووراست گەلەك کەتواریتر ئانکۆ واقعیترن، لێ ژبەر کێماسی یێن کۆ مە بەهس کرن، دبێ گرنگیێ بدین سەربهورێن خەلکێ دی ژی. ئێك ژ باشترین رێ یێن وەرگرتنا سەربهورێن بەرفرەه ئوو نەراستووراست ڤەخویندنا کتێبانە.

ڤەخویندنا کتێبان دبێ وەکی پەیداکرنا هەڤالان بت، جۆربجۆر ئوو بەرفرەه. هەڤالێن جۆربجۆر بگرن ئوو وەسا ژی کتێبێن جۆربجۆر بخوینن. چاوا کۆ هەوە

هەڤالێن باش هەنە، وەسا ژی کتێبێن مفادار بخوینن. ڤەخویندنا سەرپێی یا کتێبێ وەکی هندێ یە کۆ هەوە گەلەك هەڤال هەبن، لێ چ ژ وان هەڤالێن درست نەبن.

ژبەر وێ پشتراست بکن کۆ ڤەخویندنا هەوە هوور ئوو کوورە. هەر کتێبەکێ وەسا بخوینن، هەر وەکی کۆ هەڤالەکێ گرنگ ئوو جهێ رێزێ یە. ڤەخویندنا سەرسەری ئوو سەرپێیی یا سەد کتێبان ژی بێورج ئوو بێمفایە، هەمی گاڤان کتێبەکا باش ئوو هەژی ژبۆ ڤەخویندنێ دگەل هەوە هەبت دا ل دەمێن بێشۆلییێ بخوینن.

بەهرا یازدەهێ

# هاریکارێن هەڤدو بین

ل رۆژەکا بارانی، ئاڤا رووبارەکی مێروویەك دگەل خوە بر، لێ ژ بەختێ بلند، کۆترەك ل وان نێزیکیان دفری ئوو ئەڤ بوویەر دیت. کۆتر ژبۆ مێروویێ خەمگین بوو ئوو پەلەکا دارێ هاڤێت سەر ئاڤێ ئوو ب ڤی رەنگی مێروو رزگار بوو.

هەیامەکێ پشتی هنگی، هەر ئەو کۆتر ل سەر تایێ دارەکێ روونشت بوو ئوو نکرۆسك دکرن. نێچیرڤانەکی ئەو دیت ئوو سێرە لێ گرت. مێروو ل وان دەران دەرباز دبوو، ژنشکێڤە چاڤێ وێ پێ کەڤت. مێروویێ گازەك ل پی یێ نێچیرڤانی گرت ئوو نێچیرڤانی ژبەر ئێشا پی یێ خوە دەست ب هاواران کر ئوو تڤەنگ ژ دەستان ڤەررەسیا. ئەو دەنگەدەنگ بوو سەدەما هندێ کۆتر ژ خەوێ هشیار ببت ئوو ژ وێدەرێ بفررت. ب ڤی ئاوایی، مێروویێ بەرسڤا چاکی یا کۆترێ دا.

چ کەسەك نینە کۆ حەوجەدارێ هاریکاری ئوو هەڤالینی یا کەسێن دی نەبت. کەس ژی نینە کۆ وەسا کێم بت ئوو هاریکاری یا خەلکێ دی نەکت. ئەم هەمی ڤەبەستی ئوو حەوجەدارێن هاریکاری یا هەڤدو نە. ئەڤ هەمی هندەك روخسارێن گرنگی یا تێکهلی یێن مرۆڤانن.

ل درێژاهی یا چالاکی یێن خوە ئەز گەلەك جاران گەهاڤێ گرنگی ئوو بهایێ ڤێ تێکهلێی بوومە. ژبۆ میناك، ل دەستپێکا چالاکی یێن "دێوو"یێ، مە هندەك بازار (= موعامله) دگەل "شەریکە یا بازرگانی یا دی" یا ئەندۆنیزیایێ هەبوون. هندی من ب بیر، وی چاخی مە هەر یاردەکا[1] پاتەیی ب بهایێ ٢٠ سەنتان دفرۆشتن وێ

(١) یارد (yard)، ئێك ژ یەکینێن درێژاهیێ یە. هەر یاردەك بەرانبەری سێ پێیان (foot) ئانکۆ ٠،٩١٤ مەترانە.

شـەریکەیێ. لـێ ژنـشکێڤە حوکمـەتا ئەنـدۆنیزیایێ هنـدەك مـەرج ژبـۆ کرینـا تـشتێن ژدەرڤە دانان کۆ بهایێ پاتە یێن مە هەتا دەھ سەنتان کـێم دکـر. ل گۆرە یـێ لهـەڤهاتنا درێژدەما مە دگەل شەریکەیا "دی"یێ، ئەو نەچار دبوون کۆ وان پاتەیان هەر ب بهـایێ بەرێ (گرانتر) ژ مە بکرن. ژبەر وێ من بزاڤ کر کۆ ب کێمکرنا کرینـا ژدەرڤـە، زیـان ئوو زەرەرا وێ شەریکەیێ کێم بکم، لـێ ب سـەر هنـدێ را ژی، شـەریکەیا "دی" تووشـی ئاریشە ئوو پرسـگرێکێن دارایـی بـوو. ئەگـەر ل دەمـەکا کـێم سـیھ هـزار دۆلار نـەدابان دراڤخانەیێ (= بانکێ)، دێ ژ لایێ دراڤخانەیێ ڤە بهاتبا موسادەرەکرن ئـوو دێ بکـەڤتبا بن دەستێ دراڤخانـەیێ. ژبـەر وێ، ئـەز ب خـوە چووم شـەریکە یـا وان ئـوو مـن دراڤـێ پێدڤی دا وان. وی چاخی سەرمایە یا شەریکە یـا مـە تـەنێ دەھ هـزار دۆلار بـوو، ژبـەر وێ دانـا سـیھ هـزار دۆلاران پارەیـەکێ گەلـەك مـەزن بـوو ئـوو برریـاردان گەلـەك ب زەهمەت دئێخست.

ل هـەیاما سـالەکێ، هـەمی تـشت ب ئاوایـەکێ نـەباوەرکری هـاتن گوهـاررتن. سـووکا کرینا-ژ-دەرڤە یا ئەنـدۆنیزیایێ دیـسا چـەلەنگ بـوو ئـوو بها یـێن پاتـەیی ب جـارەکێ هەتا ۳۷ سەنتان ژبۆ هەر یاردەکێ زێدە بوون. لهەڤهاتنا مە هێشتا ل سـەر بناغـە یـێ ۱۷ سەنتان بۆ هەر یاردەکێ بوو کۆ دبیا بوو شەریکەیا "دی" ب ئاوایەکێ ڤـانوونی پێگـری پێ کربا. لـێ وێ شـەریکەیێ گۆت کـۆ ئامـادە یـە پاتـەیی ب بهایێ ۳۵ سـەنتان، ئـانکۆ ۲ سەنتان ئەرزانتر ژ بهایێ سووکێ، ژ مە بکـرت. ب ڤـی ئـاوایی ژبـۆ پاتەیـەکێ ۱۷ سـەنتی مـە بهـایێ ۳۵ سـەنتان وەرگـرت ئـوو ل دوومـاهیێ ژی شـەریکە یـا مـە د وی بـازاری (= موعاملەیێ) دا ئێك ملیۆن دۆلار فاییدە کرن.

هون دبینن کۆ بەرسڤا وان سیھ هزار دۆلارێن کـۆ مـن ل دەراڤـێن تـەنگ دا دابـوون وێ شـەریکەیێ ب چ رەنگـی بـوو. هـون پـشتراست بـن کـۆ چ هاریکاریـەکا خـەلکی بـێ بەرسـڤ نابـت. رەنگـە هنـدەك جـاران بەرسـڤ نەگـەهت کەسـێ ڤـەنجیکار. لـێ ب هـەر ئاوایی بت، ئەو کەس دێ ب رەنگەکی ل جهەکی بەرسڤا وێ ڤەنجی یا خوە ببینت. ئـەڤ بنەمایێ ژیانێ ئوو هاریکاری یا خەلکی یە.

ئەگـەر هـون هـەمی گاڤـان د هـزرا بەرژەوەنـدی یـێن خـوە دا بـن ئـوو خـوە ژ هاریکاریکرنا خەلکی بپارێزن، رەنگـە هـون ژبـۆ هەیامـەکا کـورت سـەرکەڤتی بـن. لـێ د

درێژدەمیێ دا، دێ ڤەرێژا کریارێن خوە ببینن. ئەگەر هون د تێکهلی یێن خوە دگەل خەلکی دا تەنێ ل بەرژەوەندی یێن خوە بگەررن، هون رەوشەکا ترستژی ژبۆ خوە چێ دکن. هون دبێ ل سەر بنەمایێ بەرژەوەندی یێن هەڤپشك کاربکن. ئەگەر کەسەك د بازارەکی دا ب بهایێ زیاندیتنا کەسێ بەرانبەر هەمی فاییدەیێ ژبۆ خوە بخوازت، هنگی تێکهلی یێن وان گەلەك ڤەناکێشن.

ل "شەریکەیا دێوویێ" ئەم هەمی دەمان ل سەر وان سیاسەتان تەکەز دکین کۆ بەرژەوەندی ئوو فاییدە یێن هەڤپشك دپارێزن ئوو هەمی دەمان بزاڤێ دکین کۆ د بازاری دا کەسێ بەرانبەر ژی ب ڤاسی مە فاییدەیێ بکت. بزاڤا مە ئەوە کۆ هەمی تێبگەهن کۆ بازارکرنا دگەل "دێوو"یێ دێ فاییدەیێ بگەهینت وان. ئەڤ بنەما تێکهلی یێن کەسۆکی ژی ڤەدگرت. ئەگەر کەسەك بخوازت ب ئاوایەکێ نەدرست فاییدەیێ ژ کەسەکێ دی ببینت، تێکهلی یێن وان زووکا دڤەدن. ژبۆ ئاڤاکرنا تێکهلی یێن دوئالی پێدڤی یە هەردو ئالی دگەل ئێك ئێکرەنگ ئوو ئێکدل بن ئوو رەوش ئوو کاودانێن هەڤدو ل بەرچاڤ بگرن. تەنێ هۆسا ئەو تێکهلی دێ ژبۆ هەردو ئالیان مفادار ئوو فاییدەدێر بن.

تێکهلی یێن هەژی ئوو دلخواز ژ گرنگترین بابەتێن ژیانێ نە. چاوا کۆ مرۆڤ دکارت کەسەکی ب هەڤالێن وی بنیاست، وەسا ژی هون دکارن وی ب تێکهلی یێن وی دگەل خەلکی ژی بنیاسن. مەتەلا "هەر تەیرەك ئوو رەفا خوە" ژبۆ مرۆڤان ژی راستە. ژبەر وێ هون دبێ بزاڤێ بکن دگەل مرۆڤێن هەژی ئوو کێرهاتی هەڤالینی ئوو دۆستانیێ بکن. ئەگەر هون ل وان ئاریشەیان بفکرن یێن کۆ کەسێن رەڤی ل دەما تووشبوونا ب مرۆڤێن نەهەژی تووش دبێ، هنگی دێ ب گرنگی یا هەڤالینی یا هەڤالێن ئێکرەنگ بحەسن. ئەگەر هون هەڤالینی یا مرۆڤێن ئاست- بلند بکن، بێ کۆ هون پێ بحەسن، دێ زاری رێباز ئوو شێوازێن ڤان ڤەبکن ئوو ئەگەر هاتنووچوونا مرۆڤێن ئاست- نزم ژی بکن، دێ ل پەی سلووك ئوو ئیتالێن وان بچن.

ئەگەر هەوە تێکهلی یێن باش ئوو دۆستانە دگەل خەلکی هەبن، دێ د ژیانێ دا سەربکەڤن. تێکهلی یا دگەل مرۆڤێن دیار د ژیانێ دا گەلەك مفادارە، گەلەك ژ پارەیی ژی مفادارترە. ژبەر وێ کۆ تێکهلی یێن باش ئوو دۆستانە ب پارەیی ناهێن کررین ئوو

فرۆشتن. لێ تێکهلی یێن مرۆڤان چەند گرنگن، وەسا ژی دژوار ئوو تەڤلهەڤن. هەلبەت ئەڤ شرۆڤەیەکا وی بنەمایێ دی یێ ژیانێ یە کۆ دبێژت تشتێن باش یێن ژیانێ ساناهی بدەستڤە ناهێن.

ئێك ژ بابەتێن سەرەکی د تێکهلی یێن مرۆڤان دا باوەری-ب-هەڤ-هەبوونە. هەلبەت باوەری تشتەکە کۆ ب دەربازبوونا دەمێ بدەستڤە دهێت ئوو هون دبێ ژبۆ بدەستڤەئینانا وێ بێهنا خوە فرەھ بکن.

دەما من "شەریکەیا دێوویێ" دامەزراندی، ژبەر پێدڤیتیەکا دراڤی، دبیا من هندەك پارە ژ دراڤخانەیێ دەین کربا. لێ من چ پالپشت نەبوون ئوو چ کەس ژی ل دراڤخانەیێ بەرهەڤ نەدبوو پارەیی دەین بدت جوانەکێ تازەکارێ کۆ چاڤێن وی دبرسقین ئوو ل سەر پی یێن خوە راوەستیا بوو. باوەری یا دوئالی هێشتا چێ نەبوو بوو. ژبەر وێ، هەفتیێ دو جاران دچووم سەردانا سەرۆکێ دراڤخانەیێ ئوو من هوورهوورکێن بەرنامە یێن خوە ژبۆ وی شرۆڤە دکرن دا رازی ببت دەینەکی بدت من. ئەڤ رێ یا ئێکانە یا من بوو، وەسا دیار نەبوو کۆ دێ سەرکەڤتی بم.

هندەك جاران دبیا سپێدێ زوو چووبام مالا وی ئوو ل بەرسپێدە یێن سارێن زڤستانێ دەری یێ مالا وی بکوتم. د بەرسڤێ دا دهات گۆتن کۆ هێشتا ژ خەوێ هشیار نەبوویە.

ب نەچاری، د وێ سەقەما زڤستانێ دا، ڤەدلەرزیم ئوو ل بەندا وی دمام، هەتا ژ مالێ دەربکەڤتبا ئوو چووبا سەر کارێ خوە. پشتی دەربازبوونا سالەکێ، سەرۆکێ دراڤخانەیێ گەهشت هندێ کۆ ئەز جهێ باوەرێ مە. هەلبەت ئەڤ باوەری ئوو تێبینی پشتی دەربازبوونا دەمان ئوو ب بێهنفرەهی ئوو بێهندرێژیەکا زێدە بدەستڤە هات. هێشتا ئەز دگەل وی سەرۆکێ دراڤخانەیێ هەڤالینیەکا کوور ئوو بهادار دکم.

د بنکە یێن بازرگانی دا، هەبوونا کەسان گەلەك گرنگ ئوو بنگەهینە ئوو بەرچاڤبوون ئوو بەرنیاسبوونا کەسان سەنگا بازرگانیێ یە. ژبەر وێ کۆ کەس کاران دکن، نابت چ جاران بابەتێ کارمەندان پشتگوهڤە بهاڤێژن. کارمەند دکارت شەریکەیێ ژێهەل ببت ئوو ژێردا بئینت. ژبەر وێ گەلەك گرنگە کۆ هەڤالینی یا کەسێن ئاست-بلند بکن. هاریکاری یا کەسێن دی ژی بکن ئوو پشتراست بن کۆ رۆژەکێ دێ بەرسڤا ڤەنجی یێن خوە ببینن.

# پارە بدەستڤەئینان ئوو پارەمەزاختن

دەما بەهسا پارە بدەستڤەئینانێ دهێت کرن، ئەز هۆستایەکێ شەهرەزامە، ئەز دکارم ببم هەڤررکێ باشترین کەسێن جیهانێ کۆ پارەیی بدەستڤە دئینن.

ژبەر وێ کۆ هەما ژ دەستپێکا چالاکی یێن خوە ڤە، هەمی دەمان ناڤێ من ل سەرڤەیی رێزکا کەسێن پارەسازێن کۆەریێ بوویە ئوو ژبەر وێ کۆ ناڤێ من گەلەك جاران د رێزکا ناڤێن دامەزرینەرێن بنکەییێن پیشەسازی یێن ناڤدارێن جیهانێ دا بوویە، ئەز ڤان هەمیان نیشانا هێزا خوە د بدەستڤەئینانا پارەیی دا دبینم. ب گۆتنەکا سادەتر، ئەز دزانم چاوا پارەیی بدەستڤە بئینم.

ئەز بچم هەر دەرەکێ، هەما زوو ب خالێن ئەرینی ئوو شیانێن وێ دحەسم. من جارەکێ ب حەنەك ڤە گۆت کۆ زێر ژ ئاخێ مشەترە، ئەز تەنێ ب بێرك ئوو مەربێران دجەمینم. هەلبەت، هندەك جه هەنە کۆ زێرێ وان ژ ئاخێ مشەتر نینە. ئوو پارە پەیداکرن ژی کارەکێ هند ساناهی نینە. لێ ب هەر ئاوایی، بدەستڤەئینانا پارەیی کارکرنا دژوار ئوو زەهمەتی یێن زێدە دڤێن. من تەنێ ژبۆ نیشادانا شیانا خوە یا راستین د پەیداکرنا پارەیی دا ئەو حەنەك کربوو.

نیگارکارەکێ کۆ دچت دەرڤەیی باژاری دا ژ دیمەنێن وێدەرێ نیگاران بکێشت، ل وێدەرێ ل پەی دیمەن ئوو بابەتێن هەژی ئوو باش دگەررت. کەسێ کۆ ژ ماسیگرتنێ حەز دکت، هەمی گاڤان جهێ باشترین گۆمێن ئاڤێ ب بیردئینت. هەر ب ڤی ئاوایی ژی، دامەزرینەرێ بنکەیەکێ پیشەسازی بچت هەر دەرەکێ ل باشترین رێ یێن پەیداکرنا پارەیی ل وێدەرێ دگەررت. ژبەر وێ کۆ من شیانا پەیداکرنا پارەیی هەیە، هەر دەما بچم جهێن نوو، دگاڤێدا هزرێن بەرفرەه ئوو جۆربجۆر ل سەر باشترین پەرتالێن کۆ

مرۆڤ دکارت ل وێدەرێ بفرۆشت دهێن مەژی یێ مـن. ب ڤـێ شـیانا خـوە، ئـەز شـیامە گەلەك پارەیی کۆم بکم. لێ هێشتا ژی دبێ شیانەکا دی د خوە دا بپەروەرینم. ئەز هزر دکم ئـەڤ ئێـك ژ خـالێن لـەواز یـێن منـە. دەمـا بەهـسا پەیـداکرنێ ئـوو بدەسـتڤەئینانا پارەیی بهێت کرن ئەز شەهرەزایەکم، لێ دەما بەهسا مەزاختنا دراڤـی بکـن، هـەما هـەر ل سەر نەئاخڤن، ئەز ژ شەهرەزایان ژی شەهرەزاترم.

ئەز باوەرم کۆ گرنگ نینە کا چ کارەك بهێت کرن، گـرنگ ئـەوە کـۆ کەسـێن خـودان شیان کاری بکن. کەسێ کۆ شیانێن وەرزشـێ هەنـە، دبـێ ببـت وەرزشـڤان. زارۆ یـێن کـۆ شیانێن مووسیقایێ هەنـە، دبـێ ژبـۆ مووسـیقایێ بهـێن راهینـان. نەچـارکرنا زارۆیـەکێ خـودانێ شـیانێن مووسـیقایێ ل سـەر هنـدێ کـۆ ببـت ئەنـدازیارەکێ بـێ شـیان کـارەکێ بێ ورجە.

چاوا کۆ هندەك کەس خودان شیانن کۆ پارەیی بدەستڤە بئینن، هندەك ژی خـودان شـیانن کـۆ ب باشـی بمـەزێخن. ژبـەر وێ، دبـێ هـون رێیـێ بـدن مـرۆڤێن هۆسـا یـێن شەهرەزا کۆ دراڤێ هەوە د رێ یێن باش دا بمەزێخن ئوو بدن کـاری. وی چـاخی کـار ب ئاوایەکێ دلخواز ئوو هەژی ب رێڤە دچن. ئەگەر هون دراڤـی ل بـەر دەسـتێن کەسـەکی دابنن کۆ شیانێن مفاوەرگرتنا درسـت ژ دراڤـی نـەبن، هەیـە کـۆ ئـەو پـارە خـسار ببـت. هەلبەت من ژ دەردۆرا جیهانێ پارە کۆم نەکرنە کۆ ل خوە ئوو مالباتـا خـوە بمـەزێخم، ژبەر وێ کۆ من چ جاران "دێوو" ب ملکێ خوە نەزانی یە. ئەز تەنێ خوە شەهرەزایەکێ رێڤەبرنا وێ دبینـم. ب گۆتنەکا سادەتر، هەمی دراڤێ من بدەستڤەئینـایی یێ من نینـە. ئـەز هەسـت دکـم دراڤـێ بدەسـتەهاتی یـێ وان شـەهرەزایانە کـۆ شـیانێن پێـدڤی ژبـۆ مفاوەرگرتنا هەژی ژ وی دراڤی هەنە دا جڤاکا مە باشـتر ببـت. هـەر ژبـەر ڤـێ هەسـتێ بـوو کـۆ مـن "بنگـەهێ دێـوویێ" چـێکر. تێهنـدەرا مـن یـا سـەرەکی ژبـۆ دامەزرانـدنا "بنگـەهێ دێـوویێ" ب هـەمی مـالێ خـوە (٣٧ ملیـۆن دۆلار ل دەمـا دامەزرانـدنێ) بیرووباوەرێن من بـوون. ئـەز بـاوەرم کـۆ سـەرمایەدانان ئـوو ڤـەزەنجا وێ دبـێ د رێ یـا باشترکرنا رەوشا جڤاکێ دا بهێت مەزاختن. رەنگە ئەز هەرگاڤ دبن باندۆرا هزروویرێن دایکا خوە دا بم، فەلەیەکا زاهد، ب تێگەهشتنەکا کوور ژ فەلسەفە یـا خزمـەتکرنێ ئـوو

خوەگۆریکرنێ. ئەز دفکرم کۆ تشتێن دایکا من ل دەما زارۆکتی یا من فێری من کری، د رە ئوو ریشالێن من دا جهێ خوە ڤەکری یە.

ب هەر ئاوایی بت، ئەڤ "رێبازا ڤەگەررانـدنا قـەزەنجا بنگـەهان بـۆ جڤـاکێ" رێبـازا "دێوو"یێ یە ئوو ب دیتنا من رامانا درست یا بکارئینانا دراڤی ژی هەر ئەڤە. گـرنگترین چالاکی یێن بنگەهی ئـەڤن: لێکـۆلینێن زانـستی د زانـستێن بنگـەهین دا ئـوو بـەلاڤکرنا ئاکامێن وان لێکۆلینان ئـوو هاریکاریکرنـا پێـشکەڤتنا زانـستێن بنگـەهین کـۆ بناغـە یـێ هەمی زانست ئوو تەکنۆلۆجیایێ نـە. مخـابن کـۆ ل کـۆرەیێ گەلـەك پووتـەی نـادن وان. ئەز ب خوە هیچ مایێ خوە دکارێن بنگەهێ دا ناکم. بنگەهـ ب خوە کارێن خوە ب رێڤە دبت ئوو کەسێن ناڤ بنگـەهی ژبـۆ مفاوەرگرتنـا ئاقلانـە ئـوو هـەژی ژ دراڤـی ژ مـن ژی خودان شیانترن.

ب سەر ڤێ را، دەهـ سالن کۆ بنگەهـ بەرنامە یێن هاریکاری یـێن پزیـشکی ل گـزرتێن (= جەزیرەیێن) دوورەدەست ئوو پەراڤێن (= ساحلێن) کۆرەیێ، دەڤەرێن مینا "مـۆژۆ"، "واندۆ"، "شیننان" ئوو "چیندوو" برێڤە دبت. پزیشکێن کـۆ دهـێن شـاندن هاریکـاری یا باشترکرنا ساخلەمی یا خەلکێ وان دەڤەران دکن کۆ ژ ئالی یێ جۆتکاری ئوو چاندنێ ئوو ماسیگرتنێ ڤە خوەگۆریکرنێن مەزن دکن. ل وان دەڤەرێن بـێ پـار ژ ئیمکانـان، کـۆ ژ کاروانێ ژیانا جڤاکا کۆرەیێ ڤەمانە، فێرکرنا جوانان ئێك ژ تـشتێن پـرر ئاریـشە ئـوو ئاستەنگە. بجهئینانا ئەرکی ل وان دەران بێ هەستا بەرپرسیاری ئوو خوەتەرخانکرنەکا راستین چێ نابت. خوەگۆریکرنا وان کەسان هنگی بەرچاڤتر دبت کـۆ ئـەم پـێ بحەسـین ئەگەر وان کەسان ل باژاران ئان ل نهێررینگەهێن (= عیادە یێن) خوە یێن تایبەتی کـار کربا دا داهاتەکێ چەند مەزن هەبت. ئەز گەلەك حەز دکم کۆ هـژمارا پزیـشکان ل وان دەڤەران زێدە بکم، لێ پزیشکێن کۆ ئامادە بـن ل وان دەڤـەران کـار بکـن گەلـەك کـێمن. ژبـەر وێ مـە پرۆژەیـەك هەیـە کـۆ ژ خـەلکێ وان دەڤـەران جـوانێن خـودان شـیان کـۆ هەستا بەرپرسیارێی هەبت ل سەر حسابا "بنگەهێ دێوویێ" ژبۆ خویندنێ هلببـژێرین دا پشتی داویکرنا خویندنا خوە ڤەبگەررن گونـد ئـوو بـاژارێن خـوە. ب سـەر هنـدێ را، "بنگـــەهێ دێـــوویێ" هاریکـــاری یـــا دراڤـــی یـــا دبـــستانان ژ ئاســـتێ زارۆکبەخـــچەیێ (= رەوزەیێ) هەتا بەرهەڤی ئانکۆ پاش ناڤنجیێ، هـەر وەسـا، بنکـە یـێن فێرکرنـێ یـێن

"ئاکیو" جهێ دامەزراندنا کارخانە یێن گەمیسازی یا "دێوو"یێ ئـوو زانینگـەها "ئـازۆ" ل "زۆدانێ" ژی دکت. هەر وەسا ژ سـالا ١٩٨٧ێ وەرە، "بنگـەهێ دێـوویێ" پـەیامهنێرێن کۆ مەرجێن تایبەتی هەبن ژبـۆ خوینـدنێ دشـینت دەرڤـەیی وەلاتـی ئـوو پـشتەڤانی یـا وەشانێن لێکۆلینی دکت. ئەڤ بزاڤ هەمی ژبۆ وان کەسانن کۆ دێ ل پاشـەرۆژێ هـش ئـوو هزرێن تەڤانە یێن خەلکی ل بن باندۆرا وان بـت. ئـەڤ دەلیڤـە ژبـۆ هنـدێ نـە کـۆ ئـەو بکارن خویندنا خوە بەردەوام بکن ئوو ئاسۆ یێن بەرفرەهتر ل بەر خوە ببینن.

رەنگە هون ڤان ئاخڤتنان ب خوەپەسندان تێبگەهن. کارێن ڤەنج هنگـی جـوان ئـوو پەژراندی نە کۆ ب ئاوایەکێ نەپەنی بهێن کـرن. رەنگـە گەلـەك درست نـەبت کـۆ ئـەز هەما راستووراست بەهسا خێرخوازی ئوو ڤەنجی یـا "دێـوو"یـێ ژبـۆ هـەوە بکـم. رەنگـە هون ئاخڤتنێن من شاش بفامن. من ئەڤ بابەت ژبەر خوەهلکێشان ئـان پەسـنکرنا خـوە ڤەنەگێرایە، ئارمانجا من ئەوە کۆ ببێژم هەمی گاڤان د هزرا پـارە جەمانـدنێ دا نـەبن. ئەگەر ئەز بکارم ڤێ خالێ بگەهینم هەوە، دێ گەلەك رازی ئوو کێفخوەش بم. هـەردەم بـاوەری یـا مـن ئـەو بـوو کـۆ بکارئینانـا ژیرانـە ئـوو ئاقلانـە یـا دراڤـی گەلـەك ژ بدەستڤەئینانا دراڤی گرنگترە.

بێگومـان هنـدەك ژ هـەوە دخـوازن وەکـی مـن بـبن دامەزرینـەرێن بنکـە یـێن پیـشەسازی. ئـەز ب پێـر برریـارێن هۆسـا ڤـەدهێم. هـون دبـێ ب تڤـاڤی د وارێ بدەستڤەئینانا دراڤی دا شەهرەزا ببن. گرنگ نینە کا هـون کیڤـە دچـن ئـوو دگـەل کـی رووەدنن، هەمی گاڤان ل پەی پارەیی بن. مەرەما من ئەوە کۆ ب هووری ل دەردۆرا خـوە بنهێررن، پارە دێ ل بەرچاڤێن هەوە پەیدا ببت.

لێ پشتراست ببن کۆ دامەزرینەرێ بنکەیەکێ پیشەسازیێ کەسەك نینـە کـۆ تـەنێ د هزرا کۆمکرنا پارەیی ژبۆ خوە دا بت. دبێ هون وەسا پارەیی کۆم بکن کـۆ بـزانن دێ ب چ رێیەکا هەژی بمەزێخن. ئەگەر هون ل کرینـا تـشتێن نەپێـدڤی ئـوو زررکرنـا دراڤـی بفکرن، هنگی هون ئەوڤاس ژێهاتی نینە کۆ ببن دامەزرینەرێ بنکەیەکێ پیشەسازی.

ئەگەر هون تـەنێ ژبـۆ تێرکرنـا تـەماعا خـوە بازرگـانییێ بکـن، هـون گەلـەك شاشـن. هندەك کەس ژبەر وێ رەخنەیێ ل دامەزرینـەرێن بنکـەیێن پیـشەسازی نـاکن کـۆ تێـرا خوە دراڤی بدەستڤەنائینن ئـان بێڤـام زێـدە پـارەیی بدەسـتڤەدئینن. ئـەو رەخنـەیان ژ

هندێ دگرن كۆ رێ یێن درست یێن بكارئینان ئوو مـەزاختنا پـارەیی نـزانن. ب كـورتی، بكارئینانا ژیرانه ئوو ئاقلانه یا دراڤی گەلەك ژ بدەستڤەئینانا دراڤی گرنگترە.

ئەگەر هەوە شیانێن پێدڤی ژبۆ بكارئینانا پارەیی نەبن، هنگی پـارەیی بـدن دەسـتێ كەسێن وەسا كۆ ئەو شیان هـەبن. ئـەڤ ژی گەلـەك زەحمـەت نینـە. هنگـی زەحمەتـە كـۆ هون بنكەیێ كاروەریێ ئـان دراڤـێ كـۆ ژ رێ یـا وێ بدەسـتڤە دهێـت، تـەنێ ملكـێ خـوە بزانن. لێ ئەگەر هون د خەما مالێ دنیـایێ دا نـەبن ئـوو ب هـووری لـێ مێـزە بكـن دێ ببینن كۆ هندەك كەسان شیانێن بدەستڤەئینانا پارەیی هەنە ئوو هندەكان ژی شـیانێن مەزاختنێ. هنگی هون دێ گەلەك ساناهیتر بشێن ڤـێ بـیردۆزا مـن بجـه بئیـنن. ئەگـەر هەوە شیانێن بدەستڤەئینانا دراڤی هەبن، ل پەی پارە جەماندنێ هەرن ئوو رێیێ بـدن كەسێن دی یێن خودان شیانتر وی دراڤی ژبۆ باشتركرنا رەوشا جڤاكێ بمـەزێخن. هنگـی دێ جیهان ببت جهەكێ باشتر ئوو ئاشتیخوازانەتر.

### بەهرا سێزدەهێ

# تۆلڤەکرن

مرۆڤ نکارت ب ئاوایەکێ خوەڤەدەرکری ئوو تەنێ بژیت.

هەر کەسەك پارەچەیەکێ ژ جڤاکێ پێك دئینت. کتەکەس حەوجەدارێن هەڤن. مرۆڤ جڤاکێ چێ دکن ئوو جڤاك ژی مرۆڤان. جڤاکزانێن ئەمریکایی "پیتەر" ئوو "بریجیتا بێرگەر"[1] د کتێبا جڤاکزانستی یا ناڤدارا خوە دا "سەرهاتی یا تیتالێن تێکهلیێ" ل سەر ڤۆناخێن جداجدا یێن جڤاکیبوونا کتەکەسی دئاخڤن. ئەو باوەرن کۆ ژینەنیگارا هەر کەسەکی ڤەگێرانا تێکهلی یێن وی دگەل خەلکێ دی یە. جڤاکیبوون دەرفەتێ ددت کتەکەسی کۆ دگەل کتەکەسێن دی تێکهلی ئوو دانووستانان بکت ئوو هێدی هێدی وان تێکهلیان بۆ ئاستا جڤاکێ هەمیێ بەرفرەھ بکت.

ژبەر ڤەبەستیبوون ئوو حەوجەداری یا مرۆڤان ب هەڤدو ڤە، ئەم دگەل هەڤدو دژین. ژبەر وێ ئەم هەمی ل پەی تێگەها ڤەبەستن ئوو گرێدانێ نە هەتا ل گۆرە یێ وان تێگەهان شێواز ئوو رێبازا ژیانا خوە ڤەببینین. تێگەھ ئوو رامانا راستین یا ژیانێ د مرۆڤدۆستیێ دا دهێت ڤەدیتن، نە د خوەپەرێسی ئوو خوەمەزنکرنێ دا. لێ ژبەر وێ کۆ هندەك کەس دفکرن کۆ تەنێ وان ماڤ ژیانەکا باش هەیە، هندەك جڤاك ژبەر ڤان هزرێن خوەپەرێسانە تووشی ئاریشەیان دبن. ئەگەر هون هەما پچەکێ خەمێ ل چارەنڤیسا خەلکێ دی بخوەرن، چ جاران کررین ئوو فرۆشتنا کەرستە یێن موخەددەر ناکن، ئان کەرستە یێن زیانتژی ئوو مەترسیتژی ژبۆ چێکرنا زادی بکارنائینن. ئەگەر

---

(١) پیتەرێ بێرگر (Peter L. Berger) (١٩٢٩- ) جڤاکزانستڤان ئوو دیناسەکێ ناڤدارێ نەمسایی-ئەمەریکایی یە کۆ نڤیسینێن وی ل سەر پێڤەنی ئوو تێکهلی یا کتەکەس ئوو جڤاکێ جهێ پووتەپێکرنەکا زێدە نە.

هون تەنێ خەمەکێ ل هندێ بخوەرن کۆ د هندەك خانى يێن گەلەك بچووك دا سێ نفش دگەل هەڤ دژين، چ جاران چاكيت ئان پالتۆيەكێ چەرمى ناكرن ئان چ جاران نابن دەلالێ ئەرد ئوو خانيان. رفتارێن هۆسا نيشانا پووتەنەكرنا مرۆڤان ب هەڤسى ئوو جيرانانە. گەلەك كرێت ئوو فهێتە كۆ هندەك كەس ب كەسابەتێن هۆسا دژين. "تويين بى"[1] ديرۆكزانێ ناڤدار، ئاگەهدارێ خوەمەزنكرنا گەوهەرين ئوو بێبنا مرۆڤان بوو. ئەو باوەربوو كۆ رێ يا رزگارى يا مرۆڤان سەركەفتنا ب سەر هەوا ئوو هەوەسانە.

نە گرنگە كا هون چ دكن، نابت هون بكەڤن داڤا خوەپەرێسيێ. دبێ پێنگاڤەكێ ژ تەماعا كەسۆكى وێڤەتر بچن ئوو ل بەرژەوەندى ئوو خێرا جڤاكێ بفكرن. چ جاران ژبير مەكن كۆ هون ب تەنێ نينە ئوو هون لبەر سێبەرا خەلكێ دى دژين. هون وەكى كتەكەسەكێ ناڤ جڤاكێ ڤەبەستى ئوو گرێدايى يێ كەسێن دى نە. گەلەك ژ ڤان ڤەبەستيبوونان رەنگە هەر ب هزرا هەوە ژى نەهێن. دگەل-هەڤ-ژيان ژ ل-نك-هەڤ-ژيانێ مەزنترە. دگەل-هەڤ-ژيان وەرار ئوو پێشكەڤتنەكا دوئالى يە كۆ ئەز ناڤ لێ دكم "بهەڤرا وەراركرن". ئەڤ بناغەيێ فەلسەفە يا من د دامەزراندنا "دێوو"يێ دا يە.

دامەزرايى ژى وەكى كتەكەسان نابت ژبۆ بەرژەوەندى يێن خوە زيانێ بگەهين يێن دى. هەلبەت بناغەيێ چالاكى يێن دامەزرايى يێن دۆزەنا سەرمايەدارى تەنێ بدەستڤەئينانا فاييدە ئوو قەزەنجانە ئوو كەس نكارت ڤێ ماندەل بكت. لێ هەر د وێ دەمێ دا، دامەزرايى نابت تەنێ د هزرا بدەستڤەئينانا فاييدە يێن خوە ئان ژ هۆلێ راكرنا هەڤرركان دا بن. ب گۆتنەكا دى، دامەزرايى دبێ ژبۆ باشتركرنا ژينفرەهى يا جڤاكێ ئوو تەڤايى يا خەلكى بخەتبن. چاوا كۆ كتەكەسان ئەرك ئوو بەرپرسياريتى د راستا جڤاكا خوە دا هەنە، وەسا ژى دامەزرايييان د راستا جڤاكێ ئوو خەلكى دا ئەرك ئوو بەرپرسياريتى هەنە. ژبەر وێ كۆ دامەزرايى ژ جڤاكان بوونە ئوو پشكەك ژ وانن.

---

(١) ئارنۆلدێ جۆزێفێ تويين بى (Arnold Joseph Toynbee) (١٨٨٩–١٩٧٥) ديرۆكزانێ ناڤدارێ بريتانيايى ب كتێبا مەزن يا ١٢ جلدى يا خوە ب ناڤێ "خويندنەكا ديرۆكێ" كۆ ب ئاوايەكێ گشتى ل سەر سەرهلدان ئوو هەرفيانا باژاروارى (شارستانيەت) يێن جيهانێ لێكۆلينێ دكت، ناڤێ خوە ل جيهانێ نەمر كر.

دەما دامەزرياییی دگەل شەریکە ئان وەلاتێن بیانی بازاری دکن، ئەڤ بنەما تێکهلی یێن بازرگانی ژی ڤەدگرتن. د بازاران ئەوو پشکداری یێن وەسا ژی دا، دامەزریایی دبیّ ل سەر بناغەییّ ژێنفرەهی یا هەمی ئالیان ئەوو ب هووری بخەتبن. تەنیّ خەبتینا ژبۆ فاییدە ئەوو قەزەنجیّ، قەزەنجێن دەمکورت ب خوە را دئینت ئەوو ل دەمەکیّ درێژ ب کێری هەوە ناهێت. ژبەر ویّ کۆ شەریکە یێن دی هێدی هێدی خوە ژ بازارکرنا دگەل هەوە ڤەدکێشن. تێکهلی ئەوو دانووستان دیّ بلەز ڤود ببن ئەوو ل دووماهییّ ژی دیّ هون خوسارەت بن. ئەز د بازارکرنیّ دا دخوازم کۆ ئەو ئالی یێن بازاری دگەل مە دکن ژی ب قاسی مە ژ پرۆژەیێن هەڤپشك مفاییّ ببینن. تەنیّ ب ڤی ئاوایی ئەم دکارین تێکهلی یێن هەڤپشك یێن مفادار ئەوو درێژدەم چیّ بکین. ژبەر ویّ گەلەك گرنگە کۆ ئەم کارەکیّ وەسا بکین شەریکە یێن دی بفامن کۆ بازارکرنا دگەل مە فاییدەیی دگەهینت وان. ئەم هەرگاڤ پێگرێن ڤی بنەمایی بوونە ئەوو هەنە. ئەز باوەرم کۆ ل سەر ڤی بنەمایی شەریکەیا "دێوو"یێ شیایە سەرمایەدانانەکا هەڤپشك ئەوو بەرچاڤ دگەل بنکە یێن بیانی بکت. ئەڤ بنەما پەیمانکاری (= موقاوەلات، قونترات) یێن نەسەرەکی ژی ڤەدگرت. د هەمی پرۆژەیان دا ئەم مەزاختنان ئەوو فاییدە یێن پێشبینیکری د بەرسینین (= دخەمنینین، تەخمین دکین) ئەوو شرۆڤەدکین ئەوو پاشی مسۆگەر دکین کۆ پەیمانکار ژی د فاییدەییّ دا هەڤپشکە. ب ل بەر چاڤگرتنا ڤان هەمی بنەمایان، هون دبیّ مسۆگەر بکن ژی کۆ هون ب خوە زیانیّ نابینن. چاوا کۆ هون د هزرا فاییدە یا ئالی ییّ بەرانبەر دا نە، وەسا ژی ئەو دبیّ د هزرا فاییدە یا هەوە دا بن. ل دەما بجهکرنا پرۆژە یا ئامیرێن شرینکرنا ئاڤا کەنداڤا "پرودهو"ییّ ل ئەلاسکاییّ، شەریکەیا "دێوو"ییّ رووبروویی ڤیّ ئاریشەییّ بوو.

کار ژ ئالی ییّ شەریکە یا ناڤدارا ئەمریکایی "بەك تێلیّ"[1]، ژبەر تەکنۆلۆجیا یا پێشکەڤتی یا ویّ، ژ مە هات خوەستن. لیّ پشتی بریارا وەرگرتنا پرۆژەییّ، ویّ

(١) بەکتێل (Bechtel Corporation) مەزنترین شەریکەیا ئەندازیارییّ ل ئەمریکاییّ ئەوو شەریکەیا کەسۆکی یا نەحوکمەتی یا نەهیّ ل وی وەلاتی. ڤیّ شەریکەییّ زێدەتر ژ چل هزار کارمەندان هەنە کۆ ل زێدەتر ژ ٥٠ وەلاتێن جیهانیّ پرۆژەیان برێڤەدبن. داهاتا سالانەیا بەکتێلیّ ل سالا ٢٠٠٤یّ نێزیکی ٢١ ملیار دۆلارێن ئەمریکایی بوون.

شـەریکەیێ دەسـت ب گوهارتنـا مـەرجێن پـەیمانێ کـر ئـوو هـەمی گوهـاررتن ب زیانـا شەریکەیا مە بوون. ب سـەر هنـدێ را، وێ شـەریکەیێ مـاڤێ هنـدێ ددا خـوە کـۆ ل هـەر قۆناخـەکا پرۆژەیـێ کـۆ بخوازت لهـەڤهاتنێ فـوت بکـت ئـان بجهکرنـا وێ دەرەنـگ بکـت. مەرجەکێ نوو ژی ل لهەڤهاتنێ زێدەکر کۆ دانا پارەیی هەتا دووماهیهاتنا پرۆژەیـێ ئـوو هەلسەنگاندنا وێ پاشڤە دئێخست.

ئەڤ هەمی ب نهێررینا من تشتێن وها بوون کۆ نەدهاتن پەژراندن. ئەز ب بنـەمایێ ئێکـسانی، ئینـساف ئـوو بەرژەوەنـدی یـێن هـەردو ئالیـان بـاوەربووم. هـون دبـێ هـەر رێککەڤتن ئوو لهەڤهاتنەکێ ل سەر بناغەیێ پشکداری یا ئێکسان ئوو وەکهەڤ چێ بکن. ل ئالیەکێ دی، ژبەر زەهمەتی یێن زەهڤێن کـۆ مـن ژبـۆ ئیمزاکرنـا وێ لهـەڤهاتنێ دیـت بوون، ئەز ئامـادە نـەبووم کـۆ وێ ب سـاناهی ونـدا بکـم. ژبـەر وێ ئـەز چـووم سـەردانا سەرۆکێ شەریکە یا "بەك تێل"ێ ئوو من ئاریشە ژبۆ بەهس کر. من گۆت وی کـۆ دبـێ لهەڤهاتن ئینسافکارانە بن ئوو شەریکە یا "دێوو"یێ ل سەر وی بنەمایی کار دکت. مـن ژ وی پرسـی کـا شـێوازا ئـەدەتی ل ئـەمریکایێ وەسـا یـە؟ ئەشـکرا یـە کـۆ وەکـی پێـدڤی نەکەڤت بن باندۆرا من. لێ ب هەر ئاوایی، من ب بیرا وی ئینا کۆ ژبەر نـەقانوونیبوونا مـەرجێن لهـەڤهاتنێ، ئـەز ئێـدی پرۆژەیـێ نـادوومینم. هەلبـەت ل داویـێ ئـەز شـیام لهەڤهاتنەکا ب ئینساف دگەل وێ شەریکەیێ چێ بکم ئوو بەری دەسـتپێبوونا پرۆژەیێ، پارە یێ زەهف ژی ژبۆ شەریکە یا "دێوو"یێ وەربگرم.

بنەمایێ رێزگرتنا هەڤپشك ئوو کریارێن بەرانبەر نە تەنێ د تێکهلی یـێن کـاروەری دا، لـێ د تێکهلـی یـێن مرۆڤـی دا ژی گەلـەك گـرنگ ئـوو بنگـەهینن. هـون دبـێ ژبـۆ بەرژەوەنـدی یـێن هـەر دو ئالیـان بخـەتبن. دەمـا شـەریکەیەك ب بهـایێ زەرەر ئـوو زیاندیتنا شەریکەیەکا دی فاییدەیێ بکت، جڤاك تووشی سەرئێش ئوو ئاریشەیان دبت. بنەما یێ رێزگرتنا هەڤپشك، ئینسافپەروەری ئوو تـشتێن وهـا تێکهلـی یـێن کـاردار ئـوو کارکەر، فرۆشتنکار ئوو بکـرر، دەرسـدێر ئـوو شـاگرد، دایبـاب ئـوو زارۆان ژی ڤـەدگرت. ئەڤ نژارێ (= ستروکچەرێ) درست یێ جڤاکەکا ساخلەمە. خـەلکی دبـێ بـاوەری ب هـەڤ هەبت. ئێك ژ نەسـاخی یـێن ئـەڤرۆ یـێن جڤاکـا کـۆرەیێ بـەدگومانی یـێن دوئـالی یـێن حوکمەت ئوو خەلکی، کارداران ئـوو کارکـەران، دەرسـدێران ئـوو شـاگردان ئـوو دایبابـان

ئوو زارۆانە. دەما خەلك ل هەڤ گوماندار ئوو بێباوەر بن، لهەڤ ناهێن ئوو دەما ل هەڤ نەهێن دێ هزرێن خراب ل هەڤ بکن. دیارۆکێن وها د جڤاکێ دا وەکی ئاڤ-زڤرکێن مەترسیدار ئوو کوژەکن ئوو رەڤینا ژ وان گەلەك زەهمەتە.

چەند سالان بەری نها، ل دەما ڤەخویندنا ئاکامێن لێکۆلینەکا گشتی، ئەز پێ حەسیام کۆ زێدەتر ژ نیڤی یا کارکەرێن کۆ پرسیار ژێ هاتبوون کرن، باوەری ب شەریکە یێن خوە نەبوو. ئەگەر ئەڤ لێکۆلین ئەڤرۆ بهێت دوبارەکرن، مەرجێ دگەل هەوە دکم کۆ رێژە یا بەرسڤێن نەدلخواز دێ ژ وێ ژی زێدەتر بت. ئێك ژ ئاریشە یێن مەزنێن دی یێن جڤاکا مە پەڤچوونێن ناڤبەرا کارمەندان ب خوە نە. دبێژن کۆ ئەڤ پەڤچوون ژبەر نەدادوەرانەبوونا رفتارێن ل جهێ کاری نە. لێ ئەز باوەرم کۆ نەبوونا باوەریێ سەدەما سەرەکی یا وان ئاریشەیانە. ئەگەر خەلك باوەریێ ب هەڤدو نەکن، چاوا ئەم دکارین چاڤەرێ بین کۆ ل هەڤ بهێن. دەما د ژیانا مالباتی دا ژی باوەری یا ب هەڤدو نەمینت، ئەنجاما وێ چ یە؟

دناڤبەرا نەبووناباوەریێ ئوو خوەپەرێسیێ دا تێکهلیەکا گەلەك نێزیك هەیە. ژبەر وێ کۆ ئەم ل چاخەکێ تژی ئالۆزی ئوو گەنگەشە دژین، لەوما بێ کۆ ئەم ب خوە پێ بحەسین ئوو گەلەك ب ساناهی، مومکنە تووشی نەساخی یا کرێت ئوو شەرمزارانە یا خوەپەرێسی ئوو نەبووناباوەریێ ببین. کەس نزانت کا دێ سبەهی چ بقەومت، لەوما خەلك زێدەتر ل پەی رەهەتی ئوو خوەشی یا خوە ئوو مالباتێن خوە نە ئوو ئەڤ ڤەرێژا خوەرسکی یا ڤی هەوایێ خوەپەرێسانە یێ جڤاکێ یە. ئەگەر باوەری یا هەوە ب هەڤدو بهێت، چ تشتەك نکارت بەراهی یا هەڤ-فامین (= هەڤدو فێم کرن) ئوو لهەڤهاتنا هەوە بگرت. لێ بەرڤاژی وێ، ل کاودانێن تژی بەدگومانی ئوو باوەری-ب-هەڤ-نەبوونێ، هەڤ-فامین ئوو لهەڤهاتن هەر مومکن نینە. بەدگومانی ئوو هزرێن خراب د ژیانا مالباتی ئوو ژن-ئوو-شووان دا ژی دکارت بەخترەشی یا مالباتێ ب دوو خوە را بئینت. بەدگومانی دۆستینی ئوو هەڤالینیان ژی ب دووماهی دئینت. بەدگومانی یا رێڤەبەریێ ئوو کارمەندان ب هەڤدو شەریکەیان هلدوەشینت. دەما باوەری یا حوکمەتێ ئوو خەلکی ب هەڤ نەهێت، خەلك دێ تووشی ئاریشەیان ئوو ئالۆزیان ببن. ژبەر وێ، ئەم دبێ ژبۆ بەرژەوەندی یێن خوە ئوو یێن جڤاکێ ب هەڤ باوەرببین. هون نابێ ژ خەلکی

بخـوازن کـۆ ب ئاوایـەکێ ئێکئالیانـە بـاوەریێ ب هـەوە بکـن. هـون ب خـوە دبـێ بـبن دەستپێکەر ئـوو پێشەنگ. دەما هـون جوان ژبـۆ پاشـەرۆژا خـوە بەرنامـەیێ دادرێـژن، هیڤیدارم کۆ ڤی بابەتی ژبیر نـەکن. بئیـنن بەرچاڤێن خـوە کـۆ هـون نکارن د تـەنێتی ئوو خوەڤەدەرکرنێ دا بژین. مرۆڤ ژبـۆ ژیانێ حەوجەدارێ هەڤن ئـوو بوونـا وان هـەما تێکهلی یێن وان دگەل هەڤدو نە. هیڤیدارم کۆ هون نەکەڤن ئاڤ-زڤرکا خوەپەرێسی ئوو خـوە مـەزنکرنێ. ب هـەڤ بـاوەربن ئـوو هـەردەم د هـزرا هـەڤ دا بـن. هنگـی دێ هـون دامەزرینەرێن جیهانەکا ب رەوش ئوو سپەهی ئوو بەدەو بن.

**بەهرا ئێکێ**

# جیهانەکا بەرفرەھ ل پێش مە یە

ئەز گەلەك حەز دکم کارەکی دەست پێ بکم، ژ وان کەسانم کۆ نکارن دەمەکا درێژ بێ لڤ بمینن. ئەز هۆگرەکێ درست ئوو تڤاڤێ کاری مە. مەزنترین ئاریشە یا من بێ کاری ئوو بێ شۆلی یە. بێهندان ژبۆ من جۆرەیەکێ رەنج ئوو شکەنجەیێ یە. ژبەر وێ هەردەم ئەز مژوولی کار ئوو چالاکیانم.

ژبەر وێ، ئەز گەلەك ژ وان جوانان حەز دکم کۆ هەرگاڤ د خەبات ئوو لەباتێ دا نە. رەنگە پارەك ژ ڤێ حەزکرنێ ژبەر وێ بت کۆ ئەز وان وکی خوە دبینم. لێ ژ هەمییێ گرنگتر، ئەز باوەرم کۆ جوان دکارن ئاسۆ یێن نوو د دیرۆکێ دا ئوو د جیهانێ دا ڤەبکن.

دەستپێکرنا کارەکی ئوو پاشتر هێلانا وی کاری ژبۆ من چ بها نینە. لەوما، ئەز ژ وان جوانان حەز دکم کۆ هەما کارەکی دەست پێ ناکن ئوو هەما هند. ئەز ژ وان حەزدکم کۆ د وی کاری دا نقووم دبن. ژبەر ڤێ ئێکێ، تێکهلی ئوو خوەماندیکرن ئوو کۆلنەدانا مەزن شانسێ سەرنەکەڤتنێ ئوو نەگەهشتنا ب ئارمانجان گەلەك کێم دکت. مرۆڤێن وها رەنگە تووشی گەلەك سەرنەکەڤتنان ئوو شکەستنێن گەلەك ئاسایی بووبن ئوو ئەو وەکی پشکەك ژ سەربهور ئوو تەجربیە یێن خوە حەسباند بن ئوو، ژ هەمییێ ژی گرنگتر، چ جاران بێئومێد نابن. ئەگەر هون ژی ب ڤی ئاوایی وێرەك ئوو مێرخاسن ئوو دوێرن بەرسینگا شکەستنێ بگرن، هون ژی بەر ب سەرکەڤتنێ پێنگاڤان رادنێن. کەسێ کۆ ژ شکەستنێ ئوو خەباتێ بترست، چ جاران بێهنا سەرکەڤتنێ ناکت.

ل دەرڤە جیهانەکا مەزن ل بەندا هەوە یە ئوو گەلەك کار هەنە کۆ هون دبێ بکن. هون دبێ ل ڤالاهی یێن نوو بگەرن کۆ بەری نها پێنگاڤێن چ کەسەکی نەگەهشت بن

وان دەران ئوو كارەكێ وەسا بكن كۆ هەتا نها چ كەسەكی نەكربت. دیرۆك پێنگاڤ ب پێنگاڤ ب دەستێ وان مرۆڤان هاتی یە ئاڤاكرن كۆ وەسا فكرینە. پێشەنگێن درست ئەڤن. هەلبەت پێشەنگیێ هندەك مەترسی یێن خوە هەنە كۆ كەس نكارت خوە ژێ بپارێزت.

پێشەنگ هەرگاڤ د كەرخ ئوو رێ یێن نەشەڤاندی ئوو پرر ژ كەند-ئوو-لەند دا دمەشن ئوو رەنگە بكەڤن بەر دەڤێ كێرا رەخنە یێن گران یێن رەخنەگران. لێ پێشەنگێن درست ژ رەخنەیان ئوو ژ مەترسیان ناترسن. ئەو بەر ب پێش دمەشن ئوو كەرخێن نوو چێ دكن ئوو ب سەركەڤتنێن نوو دگەهن ئوو ل دووماهیێ ژی ژبەر سەركەڤتنێن خوە خەلك پەسنا وان ددن.

دیرۆكێ سەلماندی یە كۆ ئاڤاهیێ هێز ئوو دەستهلات ئوو پێشكەڤتنا گەلان ل سەر بناغەیێ وێرەكێ ئوو روحا پێشەنگی یا وان دهێت ئاڤاكرن ئوو خوەبەرڤەدان ئوو تەنبەلی ئوو رەڤینا ژ بەرپرسیاریێ سەدەما كەڤتنا وان بوویە. ئەرێ وەلاتێن ئێكگرتی یێن ئەمریكایێ بێ وێرەكێ ئوو روحا پێشەنگیێ دكاری بگەهت هێز ئوو پێشكەڤتنا خوە یا ئەڤرۆ؟

ل دەمان دەمەكێ، حوكمەتا ئەمریكایێ ژبوٚ بەرفرەهتركرن ئوو پێشئێخستنا دەڤەرێن رۆژئاڤایێ ئەمریكایێ هندەك ژ ئەردێن وان دەڤەران دان وان كەسێن كۆ مشەختی وان دەران دبوون. ڤی كاری روحا پێشەنگیێ گەلەك خورتتر كر. كەس نكارت باندۆرا كێرا یا ڤێ وێرەكی ئوو روحێ د ئاڤەدانكرنا ئەمریكا یا ئەڤرۆدا ماندەل بكت. لێ ئسپانیا چاوا بوو؟

ئسپانیاییان پشتەڤانی یا كەسەكێ خیالپەروەرێ مینا "كۆلومبوسی"[1] كر ئوو ڤەرێژا وێ ڤەدیتنا جیهانەكا نوو بوو. بێگومان هەمی شێواز ئوو سیاسەتێن بكارهاتی

(١) كریستۆفەرێ كۆلومبوس (Christopher Columbus) (١٤٥٢-١٥٠٦) كەسێ كۆ شەهنازی یا ڤەدیتنا پارزەمینا (=قاررەیا) ئەمەریكایێ ب ناڤێ وی یە. وی ل سالا ١٤٩٢ێ سەفەرەكا دەریایی یا مێهتنكارانە (=ئیستعماری) ژبوٚ گەهشتنا ب سووكێن هندستانێ دەست پێكر، لێ پاشی خەلك پێ حەسیان كۆ جهێ نووڤەدیتی نە هندستانە. مێهتنكارێن ئەورووپایی گەلەك ژ وان خوەجهیان كۆ هەتا ئەڤرۆ ژی دبێژنێ "هندی" كوشتن ئان هەما ببێژە ڤەبراندن ئوو وەلاتێن ئەمریكایێ ئاڤاكرن.

بێ کێماسی ژی نەبوونە ئوو رەنگە لدووڤچوونا وان سیاسەتان گەلەك بێ عەدالـەتی ژی چێ کربن. لێ ئەم دکارین بنـەما یـێن پێـشکەڤتنێ ئـوو وەرارێ هـەر ژ ڤـان سـەربهوران فێر ببین.

هەر چندە کۆرە خودانا دیرۆکەکا کـەڤنارە، لـێ ل چـاخێن بهـوری روحـا پێـشەنگیێ بەرچاڤ نەبوویە. ئـەڤ راسـتیەکە کـۆ ب درێـژی یـا دیرۆکـێ کۆرەییـان هـەرگاڤ رەهـەتی زێدەتر ژ خەباتێ ڤیایە. ئەم هەمی گاڤـان بەرهـەڤتر بوونـە کـۆ ب ساناهی خـوە بـدین دەستێ جەبرا بوویەران ئوو ڤەدەر ئوو چارەنڤیسێ. رەنگە ئەڤ جـۆرەیێ هـزرینێ ژبـەر فەلسەفەیا کنفۆسیۆسی، ئانکۆ خوەشکاندنێ ئوو لبەرچاڤگرتنا ئەدەب ئوو نەرمیێ بـت، کـۆ ب وەسـفاندنێن جـوان ئـوو بـەدەوێن مینـا "لاوانـدنێن دۆسـتانە یـێن رۆژهلاتـێ"، "خەلوەتگەها پاکژی یا بەرسپێدەیان" نەتەوە یا مە پێ دهێـت وەسـفاندن. لـێ ئەشـکرا یە کۆ هەر ژبەر ڤـان ناڤووبـانگێن تەنبەلکـەر... ئـەم ب هێـزا خـوە یـا نەتـەوەیی ڤـە ژ وەلاتێن مەزنێن جیهانێ گەلەك پاشدامانە.

دەما شـەریکە یـا "دێـوو"یـێ هـات دامەزرانـدن، مـە ل ناڤەنـدێن دەرڤـەیی تـوخیبێن وەلاتێ خوە، ئانکۆ ل سـووکێن ناڤنەتـەوەیی، مێـزە دکـر. ئـەڤ هـزر ل دەمـەکێ بـوو کـۆ دەرڤەهنارتنا (= تەسدیرا، ئێکسپۆرتا) پەرتالێن کۆرەیێ ب گشتی سـەرمایەدانانەکا کـێم بها دهات حەسباندن. شەریکە یێن ناڤدارێن وێ دەمێ هەمی ئەو بوون یێن کۆ ژ دەرڤە تشت دکرین ئوو کەسـی چ هـزر ل دەرڤـەهنارتنا پـەرتالان نـەدکر. ژبـەر وێ ئـەم بـوون پێـشەنگێن دەرڤـەهنارتنێ ئـوو کەسـی ژی بـاوەر نـەدکر کـۆ ئـەم دێ بـسەربکەڤین. مـە وێرەکانە شەررێ ئاریشەیان ئـوو دژواریـان کـر ئـوو ل دوومـاهیێ پـچەکێ بـسەرکەڤتین ژی. تشتێ کۆ مە بدەستڤەنەئینایی ئەوە یێ کۆ مـە نـەکری یـە. مـە چ تـشتەك نـەکری یە کۆ تێدا سەرنەکەڤت بین. ئەحمەقیەکا درستە کـۆ هـەما بـەری دەسـتپێکرنا کـارەکی ببێژی ئەڤ کار مومکن نینە.

روحـا پێـشەنگی یـا "دێـوو"یـێ نـە تـەنێ بـەرێ مـە دا سـووکێن ئـەمریکایێ ئـوو ئەورووپایێ، لـێ بـەرێ مـە دا وەلاتـێن مینـا سـوودانێ، نایجیریـایێ، لیبیـایێ، ئـانگۆلایێ، ئەلجـەزاییرێ، چـینا کۆمۆنیـست ئـوو وەلاتـێن بلۆکـا رۆژهلاتـێ- مەجارسـتانێ (= هۆنگاریایێ)، چێکۆسلۆڤکیایێ ئوو ئێکەتی یا کۆمارێن شێوردار (= سۆڤیەتی) کۆ مـە

دگـەل وان هـەما تێکهلـی یـێن سیاسـی ژی نـەبوون. سـەرمایەدانانێن وێرەکانـە یـێن "دێوو"یێ ژبۆ گەهشتنا ب سووکان، ل دووماهیێ بوون سـەدەما پەیـدابوونا تێکهلـی یـێن سیاسـی یـێن کۆرەیێ دگـەل وەلاتـێن سـوودانێ، لیبیـایێ، ئەلجـەزاییرێ، نایجیریـایێ ئـوو مەجارستانێ.

ئەرێ! جیهانەکا بەرفرەه ل پێش مە یە. هەر چندە جیهانا کەسێن کۆ نـاخوازن ل کەرخێن نەنیاس ئوو نەدیتی بمەشن ئوو تەنێ دخوازن کارێن جەربانـدی بکـن هـەر ب ڤاسی وان کەرخێن نیاس ئوو وان کارێن جەرباندی بچووکە، هندی وان کـارێن کـێم بها یێن کۆ ئەو لێ راهاتنە.

لێ پێشەنگێن کۆ دخوازن کەرخێن نوو بشەڤینن ب روحا پێـشەنگی ئـوو ڤـەبخوازی یا خوە کارێن نوو ژی دجەربینن. جیهان جهەکێ گەلـەك بەرفرەهـە ئـوو کـارێن زەهڤ ژی هەنە کۆ دبێ بهێن کـرن. ئـەز هـەرگاڤ وەهـا ژیامـە ئـوو وەسـا ژی دێ بـەردەوام بم: دەستپێکرنا چالاکی یێن تازە ئوو کەس-نەدیتی ئوو بەردەوامبوونا ل سەر وان ب هەمی شیانا خوە ڤە.

هـون هـەتا جـوانن، پێـشەنگ بـن. پێـشەنگی رێ یـا ئێکانـە یـا ژیـانێ یـە. جیهـان هەوڤاس بچووك بوویە کۆ ژێ را دبێژن "گوندێ جیهانێ"[1]. لـێ هێـشتا د ڤـێ جیهـانێ دا ڤالاهی یێن وەسا هەنە کۆ دبێ بهێن ڤەدیتن. هەر چندە گۆکا ئـەردی تـژی مـرۆڤێن مژوولی کاری یە، لێ هیشتا گەلەك کار هەنـە کۆ هێـشتا کەسـی نەکرنـە. ل کـەون ئـوو هـەبوونێ رابمیـنن ئـوو پـرۆژە ئـوو بەرنامـە یـێن پـرر شـەوکەت د سـەرێ خـوە دا بپەروەرینن ئوو ژ شکەستنێ مەترسن. پێشەنگ هەمی گاڤان ب تەنێ نە. هـون ب خـوە پێشەنگێن پاشەرۆژا خوە بن ئوو راستی یا ژیانێ ژی هەر ئەڤە.

---

(١) گوندێ جیهانی (Global village) رەنگە ژبۆ جارا پێشین ژ لایێ مارشالیێ مەکلوهان ئوو کـوینتینێ فیـۆر (Marshall McLuhan and Quentin Fiore) ڤـە ل سـالا ١٩٦٧ی د کتێبـەکێ دا ب نـاڤێ "نـاڤگین ناڤەرۆکـە" (The Medium is the Message) هات چێکرن. ئارمانجا وان ژ بکارئینانا ڤێ زاراڤێ ئەو بوو کۆ ب زێدەبوون ئوو لەزگینبوونا تێکهلی ئوو دانووستاندنێن ئەلکترۆنی ل جیهانێ ئەم دیسا ل ژیانا خوە یـا گوندان ڤەدگەرین کۆ دبێ دگاڤێدا تێکهلی یا هەڤدو بکین. لێ بـەری وان ژی، ویندامێ لویس (Wyndham Lewis) د کتێبـا خـوە یـا سـالا ١٩٤٨ێ دا، "ئەمـەریکا ئـوو مرۆڤـێ کـەیهانی" (America and Cosmic Man) ئـەڤ زاراڤ ب ئاوایـەکێ سەربەستیتر بکارئینابوو.

**بەهرا دوییْ**

# بەختەوەری

بدەستڤەئینانا زانینێ هەمی گاڤان گەلەك بهاگران بوویە ئوو سنێلەیی (= موراهقی) یا من هەڤدەم بوو دگەل دەمەکێ کۆ گۆتنێن مینا "دەلیڤە یا بدەستڤەئینانا زانینێ ژ دەست مەدن" ئوو "هەتا زانستی بدەستڤەنەئینن هون ب چ جهان را ناگەهن" گەلەك بالا خەلکی دکێشا. ئەڤ پەیڤ پشکەك ژ دەرسێن ژیانێ نە کۆ باپیرێ من ئوو بابێ من نیشا من دان. هەلبەت ب لبەرچاڤگرتنا حەزا گەلەك خورت یا کۆرەییان ژبۆ خویندنێ، هون ژی دکارن بها ئوو قیمەتا ڤان دەرسێن ژیانێ هەست بکن.

د راستیێ دا، جیهان ب ئاوایەکی هاتیە ئاڤاکرن کۆ تەنێ ئەو کەسێن کۆ ب راستی خوە ژبۆ بدەستڤەئینانا زانستی ماندی دکن جهەکی ژبۆ خوە پەیدا دکن. ڤان گۆتنێن کەڤن نها ژی پشتی دەربازبوونا ب دەهان سالان، بهایێ خوە پاراستی یە. ل دەما جوانیێ هون دبێ ب حەز، ڤیان ئوو خوەماندیکرنەکا زێدە پاشەرۆژەکا گەش ژبۆ خوە چێ بکن. شێوازا ژیانا هەوە ل دەما جوانیێ سەدەما سەرکەڤتن ئان کەڤتنا هەوە ل پاشەرۆژێ یە.

ژبەر وێ، ئەز تەکەز دکم کۆ خوە ژبۆ بدەستڤەئینانا زانستی ماندی بکن ئوو د بیاڤێن جداجدا دا بخوینن، ژبەر وێ کۆ سەربهورا من سەلماندی یە کۆ "یێ بزانت دکارت". هەلبەت ئەز د راستا وێ گۆتنێ دا کۆ دبێژت "زانینا خوە ژ دەست مەدن" پچەکێ خوەپارێزترم. ژبەر وێ کۆ پچەکێ بێروح ئوو خوەپەرێسانە یە. ئەز زێدەتر حەز ژ "زانستێ خوە دگەل خەلکی ڤە ببەشن"ێ دکم. ژبەر وێ کۆ خەلکێ زانا بەرپرسیارێ فێرکرنا خەلکێ دی نە. ئەڤ ڤەبەشین نابت تەنێ زانین ئوو زانستی ڤەبگرت، ئەم دبێ هەمی تشتێن خوە دگەل خەلکی ڤەببەشین. ئەم دبێ خەلکی

پارداریٚ زانینا خوه ئوو مالیٚ خوه بکین. ژبەر ویٚ کۆ خوەپەریٚسی ژ ئالی یێن رەڤانی (= پسیکۆلۆژیك) ئوو دارایی ڤە وەکی ئێك زیانیٚ دگەهینن مرۆڤان. ژبۆ-خەلکی-ژین گەلەك گرنگە. ژبەر ویٚ کۆ دەما هون ژبۆ خەلکیٚ دی بژین، جیهان دیٚ ببت ناڤەندەکا گەرمتر، روهنتر ئوو گەشتر ئوو ژیانیٚ هنگی بهاییٚ خوه هەیە.

ئەز گەلەك پیٚ دئێشم کۆ دبینم جوانەك هەما خوه د کەسی ناگەهینت ئوو تەنیٚ د هزرا رەهەتی ئوو ژینفرەهی یا خوه دا یە. ئەڤ کەس نە دزانت کا ڤەنجی یێن جڤاکا وی ژبۆ وی چ نە، نە ژی دزانت کا بەختەوەری یا درست چ یە.

تەجریبە یا من یا هەری پێشێن ژ بەختەوەری یا درست، ڤەدگەرت دەمەکیٚ کۆ ئەز وەکی ئاوارەیەکیٚ شەرری دگەل مالباتا خوە ل "دائێگۆ"ییٚ بووم ئوو ئەم ب رۆژنامەفرۆشتنا من دژیاین. هنگی، ژبەر شەرری، خەلکیٚ وەلاتیٚ مە ئەوقاس خزان ئوو نەدار بوون کۆ خەلکی مرن ژ ژیانیٚ خوەشتر ئوو رەهەتتر ددیت. ئەم هەرگاڤ برسی بوون ئوو مومکنە کۆ ئەڤ وێرەکی یا دوومانددنا ژیانیٚ مە ژ حەنەکا تەهلا ویٚ ژیانیٚ ئوو ویٚ برسیٚ وەرگرت بت.

هنگی ژبەر ویٚ کۆ بابیٚ من رەڤاند بوو ئوو بر بوو کۆرەیا باکور ئوو برایێن من یێن مەزنتر ژی دناڤ ئارتەشی دا خزمەت دکر، بەرپرسیاری یا هەمی مالباتیٚ ل سەر ملێن من بوو. دبیا من رۆژیٚ ب کێمی ڤە ١٠٠ رۆژنامە ل سووکیٚ فرۆشتبان هەتا شیابام هندەك پارەیی بدەستڤەبئینم کۆ ژیانا خوه پیٚ دەربار بکم. دایکا من ئوو برایێن من یێن بچووکتر هەتا دەرەنگی شەڤیٚ ل بەندا من دمان دا مە بهەڤرا شیڤ خواربا. ئەز ژبەر ڤیٚ هەرگاڤ سپاسداریٚ وانم. دەما مە هەر چاران بهەڤرا شیڤ دخوار، من هەستەکا گەلەك خوەش هەبوو. ئەز ب راستی کێفخوەش دبووم ئوو زاد ژبۆ مە گەلەك تامخوەشتر دبوو.

لیٚ ئەم نەدشیاین هەمی گاڤان بهەڤرا شیڤیٚ بخوەرین. ژبەر ویٚ کۆ دکانێن سووکا "پان چوون"یٚ، جهیٚ کۆ من رۆژنامە لیٚ دفرۆشتن، د راستییٚ دا، هندەك ئۆدە یێن گاڤێن ئوو بەروەخت بوون کۆ ب رەخ رووباری ڤە هات بوون ئاڤاکرن ئوو ئاغلەب ل دەمێن کۆ سەڤا خوەش نەبا گرتی بوون. ئەگەر من بخوەستبا پارەییٚ زادیٚ مالباتا خوه بدەستڤەبئینم، دبیا ب کێمی ڤە من ١٠٠ رۆژنامە فرۆشتبان. ژبەر ویٚ دەما سەڤا

نەخوەش با، ئەز تووشی ئاریشەیان دبووم. هندەك رۆژان ژ چەند فروشەكان زێدەتر من چ نەدبوو كۆ ژبۆ زادی بدم مالێ.

شەڤێن وەسا ل دەما ئەز ڤەدگەرریام مالێ، دایك ئوو برا یێن من هەمی دنڤستن. ئەز زووكا پێ حەسیام كا بۆ چ شەڤێن وها ئەو بەری ڤەگەرریانا من دنڤستن. مە تەنێ بادیەكێ گرارێ هەبوو كۆ مالباتا مە ئەو ژبۆ من دهێلا. جارێن وەها، دایكا من ژ خەوێ رادبوو ئوو دگۆت: "مە هەمیان شیڤ خواری یە. نها تو برسی یی، وەرە زووكا زادێ خوە بخوەر". دەما ئەز ل برا یێن خوە رادمام كۆ دایكا من ب زكێ برسی ڤە نڤستاندبوون، ب راستی گری یا من دهات. لێ من ئوو دایكا من، مە هەردوان، رۆندكێن خوە ژ هەڤدو ڤەدشارتن ئوو من دگۆتێ: "من ل رێیێ بادیەكێ مەكەرۆنیێ خواری یە. بلا ئەڤ بادی یێ برنجێ ژبۆ تە ئوو زارۆان بت".

د راستیێ دا، مە هەردوان دەرەو دگۆتن هەڤدو ئوو مە هەردوان ژی ئەڤ دزانی. لێ مە نەدزانی ب چ ئاوایەكێ دی هەستێن خوە دەرببررین. ب سەر وان هەمی تەهلی ئوو نەخوەشیان را، نها كۆ ئەز دفكرم، ئەو دەم ئێك ژ باشترین دەمێن ژیانا من بوویە. رامانا بەختەوەریێ نە گەهشتنا ب كەسكەسۆرێ ئان تشتێن دەرڤەیی كەتوار ئوو واقعی یە. من ئوو مالباتا خوە خوە گۆری هەڤ دكر ئوو ژبۆ من چ بەختەوەری ژ ڤێ مەزنتر نەبوون. ئەم ژ ئالی یێ دارایی ڤە خزان ئوو نەدار بوون، لێ هندی ژ مە دهات، مە دەستێ دانێ هەبوو. مرۆڤەكێ زەنگینێ كۆ هەمی تشت هەبن لێ نەزانت چاوا بدت، د راستیێ دا زەنگین نینە. زەنگینێن راست ئوو درست ئەون یێن كۆ گەلەك ددن.

ژبەر وێ ئەم دبێ رامان ئوو تێگەهشتنا هەیی ژ "زەنگینیێ" بگوهێرین ئوو تێگەها وێ یا درست دوبارە ڤەبژینین ڤە. ئانكۆ كەسێن كۆ دزانن چاوا بدن زەنگینێن درست یێن جیهانا ئەڤرۆ نە.

بەختەوەری یا درست چ یە؟ ئەز نكارم ببێژم كۆ بەرسڤا ڤێ پرسیارێ دزانم، لێ پشتراستم كۆ بەختەوەری یا درست هەوڤاس گرێدایی دارایی، هێز ئوو دەستهلات ئوو ناڤووبانگی نینە. ئەڤێ ژی ب ئەشكرا دزانم كۆ باشترین قۆناخێن ژیانا من ئەو چاخ بوون كۆ ژ ئالی یێ دارایی ڤە د نزمترین ئاستێن مومكن دا بووم.

ژ هنگی وەرە بزاڤێ دکم فەلسەفە یا "ژبۆ خەلکی بژی" بکم دەرسا خوە. لێ د کریارێ دا دبینم کۆ ئەڤ فەلسەفە گەلەك زەهمەتە. ب سەر هندێ را ژی، ئەز هەر پێکۆلێ دکم کۆ ئەڤ فەلسەفە ڕێبازا ژیانا من بت.

هون دبێ فەلسەفە یا "ژبۆ خەلکی بژی" ل سەر بناغەیێ "ژ خەلکی حەز بکە" ئاڤا بکن ئوو وەکی ئەندامەکێ جڤاکێ ب سەر خوەپەرێسی یا خوە دا بسەربکەڤن.

هون دکارن بەختەوەریێ د ئەڤاندن ئوو حەزکرنا ژ خەلکی دا ڤەببینن، ژبەر وێ کۆ بەختەوەری ژ ئەڤاندنێ دهێت. ب نهێررینا من، مە خەلکێ جیهانێ هەمیان ئێك داخوازا هەڤپشك هەیە: مە هەمیان بەختەوەری دڤێت. لێ ئەم نزانین چاوا بگەهین ڤێ خوەستەکا خوە. ئەڤ من ژی ڤەدگرت. لێ ئەز تشتەکی ب مسۆگەری دزانم: هەما دەما هون ژبۆ خەلکی بژین ئوو خەلکی بئەڤینن، هنگی دێ بەختەوەری بەر ب هەوە ڤە بهێت.

لەوما، گەلی جوانان! بهێلن کۆ ژ هەوە بخوازم هندی ژ هەوە دهێت زانست ئوو زانینێ بدەستڤەبئینن ئوو خوە ماندی بکن ئوو خەلکی ژی بکن هەڤپشکێن زانین ئوو سەربهورێن خوە. ب ڤی رەنگی هون دکارن هووشی (= ویشی) یێن زانستێ خوە دگەل خەلکی ڤەببەشن.

**بەهرا سێیێ**

# ناڤووبانگ ئوو ئاڤروو

د ژیانێ دا هندەك بها هەنە كۆ نابت چ جاران بهێن زرركرن ئوو ونداكرن. گرانبهاترین بها ژ وان ژی ناڤووبانگ ئوو ئاڤروو یا مرۆڤی نە. نەمانا ژیانێ ئەگەر رامانا وێ مرن بت، نەمانا ئاڤروویێ ژی رامانا وێ داویبوونا ژیانا هەوە د جڤاكێ دا یە.

ژدەستدانا پارەی گەلەك خرابە، لێ مرۆڤ پێ سەرشۆر ئوو سەرشكەستی نابت. ژبەر وێ كۆ ب هەر ئاوایی بت هون دكارن تۆلەیێ ڤەبكن. ب هەر حال، پارە ژبۆ مەزاختنێ یە. لێ هون نابت چ جاران ئاڤروو یا خوە د جڤاكێ دا ژ دەست بدن ئوو دبێ وەكی ژیانا خوە رێزێ لێ بگرن ئوو هایێ هەوە لێ هەبت.

هەر مرۆڤەكی ناڤەك ئوو جهەك د جڤاكێ دا هەیە. ئەختوبارا كەسی ژ وی جدا نینە، پشكەك ژ هەبوونا وی یە. دەما ناڤێ كەسەكی دهێت، هون دگاڤێدا هزرێ ل وی دكن ئوو دێم، دەنگ، كەساهی، پێگەهێ وی یێ جڤاكێ، پێشینە یا وی ئوو رەنگە خالێن بهێز ئوو لەوازێن وی بئینن بەر هزرا خوە. ژبەر وێ، ناڤێ كەسی ئانكۆ ئەو كەس ب خوە. دەما ناڤێ "نیرۆن"ی[1] دهێت، هون دگاڤێدا هزرێ ل كارێن وی یێن نەحەزكری دكن، لێ ب بهیستنا ناڤێ دكتۆر "شوایتزر"ی[2] هون دجهدا ل سەر كارێن وی یێن

---

(١) نیرۆن (Nero Claudius Caesar Drusus Germanicus) (٣٧–٦٨) ئێك ژ ئیمپەراتۆرێن خوینرێژ یێن رۆمێ بوو كۆ پشتی مامێ خوە دەستهلاتداریەكا ب ترس ئوو خەوف گێرا. د ئەدەبیات ئوو دیرۆكا ئەورووپاییێ دا ئێك ژ نموونەیێن ستەمكارییێ یە، هەرچندە گەلەك كارێن سیاسی یێن مەزن ژی كرنە.

(٢) ئالبێرتێ شوایتزر (Albert Schweitzer) (١٨٧٥–١٩٦٥) پزشك، دینناس، فەیلەسووف ئوو مووسیقازانێ ئەلمانی كۆ دژبەری باوەری یا ب عیسایەكێ علمانی یێ دیرۆكی ئوو دژبەری باوەری یا كەڤنەشۆپی یا فەلەیان كۆ دبێژن عیسا چاڤەرێ یێ دووماهیهاتنا جیهانێ یە راوەستیا. وی ژبۆ فەلسەفەیا خوە یا "رێزگرتنا ل ژیانێ" ئوو ژبۆ خزمەتەكا پزشكی یا بێ بەرانبەر یا بەردەوام ل گابۆنا ئەفریكاییێ، ل سالا ١٩٥٢ێ خەلاتا نۆبلی ژبۆ ئاشتییێ وەرگرت.

مرۆڤدۆستانە دفكرن. ژبەر وێ هون پێ دحەسن كۆ ناڤ چەند گرنگە، ڤێجا هون دبێ هەمی پێكۆلا خوە بكن كۆ ناڤێ خوە بپارێزین ئوو نەهێلن ناڤێ هەوە ببت هێڤێنێ شەرمزاری ئوو فهێتیێ.

ب نهێررینا من، بێ ئاقلانەترین كار ئەوە كۆ هون ب دەستێن خوە ناڤێ خوە زرر بكن. ئەگەر رۆژەكێ هون ناڤێ خوە یێ باش زرر بكن، راستڤەكرنا وی گەلەك زەهمەتە.

ڤێجا هون ژبۆ پاراستنا ناڤووبانگ ئوو ئاڤروو یا خوە دێ چ بكن؟ ئەرێ رفتارا هەوە ل گۆرە یێ ناڤێ هەوە یە؟ ئەگەر هون دەرسدێر بن ئوو رفتارا هەوە نە ل گۆرە یێ رفتارا دەرسدێرەكی بت، دێ ئاڤروو یا خوە وندا بكن. ئەگەر هون شاگرد بن، ژ هەوە چاڤەرێ دهێت كرن كۆ وەكی شاگردان رفتار بكن. پزیشك، دایباب، زانا یێن دینی ئوو دامەزرینەرێن بنكە یێن پیشەسازی ئەگەر وەكی كۆ ژ وان دهێت چاڤەرێكرن رفتار نەكن، هەمی دێ ئاڤروو ئوو ئەختوبارا خوە د جڤاكێ دا وندا بكن. هەر ناڤەك ئوو جهەك د جڤاكێ دا خوەدی سالۆخەتێن نەمازەیی ئوو تایبەتی یە. ڤێجا هون دبێ خودانێ سالۆخەتێن نەمازەیی ئوو ئەرینی بن هەتا بكارن وكی وەزیرەك ئان زانایەكێ دینی بهێن نیاسین. رۆژا هون ڤان سالۆخەتان وندا بكن، هون دێ خوە ل بەر لۆمە یێن خەلكێ دی ببینن. ئەڤ دەرسدێران، شاگردان، بازرگانان ئوو كاروەران ژی ڤەدگرت.

هەلبەت هندەك كەس پووتەی ب ناڤووبانگێ خوە د جڤاكێ دا ناكن. هندەك دایباب هەنە كۆ قەت هەژی یێن وی ناڤی نینە ئوو مخابن كەسێن كۆ ژبەر كریارێن نە هەژی د جڤاكێ دا ئاڤروو یا زانا یێن دینی ئوو دەرسدێران ژی دبن رۆژ ب رۆژ زێدەتر دبن. ئەڤ ژبۆ كاروەران ئوو بازرگانان ژی درستە. ئەز باوەرم خەلكێ وەها ب درستی د پێگەهێ جڤاكی یێ خوە نەگەهشتنە.

ئەگەر، هەر وەكی كۆ دهێت گۆتن، ل جڤاكا مە یا ئەڤرۆ گەلەك دەرسدێر هەبن، لێ دەرسدێرێن درست كێم بن، ژبەر وێ یە كۆ دەرسدێر ب پێگەهێ جڤاكی یێ خوە نەحەسیانە. ئەڤ بابەت وان پزیشكان ژی ڤەدگرت كۆ بەری چارەسەركرنا نەساخی بەهسا مز خوە ئوو هەقدەستێ خوە دكن.

رێڤەبرنا باش یا بنکەیەکی ژی حەوجەدارا هندێ یە کۆ کارمەندێن وێ ب پێگەهێ جڤاکی یێ خوە بحەسن. ب نهێررینا من، ئەرکێ دامەزرینەرێ بنکەیەکێ پیشەسازی ئەوە کۆ ب رێ یا چالاکی یێن ئابۆری هاریکاری یا پێشکەڤتن ئوو وەرارا جڤاکا خوە بکت. ئەگەر من ب راستی هەست نەکربا ئوو نەفکریبام کۆ ئەرکێ راستین یێ دامەزرینەرێ بنکەیەکێ پیشەسازی باشترکرن ئوو پێشەڤەبرنا ژیانا خوە، مالباتا خوە ئوو جڤاکا خوە یە، ب سالان بەری نها دێ من دەست ژ خەباتێ هل بگرتبا. ئەگەر جوانێن وەها هەنە کۆ هیڤی دکن ژبۆ بدەستڤەئینانا قەزەنج ئوو بەرژەوەندی یێن کەسۆکی ببن دامەزرینەرێن بنکە یێن پیشەسازی، هیڤیدارم ڤێ هزرا خوە راستڤەبکن ئوو ئەگەر وەها نەکن ژی، هیڤیدارم هەر نەبت دەرهەڤا دامەزراندنا بنکە یێن پیشەسازی دا ل خوە ڤەبگەرن.

هەما ئەگەر من ژی بڤێت ژبۆ دەمەکێ کارێ خوە بهێلم ئوو بێهنا خوە ڤەبدم، دیسا ژبەر ناڤووبانگ ئوو پێشینە یا خوە د جڤاکێ دا نکارم. ناڤێ "کیم- وو- چۆنگ"ی تێکهلی چالاکیان بوویە ئوو ئەز دترسم کۆ ب هێلانا چالاکیان ئوو کارێ خوە ئاڤروو یا من د جڤاکێ دا بچت.

هەر چەندە کۆ چالاکی یێن نها یێن دەستەکا "دێوو"یێ گەلەك بەرفرەهن ئوو چالاکی یێن جۆربجۆر د بیاڤێن پیشەسازی ئوو بازرگانی دا ڤەدگرن، لێ ئەز ناهێلم "دێوو" هندەك چالاکیان بکت. ل بەراهیێ، ئەز ناخوازم خزمەتا وان کەسان بکم کۆ ل پەی فەلسەفە یا "خوەشیان" ئوو لەزەتێ دچن، وەکی وان خزمەتێن کۆ پێدڤیتی یێن کەیف ئوو رابواردنێ بەرهەڤ دکن. بەرهەڤکرنا زادی ئوو مەشروبان ساناهیترین ئوو بلەزترین رێ یێن بدەستەڤئینانا پارەیی نە، لێ ژبەر پێشینە ئوو ناڤووبانگێ "دێوو"یێ ئەز پێکۆلێ دکم کۆ خوە ژ چالاکی یێن وەها دوور رابگرم.

بابەتێ دویێ، ئینانا بەرهەمێن مەزاختنی یێن نە پێدڤی ژ دەرڤەیی وەلاتی یە. ل رەوشێن وەها برریاردان ل سەر هندێ رادوەستت کا بەرهەمەکێ وەسا د ناڤ وەلاتی دا دهێت بەرهەمئینان ئان نە. ئەگەر بەرهەمەکێ وەکی وی ل وەلاتی هەبت، بێگومان ئەم وی بەرهەمی ژ دەرڤەیی وەلاتی ناکررین.

**بابەتێ سێیێ، ئەو جۆرە بازرگانی نە کۆ ناهێلن سەرمایەدانانێن بچووك ئوو ناڤنجی وەرارێ بکن ئوو پێش بکەڤن. ڤەگەررانـدنا کارێ هەژی ژبۆ وان بنکەیان تشتەکێ پێدڤی یە. بنکە یێن مەزن دبێ کارێن تایبەتی یێن خوە بکن ئوو نابت کارێن بنکە یێن بچووك ژ وان بدزن.** [1]

**ئەڤ هەمی ئەو بەرتەسککرنن کۆ ژبۆ خاترا ناڤووبانگێ باش یێ "کیم- وو- چونگ"ی ئوو شەریکە یا "دێوو"یێ ئەز ل سەر خوە دپەرژینم، ژبەر وێ کۆ ناڤووبانگ ئوو ئاڤروو ژبۆ من گەلەك گرنگن.**

---

(١) مخابن کۆ کاروەرێن (=بیزنسمانێن) کوردستانێ هەما درست بەرڤاژی یێ ڤان شیرەتان کاردکن. ل ڤان ١٧–١٨ سالێن بهوری ژ تەمەنێ حوکمەتا هەرێما کوردستانێ، پشکەکا مەزن ژ داهاتێ وان ئینانا مەشرووب ئوو مەیێ ئوو جگارەیان بوو وەلاتی بوویە. پارەك ژ وێ بازرگانییێ ژبۆ قاچاخا وان بەرهەمان بۆ وەلاتێن هەڤسی یێن مینا ئیرانێ ئوو ترکییێ بوویە، لێ بێگومان پارەکا دی ژی ژبۆ مەزاختنا ناڤ کوردستانێ بوویە. پەرتالێن مەزاختنێ ژی بەهرا مەزن ژ بازرگانی یا وان پێك دئینن. نها هەما ماست ئوو ئاڤا مە، تەماتەیێن مە، هەمی تشتێ مە، ژی ژ دەرڤەیێ وەلاتی دهێت. هەمی ژێرخانا ئابۆری ئوو شیانێن بەرهەمئینانێ یێن خوەیی ل کوردستانێ بوون قوربانێ بەرژەوەندی یێن چەند بازرگانەکان. حوکمەتا بێ بریارا هەرێمێ ژی نەکاری ئوو نەخوەستی یە ژی کۆ بەراهیکا ڤێ وەلات تالانکرن ئوو "گەل–تەنبەلکرنێ" بگرت.

**بەهرا چارێ**

# کارتێکرنێن دەردۆری یێن دانا خەلاتان

ل سالێن بەراهیێ ل چالاکی یێن "دێوو"یێ من گەلەك خەلات وەرگرتن. ب نهێررینا من، ئەو خەلات نیشانا ڤەدرگرتنا جڤاكێ ژ کتەکەسی بوو. هەر چندە کۆ خەلات ب خوە تەنێ ژبۆ هاندانێ نە، لێ ب راستی هندەك بەرتەنگیان ژی ژبۆ وەرگری چێ دکن. پشتی وەرگرتنا خەلاتی، بێی کۆ خەلاتی ب خوە ئان ناڤووبانگێ ژبەر وێ پەیدابوویی لبەرچاڤان بگرن، هەوە چ چارە نینن ئوو دبێ زێدەتر خوە ماندی بکن دا بسەلمینن کۆ هون هەژی یێ وەرگرتنا وی خەلاتی بوونە.

ئەڤ درست ئەو کارە یێ من کری، ژبەر وێ کۆ من نەدخوەست خیانەتێ ل وێ پشتراستی ئوو باوەری یا جڤاکێ بکم. لەوما، من دو-ڤاتی بەرێ خوە ماندی دکر ئوو "دێوو" یا ئەڤرۆ بەرهەمێ وێ بزاڤێ ئوو خوەماندیکرنێ یا وی چاخی یە. ل گۆرە یێ سەربهورا کەسۆکی یا خوە، ئەز باوەرم کۆ دانا خەلاتان ئاکامێن باشتر هەنە. خەلات رێ یا ئارمانجێن بلندتر نیشا کتەکەسان ددن. کۆرەیی د هاندان ئوو پەسندان ئوو خەلاتدانێ دا گەلەك دەستڤەکری نینە. ژبۆ میناك، دەما ئەز ژبۆ گۆتارخویندنەکێ دچم ئەمریکایێ ئان ئەووروپایێ، گەلەك ژ پشکداران ب گڤاشتنا دەستی ئوو هاندانێن دی من تێهن ددن. هندەك جاران تۆڤەکرن ئوو دەستدانا ب خەلکی زێدەتر ژ گۆتارخویندنێ ب خوە ژی ڤەدکێشت ئوو هندەك جاران نامە ژی ژبۆ من دهێن هنارتن. لێ ئەگەر ئەز هەر ئەوێ گۆتارێ ل کۆرەیێ بخوینم، ب ئاوایەکێ ئەدەتی چ بەرسڤێن وەها نابینم.

دەما ئەز ژبۆ گۆتارێن خوە ل دەرڤەیێ وەلاتی دهێم هاندان، رامانا وێ نە ئەوە کۆ گۆتارێن من مینا گۆتارا ناڤدارا لینکۆلینی یە یا کۆ ب ناڤێ گۆتارا "گێتیسبێرگ"ێ[1] دهێت نیاسین. رامانا وێ ئەوە کۆ سەڤا یێ ئەمریکایێ ئوو ئەورووپایێ زێدەتر بەرهەڤی هاندان ئوو تێهندانا خەلکی یە. گەلەك مخابن کۆ ئەز ڤی تشتی ل کۆرەیێ نابینم.

مرۆڤ ب ئاوایەکێ ئەدەتی ژ وەرگرتنا خەلاتێن بچووك ژی کێفخوەش دبن ئوو گەلەك خوەرسکی یە کۆ ب بهیستنا تێهندان ئوو هاندانان ژی کێفخوەش ببن. ژبەر شەهنازی یا کۆ وەرگرتنا خەلاتان ب خوە رادئینت، مرۆڤ پشتی وەرگرتنا خەلاتان ژبۆ بزاڤ ئوو خەباتێ خوە زێدەتر دلگەرم دبینت. هەر وەکی من بەرتر ژی گۆت، مرۆڤ نکارت خیانەتێ ل وێ باوەرپێکرن ئوو هاندانێ بکت یا کۆ خەلك ب دانا خەلاتان ب مرۆڤی دکن.

هون دکارن ب خەلاتکرنێ سرێم ئوو سمتا ژیانا کەسەکی بگوهێررن. ژبەر وێ، ئەز باوەرم کۆ ئەگەر ئەم ژبۆ چ تشتەکی ژی ل کۆرەیێ خەلاتان نەدین، دبێ ژبۆ پێشدابرنا خویندنێ ئوو پەروەردەیێ خەلاتان بدین.

ئەز وەسا دبینم کۆ خەلاتان دبێ بدن کەسێن هەژی ئوو خودان شیان. دبێ خەلك بهایێ وەرگرتنا خەلاتان بفامن (= فێم بکن). شەهنازی ئوو ناڤووبانگێن کۆ جڤاك ب رێزگرتنێ ددت مرۆڤی، وی ژبۆ ژیانەکا بلندتر ئوو بهادارتر هان ددن.

ئەگەر هون ل سەر ڤی بابەتی دودلن، ئەز دکارم ژبۆ هەوە بسەلمینم.

(١) گۆتارا گێتیسبێرگێ (The Gettysburg Address) ناڤدارترین گۆتارا سەرۆك کۆمارەکێ ئەمریکایێ د دیرۆکێ دا یە کۆ ل سالا ١٨٦٣ێ، چار هەیڤ ئوو نیڤان پشتی داویبوونا شەرێ ناڤخوەیی یێ ئەمەریکایێ، ژ لایێ ئابراهامێ لینکۆلن ل گۆرستانا نەتەوەیی یا پێشمەرگەیان ل گێتیسبێرگێ هات خویندن.

## بەهرا پێنجێ

# هەر تشتەك ل جهێ خوە قەنجە

هەر كەس ئوو هەر تشتەكی ل جیهانێ جهێ خوە یێ نەمازە هەیە.

رێكووپێكی ئوو تەناهی وی چاخی دادكەڤت ناڤ جڤاكێ كۆ هەر تشتەك ئوو هەر كەسەك ل جهێ خوە یێ راستین بت. ئەگەر تشتەك ل جهێ خوە نەبت، نەرێكووپێكی ئوو ئالۆزی پەیدا دبن. تەنێ هون بهزرن كۆ ئەگەر چاڤێن هەوە ل شوونا دفنا (= كەپێ) هەوە بان ئان گوهێن هەوە ل شوونا دەڤێ هەوە ئوو دەڤێ هەوە ل شوونا چاڤێن هەوە بان، دا چ قەومت. چاڤ، دفن ئوو دەڤێ هەوە ل جهێن خوە یێن هەژی نە، ئەڤ رەنگێ خوەرسكی یێ پارچە یێن لەشێ هەوە یە ئوو ئەندام دگەل هەڤ رێكن. لەوما ئەگەر هەر تشتەك ل جهێ خوە بت، هەڤپێژنی (= هەماهەنگی) ئوو نیزامەك هەیە.

مرۆڤ حەوجەدارێن زادی نە، لەوما بابەتێ زادخوارن ئوو خوەرەكی گەلەك گرنگە. ژبۆ میناك، دبێ برنجێ د سینیكێ دا بخوەرن، كەس برنجێ ل سەر ئەردی ناخوەرت. هەما كۆ برنج رژیا سەر ئەردی، ئێدی كەس ناخوەرت. برنجا كۆ ژ سینیكێ دهێت خوارن د لەشێ مە دا دبت هێز ئوو تێهن، لێ ئەگەر برێژت سەر ئەردی ئێدی كرش ئوو گلێشە.

د جڤاكێ دا ژی، ئاریشە وێ دەمێ دەست پێ دكن كۆ هون كارێ خوە یێ سەرەكی ئوو راستین نەكن. خویندكار دبێ خویندكار بت، دایباب، دایباب، هەڤژین، هەڤژین، كاركەر، كاركەر ئوو دامەزرینەرێ بنكەیەكێ پیشەسازی ژی، زەلامێ پیشەسازیێ. جڤاك هنگی تووشی ئاریشەیان دبت كۆ كتەكەس ل جهێن خوە یێن درست نەبن.

پەیاما سالا نوو یا ١٩٨٨ێ یا "دێوو"یێ تەکەز دکر کۆ ڤەگەرریانا کتەکەسان بۆ جهێ راستین یێ خوە ئوو مانا د وی جهی دا تشتەکێ بهاگرانە. پەیام تشتەکێ وها بوو:

"ل سالا نوو بلا ئەم هەمی ل جهێ خوە یێ راستین بین."

ئەم هەمی دکارین ببین کۆرەیی یێن هەڤسەنگتر ئوو ل دووماهیێ ژی هەمی ببین سەر بلندێن ڤێ جیهانێ.

ئەگەر ئەم ل بەندا وێ ببین کۆ جڤاکا مە ب لەز پێش بکەڤت ئوو بگەهت تەباتەکێ، دبێ ئەم هەمی کارێن خوە یێن راستین بکین. مرۆڤێن پیشەکار نابت دەست ژ کارێ خوە بەربدن ئوو کەسێن نەپیشەیی جهێ وان بگرن. ئەڤ خویندکاران، دایبابان ئوو هەڤژینان ژی ڤەدگرت.

ژبۆ هەر کارەکی د جڤاکێ دا هۆستایەکێ وی کاری هەیە. هەر هۆستا ژی دبێ ل جهێ خوە یێ راستین بت. ئەڤرۆ ئەم خەلکەکی دبینین کۆ بیانی یێن کارێ خوە نە ئوو ل جهێ خوە یێ راستین نینە.

دەما کەسەك ل مەنسەبەکی دادمەزرت ئوو چ مەرجێن وی مەنسەبی د وی دا نینە چ روو ددت؟ ئەگەر دەرسدێرەك بێ سالۆخەتێن نەمازەیی یێن پیشە یا خوە دەرسێ بدت ئوو ل شەریکەیان ژی کەسێن نە شەهرەزا کاروبارێن شەریکەیێ برێڤەببن چ روو ددت؟ ئەشکرا یە کۆ دەما کۆرە (= کەسێ کۆ نابینت) دەلیلێ کۆرەی بت، هەر دو دێ بکەڤن بنێ چالەکێ.

سیاسەتا "دێوو"یێ ژبۆ ڤەدیتن ئوو دامەزراندنا درست یا کارمەندێن خوە ئەوە کۆ هەر ژ دەستپێکێ کارمەندێن خوە ل گۆرە یێ شیانێن وان ل سەر مەنسەبێن سەرەکی ئوو هەژی دابنت. ب نهێررینا من، ژبۆ رێڤەبرنا بێ ئاریشە ئوو بێ سەرئێش یا دامەزریاییەکێ ئەڤ شێواز گەلەك پێدڤی یە.

لەوما، بلندکرنا پلەیێ هەر جار نابت ژ پلەیەکێ زێدەتر بت. دوڤاتکرنا پلەیێ د شەریکە یا مە دا تشتەکێ نەئەدەتی یە. هەلبەت هندەك ژ کارمەند ژبەر شیانێن خوە دکارن پەییسکا بلندبوونێ بلەزتر دەرباز بکن.

د شەریکەیان دا، جێگرتنا کەسێن هەژی د مەنسەب ئوو بەرپرسیاریتی یێن هەژی دا ئێك ژ گرنگترین ئەرکێن رێڤەبەری یا شەریکەیێ یە. هەتا چەند سالەکان بەری نها،

من ب خوە سەرۆکێن بەشان هلدبژارتن. لێ نها کۆ رێڤەبەرێن ئاستێ بلند ل "دێوو"یێ ب درستی هایدارێن رێبازا منن، ئەو ب خوە ڤێ هلبژارتنێ دکن.

چەندەکێ بەری نها، مـن د سـترانەکا رۆژێ دا بهیـست کـۆ دگـۆت "دزڤـرت، دزڤـرت، کورسی دزڤرت ئوو دبت یا وی کەسی کـو ل سـەر دروونـت." لـێ ئـەڤ بـەرڤاژی راسـتیێ یە. هەر کورسیەك یا هۆستایەکێ شەهرەزا یە کۆ دبێ تـەنێ ئـەو ل سـەر بروونـت ئـوو بەرپرسیاریتی یێن وێ وەربگرت. ئەڤ رێ یا درست یا روونـشتنا ل سـەر کورسـیانە. لـێ دەما کەسەکێ نەهەژی ئوو بێمەرج کورسیێ داگیر بکت، ئاریـشە دەسـت پـێ دبـن، ژبـەر وێ کۆ ئەو کارێن پێدڤی ناکت ئان ژی ب شێوازەکا درست ناکت.

د جڤاکێ دا هەر کەسەکی کورسیەکا تایبەتی خـوە هەیـە ئـوو دەمـا هـەمی کـەس ل سەر کورسی یێن خوە یێن درست روونشت بن، هنگی جڤاك بێ ئاریشە دبت ئوو هـەمی کار دێ ب تەناهی ئوو بلەز برێڤە بچن. هنگی هەر کەسەك بەرپـرسیارێ ئـەرکێن خـوە یێن راستینە. دەورێ کەسان د جڤاکێ دا ژی وەکی جهێ راستین یێ وانە. لەوما، گەلەك گرنگە کۆ هەمی ل جهێن خوە بن ئوو وی کاری بکن یێ کۆ دبێ بکن. کـار ئـوو پیـشە د خوە دا نە باشن، نە خراب. کار وێ دەمێ باشە کۆ مرۆڤەکێ کارزان وی کاری بکت، ئـوو خرابە دەما مرۆڤەکێ ژێنەهاتی ئوو کێرنەهاتی بکت. هەمی جداتی تەنێ ئەڤە.

ئەگەر هون هزرا خوە ل یاری یا بێسبۆلێ بکن، ب درستی دێ د مەرەما من بگـەهن. هەر تیمـەکێ تـۆپـ هاڤێـژەك، تـۆپـ ڤـەگرەك، یاریکـەرەکێ نـاڤ ڤـادێ ئـوو یاریکـەرەکێ دەرڤەیی ڤادێ هەیە. هەر یاریکەرەکی جهێ خوە ئوو ئەرکێن خوە یـێن نـەمازەیی یـێن وێ پارچە یا ڤـادا یـاریێ هەنـە. ئـەرێ تیمـەکا بێـسبۆلێ دێ بـشێت یاریـەکا بـاش بکـت ئەگەر یاریکەرێن تیمێ ل دەما یاریێ ژنشکێڤە جهێن خوە بگوهێررن ئوو بزاڤێ بکن ل شوونا یاریکەرێن دی یاریێ بکن؟

بابەتێ گرنگ ئەوە کۆ هەر یاریکەرەك چ د تیما بێسبۆلێ دا بت، چ د جڤاکێ دا، بها یێ جهێ خوە بزانت. چـاوا کـۆ هـەر یاریکـەرەك ژبـۆ پێـشڤەبرنا تیمـا خـوە نەچـارە ب باشترین شێوەیێ ئەرکێ خوە بجه بئینت، وەسا ژی هەر کەس ژ مە دبێ ئەرکێن خوە د جڤاکێ دا بجه بئینت ئوو وەسا هـزر بکـت کـۆ ئـەو کـار تـەنێ ئـوو تـەنێ ژ وی دهێـت. هلبژارتنا کارێ هەوە نابت ل سەر بنگەهێ هەوا ئـوو هەوەسـێ بـت ئـوو نابـت تـشتەکێ

نەپێدڤی ژبۆ شەریکەیێ بت، ئان ژی هەما خرابتر، نابت هون کەسەك بن کۆ ب کێری مانا ل سەر کورسی یا خوە نەهێن.

خویندکار ئوو شاگرد دبێ هەمی شیانێن خوە ژبۆ خویندنێ بمەزێخن دا ژبۆ جڤاکا خوە ببن مرۆڤێن کێرهاتی. دەرسدێرەکێ کۆ ب شەوق ئوو خوەگۆریکرن ڤە ئەرکێ خوە بجە دئینت کەسەکە کۆ جڤاك گەلەك حەوجەدار وی یە.

لەوما، دبێ هون تەماشە بکن کا هون ب راستی کارێ خوە یێ سەرەکی دکن. ئەگەر هون کارێ خوە یێ سەرەکی ناکن، هون زیانەکا جڤاکا خوە نە، ژبەر وێ کۆ هەر کەسەك د جڤاکێ دا نکارت کارێ هەوە بکت ئوو ئەگەر هون ل جهێ خوە بن، کەس نەچار نینە جێگرەکی ژبۆ هەوە دابنت ئوو هەمی ل جهێن خوە یێن هەژی نە.

جهێ سەرەکی ئوو راستین یێ هەوە ل بەندا هەوە یە.

بەهرا شەشێ

# بەرژەوەندی یێن مادی بەرانبەری خوەشی یێن مینەڤی یێن کارکرنێ

نها ئەز دخوازم بەهسا تێگەها راستین یا ژیانەکا باش بکم.

نها ل کۆرەیێ گەلەك تشتەکێ ئەدەتی یە کۆ بپرسن کا ژیانا ڤی ئان یێ هەنێ باشە ئان نە. ب نهێررینا من ل جڤاکا ئەڤرۆ یا کۆرەیێ پیڤانا رەوشا ژیانا کەسان تەنێ ب ترازی یا زەنگینیێ یە. ئەڤ ئەو تشتە یێ کۆ ئەز ژ بەرسڤێن خەلکی ژبۆ ڤێ پرسیارێ پێ حەسیامە. "بەلێ، ژیانا فلان کەسی گەلەك باشە، ژبەر وێ کۆ گەلەك زەنگینە". ئان بەرڤاژی "ژیانا فلان کەسی کارەساتە، ژبەر وێ کۆ گەلەك خزان ئوو نەدارە". ب راستی جهێ بێئومێدی یا منە کۆ برریاردان ل سەر باشی ئوو خرابی یا ژیانێ د جڤاکێ دا ژیانا ماددی بت.

هەلبەت، هەمی کەسان دبێ ژیانەکا خوەش ئوو هەژی هەبت، لێ هندی ئەز دبینم، کۆمکرنا دراڤی ب تەنێ بناغەیێ ژیانەکا باش دانامەزرینت. رەنگە کۆمکرنا دراڤی رێ یا زەنگینبوونێ بت لێ رامانا وێ نە ئەوە کۆ رێ یا ژیانەکا خوەش ئوو هەژی بت. ژبۆ ڤێ ئاریشەیێ بەرسڤەکا ساناهی هەیە. ب دیتنا من، چاوایی یا زەنگینیێ ژ زەنگینیێ ب خوە گرانبهاترە ئوو خوەشی یا کارکرنێ ژ بەرژەوەندی یێن وێ یێن ماددی زێدەترە.

ئارمانجا هندەك ژ دامەزرینەرێن بنکە یێن پیشەسازی تەنێ بدەستڤەئینانا داهاتی ئوو جەماندنا پارەیی یە. مومکنە کۆ ئەڤ هەمی ئارمانجا ژیانا وان ژی بت. ژبەر وێ، هەمی گاڤان تووورە ئوو ئالۆزن ئوو خەمێ ل دراڤێ خوە دخوەرن. ل ئالیەکێ دی، هندەك سەرمایەدانەر هەنە کۆ تەنێ ژبۆ سەرکەڤتنێ ئوو خوەشی یێن گەهشتنا ب سەرکەڤتنێ د ژیانێ دا دخەتبن. هەلبەت کەس نکارت ماندەل بکت کۆ ئارمانجا هەمی

کەسان د چالاکی یێن بازرگانی دا بدەستڤەئینانا دراڤی یە. لێ ئەز باوەرم کۆ هەبوونا هەر بنکەیەکی نابت تەنێ ژبۆ بدەستڤەئینانا بەرژەوەندیان بت ئوو گوهێ خوە نەدت تشتێن مەعنەوی.

ل بەرانبەری شەریکە یێن کۆ تەنێ ژبۆ بەرژەوەندی ئوو فەزەنجێ دخەتبن، شەریکە ژی هەنە کۆ ژبۆ ئاڤەدانکرنێ ئوو سەرکەڤتنێ دخەتبن. ب نهێررینا هەوە، کی ژ ڤان کەسان ژیانەکا خوەشتر هەیە؟ تشتەك ژبۆ من گەلەك زەلالە. کەسێن کۆ گەلەك ژ مال ئوو مەنالی حەز دکن چ جاران د ژیانا خوە دا شا ئوو رازی نینە، ژبەر وێ کۆ تەماعی ئوو مالدۆستی یا وان بێ بنە. ب تەماعی ئوو دنیاپەرێسیێ زەنگینەکێ کۆ ٩٩ تشت هەنە دکارت کەسەکێ دی بکوژت کۆ تەنێ تشتەك هەیە. ئەڤ کوشتن تەنێ ژبەر وێ یە کۆ ئەو ژبۆ تشتێن ژیانا خوە دژیت ئوو چ جاران ب راستی نەژیایە ئوو د رامانا ژیانێ نەگەهشتی یە. تەماعی ئوو مالدۆستی بێ دووماهی نە. کەسەکی بئینن پێش چاڤێن خوە کۆ ب درێژی یا تەمەنێ خوە زەهمەت کێشایە ئوو ب زەهمەتی ئوو زۆریەکا زەهف بوویە خودان خانیەك. لێ پاشی پێ دحەست کۆ دەردۆرا وی تژی خانی یێن باشتر ئوو مەزنترە. تەماعی ئوو مالدۆستی بێگومان دێ وی پال بدن کۆ خانیەکێ باشتر ئوو مەزنتر بخوازت. ئەز باوەرم کۆ ئارمانجا سەرەکی یا ژیانێ نەکۆمکرنا ملك ئوو مالی یە. خوە هلکێشانا ب زەنگینیێ ئوو دراڤی ب نهێررینا من گەلەك ئەحمەقانە یە. ب نهێررینا من، ئەڤ ب وێ رامانێ یە کۆ وی کەسی چ تشتەکێ گرنگتر د ژیانێ دا نینە، لەوما خوە ب مالێ خوە هلدکێشت. ئەگەر هون شەهنازیێ ب مالێ خوە بکن، ب کێماتی ب چاوایی یا مەزاختنا وی مالی شەهنازیێ بکن نە ب زێدەیی یا وی. ژبەر وێ، ئەگەر کەسەك پارەیەکێ ستوور بجەمینت ئوو نەزانت چاوا بمەزێخت ئوو مفایێ بگەهینت خەلکێ دی، ئەو ب راستی مرۆڤەکێ خزان ئوو نەدارە.

زەنگین ب درستی ئەو کەسە کۆ دزانت چاوا ب پارەیەکێ کێم مفایێ بگەهینت خوە ئوو خەلکی. ب گۆتنەکا دی، نەداری ئوو زەنگینی یا هەر کەسەکی گرێدایی چاوایی یا بکارئینانا مالێ وی یە.

ئەگەر ئەم بخوازین ڤی بابەتی کوورتر شرۆڤە بکین، دبێ ببێژم کۆ هون نابت تەنێ خوە ب خوەدی یێ مال ئوو دراڤێ خوە بزانن. هزرێن وەها دێ تەماعی ئوو مالدۆستی

یا هەوە ژبۆ کۆمکرنا مالی خورتتر بکن. هەستەکا وها ژی چ جاران ناهێت تێرکرن ئـوو هێـدی هێـدی بـەرێ مرۆڤـی ددت کـارێن نـەرائێك. فـەلاتی (= مەسـیحیەت) بەهـسا چاڤدێری یـا مـالی دکـت. رامانـا وێ ئـەوە کـۆ هـەمی زەنگـینی ئـوو مـالێ هـەوە ل ڤـێ جیهانێ یێ هەوە نینـە، ئـەو ئەمانەتەکـە ل نـك هـەوە ئـوو تـەنێ هـون چاڤدێرێن وی مالی نە. شرۆڤەیەکا وها بەرپرسیاری یا پاراستن ئـوو مفاوەرگرتنـا درسـت ژ دراڤـی ژی دگەل خوە دئینت. ئەز ب خوە ژ گۆتن ئوو باوەری یـێن وهـا گەلـەك حـەز دکـم. مـرۆڤ هەمی دمرن ئوو ئەگەر هەمی مرۆڤ ژی بمرن، دیسا ژی ئەڤ جیهان هەر دێ بمینت ئوو هەتاهەتایی یە. تشتێ کۆ هون ب مالێ خوە دزانن، پشتی مرنا هەوە مـالێ کەسـەکێ دی یە. ژبەر وێ دبێ ئەم ل بەرانبـەری ڤانوونـا خوەرسـکێ خوەشـکاندی ئـوو نـەرم بـن. ب گۆتنەکا دی، بدەسـتڤەئینانا مـال ئـوو مـەنالی دەسـتپێکا زەهمـەتی ئـوو زۆریانـە. دیـنێ بـوودایی دبێـژت کـۆ خوەگرێنـەدانا ب مـالێ دنیـایێ رێ یـا سـەرەکی یـا مرۆڤـی ژبـۆ گەهشتنا ب بلنداهی یا ئازایی ئوو رزگاریێ ئـوو بەختـەوەری یـا سـەربەردایی یـە. هـەر چندە کۆ ئەز رێڤەبەرێ بنکەیەکێ مەزن یێ کاروەری مە، گەلەك ژ کۆمکرنا مالی حەز ناکم. کەسێن کۆ دهزرن دامەزرینەرێن بنکە یێن پیشەسازی تەنێ ژبۆ جەماندنا دراڤی دخەتبن چ جاران ب وێ خوەشـیێ ناحەسـن کـۆ پـشتی سـەرکەڤتنا خـەباتا دامەزرانـدنا کارەکێ بەرهەمدێر ئان خزمەتکاریەکا مەزن بدەستڤە دهێت. ئەز کۆ ٢٤ چاخکێن شەڤ ئوو رۆژێ ژی ژبۆ کارێ خوە کێم دبینم، رەنگە ژ هندەکان وەرە دین بم کـۆ چـما هۆسـا ژبۆ جەماندنا دراڤی ئوو بەرژەوەندی یێن خوە ناخەبتم.

لێ من ژیانا خوە وەکی دینـان ب کـاری ڤـە دەربـاز نـەکری یـە دا چـەند پارەیـەکێن کێم بجەمینم. ئەز ب راستی هۆگرێ کـاری مـە ئـوو تـەنێ ژبـۆ خوەشـی یـا گەهـشتنا ب سەرکەڤتنێ ل ڤان سالێن درێژ هۆسا ب رژدی خەبتیمە. هەبوونا مالی ئـوو زەنگـینی ب چ ئاوایـەکی وەکـی خوەشـی یـا دامەزرانـدن ئـوو رێڤـەبرنا سـەرکەڤتیانە یـا بنکەیـەکێ بازرگانی ئان پیشەسازی نینە. تشتێن کۆ من نەچار دکن زێدەتر خوە مانـدی بکـم ئـوو بخەبتم خوەشی یا سەرکەڤتنا د کارەکی دا یە کۆ خەلکێ دی دبێژن کارەکێ نەمومکنـە، وەکی رێککەڤتنا ل سەر پەیماننامە یێن باوەرپێکری ئـوو بەرهـەمئینانا پـەرتالێن بـاش

ل ئاستێ سووكێن جیهانی. ئەڤ ئەو تشتن كۆ رامانێ ددن ژیانا من ئوو كانی یا چالاكی یێن بێ دووماهی یێن من بوونە.

ئەگەر هون زەنگینترین كەس ژی بن، هون نكارن ببن خودانێ هەمی تشتان، ژبەر وێ كۆ زەنگینی ئوو مالداری بەرتەسكن. لەوما ئەز ناخوازم وەكی كەسەكێ زەنگین د هزر ئوو بیرێن خەلكی دا بینم. ئەز تشتەكێ هۆسا وەكی بێ-رێزكرنەكا خوە دبینم، نە پەسندانەك. ئەڤ وەسفاندن دبێژت كۆ چ تشتەكێ دی یێ هەژی یێ گۆتنێ د من دا نەبوویە. لێ ئەز دخوازم وەكی كەسەكێ خوەماندیكەرێ پرربزاڤ یێ سەركەڤتی د بیرا خەلكی دا بمینم. تەنێ سەركەڤتنێن مرۆڤانن كۆ هەتاهەتایی نە.

**بەهرا هەڤتیێ**

# كێمانی یا ئافرینكار

ئەڤرۆ هندەك جاران دبێژن ئەمریكاییێ "دێویێ سەرنخوونبوویی". ل وێدەریێ بنەما یێن ئەخلاقی بەر ب نەمانن ئوو ژ مێژە یە كۆ فرقە یا پیووریتەنان[1] كۆ بانگ ژبۆ خوەماندیكرنێ ئوو خەباتێ دكر بەر ب كزی ئوو ژبیرچوونێ دچت. توندووتیژی، تاوانكاری ئوو مادە یێن موخەددەر مرۆڤ هەرفاندنە ئوو گەلەك ژ جوانێن ئەمریكاییێ دخوازن كۆ پررانی یا ژیانا خوە ژبۆ گەرریانا ل دووڤ كەلەجانێن دەمكورت دەرباز بكن. د نیڤەكا ڤێ هەمی ئالۆزییێ دا، هندەك كەس ژی هەنە كۆ ب رژدی دەرسێ دخوینن ئوو ژبۆ هەلاتنا سبەهیەكا باشتر ب هەمی شیانا خوە لێكۆلینان دكن ئوو كێمانیەك ژی هەیە كۆ ب زەهمەتیەكا زەهڤ بزاڤێ دكت نەهێلت پێشكەڤتنێن مەزنێن ئەمریكاییێ ژناڤ بچن. ب نهێررینا من، ئەو رێبەرێن جڤاكا مەزن یا ئەمریكاییێ نە.

ئامار ئوو هژمار دبێ مە نەخاپینن، ژبەر وێ كۆ ئامار ئوو هژمار تەنێ چەندایی یا تشتان دبێژن. ژبۆ میناك ئەگەر مە ١٠٠ بەراز ئوو مرۆڤەك هەبن، هژمارا ١٠٠یێ ل بەرانبەری هژمارا ئێكێ یە. ب ڤی ئاوایی هژمار دكارن مە بخاپینن. هژمار ب چ ئاوایەكی هێزا راستین یا كێمانییێ دیار ناكن.

"تووین بی" دبێژت: كەسێن كۆ هاریكاری یا پێشكەڤتنا بازاروواری یا (= شارستانیەتا) فەرهەنگێ (= كولتۆرێ) جڤاكا خوە دكن "كێمانی یا ئافرینكار"ن كۆ گەلەك ژی هندك ئوو كێمهژمارن. لێ باندۆرا ڤان كێمانیان ب رێژە یا هژمارا وان نینە.

---

(١) پیووریتەنیزم (Puritanism) بزاڤەكا دینی د ناڤ دێرا ئنگلستانێ دا بوو كۆ ل سەدسالا ١٦یێ دەست پێ بوو ئوو دخوەست كۆ ب ناڤێ چاكسازی ئوو پاكژكرنا دینی هەڤسەنگیەكێ بئێخت ناڤبەرا پرۆتستانیزم ئوو كاتۆلیسیزمێ.

هێزا وان یا ئافراندنێ ئوو نووخوازیێ باندۆرا وان دیار دکت. ئیلهام ئـوو ڤەرێـژا هـزرا ڤێ کێمانییێ هاریکاری یا پررانـی یـا نەئافرینـەر دکت کۆ پـشکداری پێـشکەڤتنا جڤاکا خـوە بـبن. ئـەڤ ئـەرك ئـوو بەرپرسـیاری یـا کێمـانییێ د راسـتا جڤـاکێ دا یـە ئـوو بـێ هاریکاری یا وان فەرهـەنگ (= کولتـۆر) ئـوو جڤـاك چ پێـشکەڤتنێ ب خـوە ڤـە نـابینن. ئـەرکێ کێمـانییێ یـە کـۆ پررانـی یـا نەئافرینـەر باشـتر بکـن ئـوو بپـەروەرینن دا ژبـۆ پێشکەڤتنا دیرۆك ئوو فەرهەنگێ جڤاکا خوە بخەبتن. ئەگەر کێمانی وها نەکن، جڤـاك ئوو باژاروارى بلەزتر بەر ب نەمانێ دچن. خەندقاندنا ڤێ کێمـانییێ ژی بـەر-ب-نـەمان-چـوونا جڤـاکێ ئـوو فەرهـەنگی ب دوو خـوە را دئینـت. دەمـا شـیانێن ئافرانـدنێ ژبـۆ پێـشدابرن ئـوو وەرارا جڤـاکێ نـەهێن بکارئینـان ئـوو دەمـا کێمـانی یـا ئافرینـەر دبـت کێمانیەکا هەڤسارکری، جڤـاك بـەر ب نـەمان ئـوو ژناڤچوونێ دچـت. ئەگـەر رێبـەرێن جڤاکێ بەرێ خوە بدن خوەشی یێن ژیانێ ئوو رابوارتنێ، گیانێ خەبات ئوو ڤەبخوازیێ نامینت ئوو جڤـاك بـەر ب هـەررفیان ئـوو نـەمانێ دچـت. ئـەڤرۆ ئـەم ب خـوە دکـارین نموونـە یـێن ئەشـکرا یـێن لێکـۆلینێن "تـویین بـی" د جڤـاکێن جۆربجـۆر دا ببیـنین. بەرپرسـیاری یـا پێـشکەڤتن ئـوو پێـشدابرنا فەرهـەنگی ئـوو بـاژاروارى یـا جڤـاکێ ئـان پالدانا وێ بـەر ب نـشیڤی یـا نـەمان ئـوو ژناڤچوونێ ل سـتوهێ کێمـانی یـا ئافرینـەرە. ئەگەر د هەر جڤاکەکێ دا رێبەر هەست ب بەرپرسیاریتی یێن خوە بکن ئـوو خـوە ژبـۆ وان بەرپرسیاریتیان تەرخان بکن، جڤـاك چ جـاران بـەر ب پاشـڤە ئـوو بـەر ب نـەمانێ ناچت. ئەڤ بنەما شەریکەیان ئوو نەتەوەیان ژی ڤەدگرت.

ل هەمی ئاستێن جڤاکێ، کتەکەسان ژبۆ وەرار ئوو پێشکەڤتنا خوە رێبـەرێن دلـسۆز ئوو ئافرینەر دڤێن. هون دبێ ببن کەسێن ئافرینەر، کەسـێن کـۆ ژبـۆ پێـشکەڤتن، وەرار ئوو بەختەوەری یا جڤاکا خوە ئوو مرۆڤانتییێ دخەبتن. رەنگە هون بپرسن کا دێ چاوا ببن ئەندامێن کێمانی یا ئافرینەر. ڤێجا، ئەز بەری هەر تـشتەکی دێ ببێـژم هـون نـابێ وهـا بـن: کەییـسپەرێس ئـوو هەلپـەرێس، تەماشـەڤان، شکەسـتنپەژرین (= کەسـێن کـۆ شکەستنێ ل سەر خوە قەبوول دکن ئوو دپەژرینن) ئوو بێئومێد.

تشتێ کۆ هون حەوجەدارن نهێررینەکا بەرفرەھ ژبۆ کارێن ئاڤاکـەر ژبـۆ نەتـەوە یـا هـەوە ئـوو خـەلکی ئـوو هاریکاریکرنـا پێـشکەڤتنا فەرهـەنگ ئـوو بـاژاروارى یـا مرۆڤانتییێ یە.

ل دەمێن گەلەك گەلەك كەڤن، گەلێ جهوو ژ مسرێ مشەخت بوون ئوو ٤٠ سالان ل ئەردێ سۆزدایی (= مەعهوود، وەعدەكری) دگەرریان. ئەڤ گەل بەر ب ئەردێ كەنعانێ چوون، ولاتەكێ كۆ خودێ بەرەكەت دابوویێ ئانكۆ هەر ئەو ئەردێ كۆ هاتبوو وەعدە كرن. لێ كەنعانی ل وی ئەردی بوون. ژبەر وێ، جهوویان دەستەكەكا ١٢ كەسی هنارت كەنعانێ دا رەوشا گشتی یا كەنعانیان بخوینت. پشتی ڤەگەررریانێ، دەھ كەسان ژ وان ١٢ كەسان بێئومێدانە سەرێ خوە هەژاند ئوو گۆت كۆ داگیركرنا وی وەلاتی نەمومكنە. كەنعانی ژبۆ بەژن ئوو بال ئوو قەلافەتا خوە ژ جهوویان پەیتر بوون ئوو كەلهە ئوو شووریێن لەشكری ژی هەبوون. ڤان دەھ كەسان چ هیڤی ب سەركەڤتنا جهوویان د شەررێ دژبەری كەنعانیان دا نەبوو.

لێ دو كەس ژ ئەندامێن دەستەكا ناڤبری وەسا نەدهزرین. وان دگۆت جهوو نابت ژ چ بترسن، ژبەر وێ كۆ كەنعان ئەردەكە كۆ خودێ سۆزدایە جهوویان. لێ ئەڤ دو كەس بێگومان كێمانیەك بوون: دو كەس بەرانبەری دەھ كەسان. ئەگەر برریارا ئێریشێ ل گۆرە یێ نهێررینا پررانیێ هاتبا دان، جهوویان چ جاران خوە ل كەنعانیان راست نەدئینا. لێ ژبەر گەنگەشە ئوو دەلیلێن دو كەسان، جهوویان برریار دا كۆ پلانا ئێریشێ بجه بكن ئوو ل دووماهیێ ژی ئەو وەلات گرت. ئەڤ دیار دكت كۆ پررانی ب تەنێ نكارت برریارێ ل سەر دیرۆكێ بدت.

برریاردانا ل سەر راستی ئوو درستی ئان شاشی ئوو چەوتی یا تشتان ئاغلەب ل دەرڤە یێ شیانێن پررانیێ یە. ئەڤ دەرسەكە كۆ ئەم ژ داگیركرنا وەلاتێ كەنعانێ ژ ئالی یێ جهوویان وەردگرین. لێ ئەو دو كەسێن كۆ ل گۆرە یێ تەوراتێ ئەم ب ناڤێن "یووشاین نوون" ئوو "كالب" دنیاسین، كێمانیەكا ئافرینەر بوون ئوو ئافرینەری ئوو گیانێ ڤەبخوازی یا وان، جهوو بەرب ئەردێ سۆزدایی هاژۆتن.

كێمانی یا ئافرینەر ئەرینی نە. ئەو دناڤ گومانداری ئوو بێئومێدیان دا چروسكێن ئومێد ئوو گەشبینیێ هەل رادگرن. كێمانی یا ئافرینەر باوەری ب پێشكەڤتنا فەرهەنگان هەیە ئوو لڤ ئوو لەباتەكا زێدەتر ددن چەرخێن دیرۆكێ ئوو وەرار ئوو پێشداچوونا جڤاكا مرۆڤانتیێ. ئەز هیڤیدارم كۆ ژبۆ خاترا دیرۆك ئوو باژرواری یا مرۆڤانتیێ، هون ژی ببن ئەندامێن كێمانی یێن ئافرینەر ئوو بەرپرسیارێن دلسۆز.

دەستپێكا دیرۆكا نوو یا مرۆڤان ب تڤاڤی د دەستێن هەوە دا یە.

**بەهرا هەشتیٚ**

# زیانیٚن تەنبەلییٚ

نڤشیٚ جوان تژی روحا قەبخوازییٚ یە دا گوهاررتنان د رەوشا خوە یا نها دا چیٚ بکت ئوو تشتیٚن نەمومکن بجەربینت. ئەڤ سالۆخەت، فۆناخا جوانی ئوو لاوینییٚ بهادار دکن ئوو تازەیی ئوو دلگەشییٚ مسۆگەر دکن. نڤشیٚ جوان ژ شکەستنیٚ ناترست. کەسیٚن کۆ ژ شکەستنیٚ دترسن ئوو ژ رەوشا خوە یا هەیی رازی نە، ل هەر تەمەنەکی بن، جوان نینە. کەسیٚن کۆ روحا قەبخوزاییٚ ئوو سەربهورخوازییٚ هەیە ئوو ل سبەهیەکا باشتر دگەرن، ل چ تەمەنەکی بن، دیسا هەر جوانن.

نڤشیٚ جوان ئافرینەریٚن جیهانا سبەهی نە. ئەو ب روحا قەبخوازییٚ سبەهی ئاڤا دکن. ژبەر ویٚ کۆ جوانان چ دوهی نینە، هەمی گاڤان ل سبەهی دفکرن ئوو بەریٚ وان ل ئاسۆ ییٚن دوورەدەست ئوو گەشە. وان چ تشتەك نینە ژ دەست بدن، لەوما تووشی ئالۆزی ئوو شەوشینیٚ ژی نابن، چ مەترسیان نانیاسن ئوو هەمی گاڤان دلگەش ئوو دلشا نە.

ژبەر ویٚ کۆ نڤشیٚ جوان د فۆناخەکا وەسا ژ ژیانیٚ دا نیە کۆ د هزرا پاراستنا رەوشا هەیی دا بت، ئەگەر جوانەك ژبەر تەباتا ژیانا خوە ژ تەجریبەکرنیٚ حەز نەکت ئوو بەریٚ خوە ژ گوهاررتنا رەوشا هەیی وەربگیٚرت، ئیٚدی جوان نینە. جوان، پاشەرۆژیٚ پرر ژ سەرکەڤتن ئوو دەستکەڤتی دبینن ئوو دەرفەتەکیٚ نابینن کۆ هزرا شکەستنیٚ بکن ئان ئالۆزیٚ زیانیٚن نەهاتی ببن.

هون دبیٚ بزانن کۆ گرنگیدانا ب رەهەتییٚ ئوو پاراستنا رەوشا هەیی، نیشانیٚن نەمانا جوانییٚ نە. جوان هەر کارەکی دەست پیٚ بکن، چ کت-کت چ کۆم-کۆم، ب روحا قەبخوازییٚ دەست پیٚ دکن. ئەڤ ژ ژینەوەری یا دلگەشانە یا جوانانە. هون ل مشەختیٚن

ئەمریکایی یێن دەستپێکێ تەماشە بکن، کەسێن کۆ ب بەرچاڤنەگرتنا رەوشا هەیی چووبوون ئەمریکایێ. بئینن بەرچاڤێن خوە کا وان مشەختان، ل دەما کۆ بەر ب ئەردێن وەها پررمەترسی، دوورەدەست ئوو نەنیاس دچوون، چ هزر دکر. ئەو جوان بوون ئوو تژی روحا قەبخوازی ئوو سەربهوورخوازیێ بوون ئوو چ تشتەکی شیانا راوەستاندنا وان نەبوو. ئەو ئەمریکا یا جوانێن دوهی، نە ئەڤ ئەمریکا یا خوەشیخوازا ناڤسالڤەچوویی یا ئەڤرۆ بوو.

تشتەکێ خوەرسکی یە کۆ کارمەندێن نوو-دامەزرییایی تژی کەلەجان ئوو ڤیانا کاری بن. ئەو دبێ جوانی یا خوە یا ئەڤرۆ ژبۆ ئافراندنا سبەهیەکا گەش بمەزێخن. ئەو دبێ باش خوە ماندی بکن ئوو باش دەرسێ بخوینن. ڤەرێژا ڤان بزاڤان سەرکەڤتنا بەر ب پلە یێن بەرزتر ئوو بدەستڤەئینانا داهاتێن دراڤی یە. ئەڤ بەرسڤا خوەرسکی ئوو ئەدەتی یا کارێ وان جوانانە کۆ ژینا خوە ئوو لاویتی یا خوە ژبۆ پێشکەڤتنا ژیانێ دکن سەرمایە.

لێ هندەك جاران هەر ئەڤ جوانێن تژی ژیان، پشتی گەهشتنا ب پلە یێن وەکی رێڤەبەرێن کارگێریێ، دبن مرۆڤێن تەنبەل یێن کۆ دەستی ژ خویندنێ ئوو قەبخوازیێ بەرددن ئوو ئێدی چ کەلەجان ئوو ڤیانەکا پێگەهاندنا خوە د وان دا نامینت. ئەو ژی هێدی هێدی تووشی نەساخی یا "کارکرنا ژبۆ راکرنا ئەرکێ ل سەر ملێ خوە" دبن ئوو ب هەمی رەنگان تەنێ دفکرن کا چاوا مالێ خوە ئوو جهێ خوە بپارێزن. ب نهێررینا وان، ئەو ب هەمی وان تشتان را گەهشتنە کۆ ل پەی بوونە، ژبەر وێ ب ئاوایەکێ ناڤنجی (= موتەوەست) کاردکن ئوو تێرا خوە بێهنا خوە ددن. مخابن کۆ ئەو نزانن ب تەنبەلیێ بەر ب زەوال ئوو نەمانا خوە پێنگاڤان دهاڤێژن.

هون نابێ دەلیڤەیەکا وەسا بدن خوە کۆ ببێژن، بەلێ ئەز ب هەمی تشتێن کۆ من دخوەستن را گەهشتمە ئوو بسەرکەڤتمە. رازیبوونا تڤاڤ ژ هندێ کۆ هون ب هەمی تشتێن دلخواز را گەهشتنە، پررمەترسیترین دەمێن ژیانا هەوە نە. دەما هون دگەهن ئارمانجەکا خوە، دبێ ئارمانجەکا مەزنتر ئوو بلندتر ل پێش خوە دابنن. هون دبێ هەر گاڤ بفکرن کۆ هێشتا هون نەگەهشتنە ئارمانجا سەرەکی ئوو راستینا خوە. ژبۆ میناك، رەنگە ئارمانجا هندەك ژ هەوە ئەو بت کۆ باشترین شاگردێ پۆلا خوە بن. ژبەر وێ

هون باش دەرسێ دخوینن دا بگەهن وێ ئارمانجێ. پشتی هون دگەهن وێ ئارمانجێ، نابت هون ب ژخوەرازیبوون ڤە ل کوژیەکی بروونن، دبێ هون ئارمانجەکا مەزنتر ژ خوە را دیار بکن. ژبۆ میناك، ڤێ جارێ بزاڤێ بکن ببن باشترین خویندکارێ زانینگەهێ. پشتی هون دبن باشترین خویندکارێ زانینگەهێ ژی، دیسا ژ خوە رازی مەبن. هون دبێ ئارمانجەکا مەزنتر ئوو بلندتر ل پێش خوە دابنن. ژبۆ میناك، بزاڤێ بکن د هەمی دەرسان دا بلندترین دەرەجەیان بدەستڤەبئینن.

نەکارەکێ ساناهی یە مرۆڤ ببت باشترین خویندکارێ زانینگەهێ. لەوما، دبێ هون هەتا دکارن بزاڤێ بکن دا بگەهن ئارمانجا خوە. لێ مانا ل جهێ باشترین خویندکاری ژ گەهشتنا ب وی جهی زەهمەتترە. ژبەر وێ کو رەنگە هون ب ساناهی بکەڤن داڤا ژخوەرازیبوونێ ئوو تەنبەلیێ ئوو بەری هون ب خوە بحەسن، ببینن کو هون ئێدی نە باشترین خویندکارن ئوو کەسێن دی ب هەوە را گەهشتنە ئوو ژ هەوە ژی دەرباز بوونە.

هندەك بەرژەنگ هەنە کو نیشا ددن هون دبن جوانەکێ تەنبەل. دلری-بوون ئێك ژ ڤەرێژێن تەنبەلیێ یە. مەلەل دبت سەدەما کێمبوونا چالاکیان. هون چ جاران نابت چالاکی یێن خوە کێم بکن. چالاکی ئەگەرا وەرار ئوو پێشکەڤتنا ژیانێ یە ئوو چالاکی موهانە یا هەبوونا مرۆڤی یە. بزاڤ سەدەما وەرارێ ئوو بنەمایێ ژیانێ یە. چالاکی نیشانا هندێ یە کو هون بوونەوەرەکێ ژینەوەر (= زیندی) ئوو زایینن (= دزێن). مری بێ لڤ ئوو بزاڤن ئوو ئەگەر هون ژی بێ بزاڤ بن، رەنگە هون ژی سالەکێ-دوان، ئان ژی زێدەتر، ل جهەکی بمینن ئوو پێش نەکەڤن. دەما جوان دەست ژ ڤەبخوازیێ بەربدن، ئێدی چ هیڤی ژبۆ پاشەرۆژا وان نینە. ئەڤ دەرهەڤا هەمی جوانان دا، ب کت ئوو ب کۆم، راستە. نەمانا دلگەشیێ د جوانان دا، ل هەمی ئاستێن جڤاکێ، رامانا وێ مرن ئوو نەمانا نڤشێ جوانە. دەما مرن ل پێش بت، هیڤی نامینت. دەما دلگەشی ئوو لاویی ئوو هیڤی وندا دبن، چ د کەسەکی دا، چ د کۆمەکێ دا، چ ل دامەزریاییەکێ، چ د جڤاکەکێ دا، هنگی دەما هندێ هاتی یە کو بەرهەڤی یا بەهی ئوو تازیەکێ بکین.

هون ژی رەنگە پێ حەسیا بن کو هندەك کەس د شەریکەیان دا زووکا پیر دبن. رۆژەکێ، برریار بوو کو ئەز ژبۆ کارەکێ خوە، سەردانەکا سەرۆکێ گشتی یێ

شەریکەیەکا بەرهەمهینانێ بکم. دەما ئەز چووم دیتنا وی، ئـەز ئـەجێب مـام کـۆ وی چ تشتەك ل سەر شـەریکە یـا خـوە نـەدزانی. ئـەز نەچـار مـام تـشتێ کـۆ مـن دخوەسـت ژ رێڤەبەرێ کارخانەیێ بپرسـم. هنگـی مـن گەلـەك پووتـە ب ڤـێ پرسـگرێکێ نـەکر. لـێ پاشـی، دەمـا ئـەز پـێ حەسـیام کـۆ تـرومبێلا وی سـەرۆکێ گـشتی ژ تـرومبێلا مـن ژی مەزنتر ئوو کەشخەترە، ئەز گەلەك خەمگین بووم. هنگی من زانـی کـۆ نابـت گەلـەك ل پاشەرۆژا شەریکەیێ گەشبین بم. ئەز پێ حەسیام کۆ سەرۆکێ گشتی یێ وێ شـەریکەیێ وەسـا نقـوومی خوەشـیان بوویـە کـۆ چ هـزران ل پێـشکەڤتن ئـوو پاشـەرۆژا شـەریکەیێ ناکت. ئەو مرۆڤەکێ تەنبەل بوو. ئـەز گەلـەك جـاران پـێ حەسـیامە کـۆ تەنبـەلی ئـوو لاشپەروەری بوونە سەدەما دووماهیهاتنێن وەسا.

ژ بیر مەکن تەنبەلی ل قۆناخا جوانییێ شکەستنێ مـسۆگەر دکـت. پاراسـتنا ئاسـتەکا ناڤنجی ئوو تێرا خوە، دالغە ئوو خیالێن وەسا نە کۆ دبێ خـوە ژێ بپـارێزن. دبـێ هـون هـزرێن خـوە وەسـا رێـك بئـێخن هـەروەکی کـۆ هـون هێـشتا ب چ ئارمانجـەکا خـوە نەگەهشتنە ئوو هون وەکی جوانەکی بەرهـەڤن کـۆ ب کەلـەجان ئـوو شـەوق ئـوو زەوق ژبۆ هەر بزاڤەکێ خوە تەرخان بکن. پاشەرۆژ یا هەوە جوانانە ئوو پاشـەرۆژا مـە ژی د دەستێن هەوە دا یە.

**بەهرا نەهێ**

# جۆتكار ئوو كاركەرێن زەڤيان

هون، كۆ ل باژارێن مەزن دژين، رەنگە تشتەكێ وەسا ل سەر ڤى بابەتى نەزانن. لێ د زەڤى يێن چاندنا برنجێ دا گيا يێن بێ مفا گەلەك هەنە كۆ ب رەخ بنێين برنجێ ڤە شين دبن. ژبۆ هندێ كۆ بنێين برنجێ باش مەزن ئوو پەيت ببن، دبێ زەڤى بهێن ئادەكرن.

ب ئاوايەكێ ئەدەتى، جۆتكار ژ كاركەرێن زەڤيێ دخوازت كۆ زەڤيێ ئادە بكن ئوو كاركەر ژى رۆژێ هەميێ مژوولى ڤى كارى دبن. لێ ئەگەر جۆتكار رۆژا پاشتر سەرى ل زەڤيێ بدت، مومكنە ديسا گيا يێن زێدە ببينت. جۆتكار دكارت گەلەك جاران كاركەران ژبۆ ئادەكرنا زەڤيێ بهنێرت. لێ هەتا جۆتكار ب خوە ژبۆ ئادەكرنێ نەچت ناڤ زەڤيێ، هندەك گيايێ زێدە هەر دناڤ زڤيێ دا دمينت. چما؟ سەدەما وێ ئەوە كۆ جۆتكار وەكى خودانێ زەڤيێ، گەلەك ژ زەڤى يا خوە حەز دكت، لێ كاركەرێ زەڤيێ هەستەكا هۆسا نينە. زەڤى نە يا وى يە. ژبەر وێ كۆ جۆتكار خودانە، ب گەرمى ل پەى وان كاران دچت كۆ زەڤى يا وى باشتر دكن.

كاركەر ل پەى كارى ناچت ئوو هەرگاڤ ژى ب گازندە يە كۆ بۆ چ كارەكى كۆ خەلكێ دى ناكن، دبێ ئەو بكت. ئەگەر كارێ وى نەئينن بيرا وى، هەما ببێژە چ كارەكى ناكت ئوو دێ بێهنا خوە بدت.

ب ڤى ئاوايى، هون نهێررينا جۆتكارى ئوو كاركەرى بەرئێك ڤەبدن. ئەگەر ئەم پەچەكێ ل هەررفيانا ئابۆرى يا سوشياليستى يا ئەڤرۆ مێزە بكين، دێ ببينين كۆ هەتا رادەيەكێ نێزيكى ڤى جورەيێ هزرينێ يە. ببێژە هەما هەمى هەست دكن كۆ كاركەرێن زەڤيێ نە.

ئەگەر هون ل دەردۆرا خوە بنهێررن، هون دێ هندەك كەسان ببینن كۆ نە هەما كارێ خوە ب درستی ئوو ب تفاقی دكن، ببێژە كارێ خەلكێ دی ژی دكن بێ كۆ كەسەكی ژ وان خوەست بت. ل ئالیەكێ دی ژی هندەك كەس هەنە كۆ هەتا ب بیرا وان نەئینی كارێ خوە ژی ناكن، چ بگەهەت كارێ خەلكەكی. ئەڤ جداتی د رفتارا كەسان دا ژبەر وێ یە كۆ هندەك خوە خودان دزانن ئوو هندەك ژی هەما خوە كاركەر دحەسبینن.

هون دبێ هەمی گاڤان خوە خودان بزانن ئوو ب ڤێ هزرێ كاربكن ئوو بژین. كەسێ كۆ هۆسا بهزرت چ جاران ئالۆزێ كاودانان ئوو مەرجێن كاری نینە. كەسێ وەسا ئافرینەر ئوو ئێكدلە. كارمەندێن كۆ هۆسا دهزرن دەورێن گرنگ د پێشكەڤتنا شەریكە یێن خوە دا دگێرن. لێ كەسێن كۆ وەكی كاركەرێن زەڤیان دژین، ل بەرانبەری مووچەیەكێ هەیڤانە، تەنێ ب رادەیەكا ناڤنجی كار دكن ئوو وان كاران دكن یێن كۆ سەرۆكێن وان ژ وان دخوازن ئوو رەنگە ژبۆ كرنا وان كاران ژی باش خوە ماندی نەكن. شەریكە یێن كۆ كارمەندێن هۆسا هەبن پێش ناكەڤن. نهێررینێن هۆسا رێ یا پێشكەڤتنا مالباتێ ئوو جڤاكێ ژی دگرن.

نێزیكی دەه سالان بەری نها، ل رۆژەكا گەلەك گەرم یا هاڤینێ، هەیامەكێ پشتی چالاكی یێن "دێوویێ" ژبۆ ئاڤاكرنا ئاڤاهیان ل دەرڤەیی وەلاتی، ئەز ل شەریكەیێ دەردكەڤتم. من رێزەكا درێژ ژ خەلكی ل دەرڤەیی ئاڤاهیێ شەریكەیێ دیت. كەسێن كۆ د رێزێ دا بوون وەسا كێفخوەش ئوو دۆستانە نەبوون. دەما ئەز ڤەگەرریام شەریكەیێ، من دیت كۆ پررانی یا وی خەلكی ژن بوون ئوو هندەك ژ وان زارۆ یێن خوە ل پشتا خوە كربوون ئوو ل گەرما یا هاڤینێ خوە ددا. دەما من ژ بوویەرێ پرسی، ئەشكرا بوو كۆ مالباتێن وان كارمەندانن كۆ ژبۆ كارێ شەریكەیێ چوونە دەرڤەیی وەلاتی. بەرپرسێن كۆ دبیا ئاریشە یێن وان چارەسەر بكن ب ئاسوودەیی ل ئۆدە یێن خوە ل بەر بایێ هوونێ فەرەشینكان (= كوولەران، موبەریدەیان) روونشت بوون. ئەز ژبۆ ژن ئوو زارۆ یێن كۆ ل بن رۆژێ ل بەندێ بوون خەمگین بووم. ژبەر وێ كۆ ئەو ئەندامێن مالباتا "دێوو"یێ بوون. دگاڤێدا، من ژ كارمەندێن پەیوەندیدار خوەست كۆ ب زووترین

دەم کارێن وان بجە بکن. من سەرۆکێ بەرپرس ژی گەلەك لۆمە کر ئـوو مـن ژێ پرسـی کا دکارت تەنێ ژبۆ پێنج دەقیقەیان ل بن ڤێ رۆژا گەرم بروونت.

هەلبـەت وی موهانـە هـەبوون ئـوو گۆت کـۆ ئـۆدە یـا وی تێـرا وی خـەلکی هـەمیێ ناکـت. لـێ ب نهێررینـا مـن ئـەو موهانـە هـەمی نـاهێن پەژرانـدن. ئەگـەر بەرپرسـێ پەیوەندیـدار خـوە خـودانێ شـەریکەییێ بزانیبـا ئـوو خـەلکێ کـۆ ل دەرڤـە ل بەنـدێ ئەندامێن مالباتا "دێوو"یێ حەسباندبان، هنگی بێگومان دا رێیەکا ب لەز ژبۆ چارەسـەرا وێ ئاریشەیێ ڤەببینت. ب دیتنا من، چ عـوزر ئـوو موهانـە ژبـۆ راگرتنـا وی خـەلکی ل بەر رۆژێ نەبوون.

ئێك ژ خرابترین کاران ئەوە کۆ خـوە ل رەخ ئاریـشەیان دابـنین. ئەگـەر هـون عـوزر ئوو موهانە یێن زەهف ژبـۆ کـارێن خـوە بئیـنن، هەسـتا خـوە-خـودان-دیـتنێ د هـەوە دا نینە. هۆسا هون ب ساناهی دبـن تەماشـەڤانەکێ بـێ خـەم. گەلـەك مخابن کـۆ هنـدەك کەس دبێژن ڤۆناخا نها "چاخێ تەماشایێ".

خودان، وەکی جۆتکاری، تەماشەڤانەکێ بێ خەم نینـە، مرۆڤـێ کـارکرنێ یـە. لـەوما دبێ هون شێوازا هزرینا وەکی خودانان د خوە دا بهێز بکن. هـون دبـێ جۆتکـار بـن، نـە کارکـەرێ زەڤیـێ. ب ڤـی ئـاوایی، خـەلك دێ چاڤ ل هـەوە بکـن ئـوو هـون ژی دکـارن ب رژدی کارێن خوە بجە بکن. هون دبێ وەسا بهزرن کۆ هون تەنێ دکارن کـارێ خـوە بجـە بکن ئوو هون بناغە ئوو ئـامیرێن کـارێ خـوە نـە. ئەگـەر هـون هۆسـا بکـن، دێ ل کـارێ خوە رازیتر ببن ئوو شیان ئوو کێرایی یا هەوە ژی دێ زێدەتر ببت.

ژبۆ میناك، رەنگە هون ژی پێ حەسیابن کۆ خویندکارێن ژێهاتی نـە هـەما دەرسـێن خوە ب رێکووپێکی دخوینن، دەمێن بێهنڤەدانێ ژی ب فێربـوونێ ڤـە دەربـاز دکـن. وان خوەسەریەکا هزری یا زێدەتر هەیە، لەوما ژ فێربوونێ کێفخوەشتر دبن ئوو شـیان ئـوو هێزا وان ژی زووتر وەرارێ دکت. لێ خوێندکارێن لەواز نە وەسا نـە. ژبـەر وێ کـۆ ئـەو ب ئاوایـەکێ خوەسـەر دەرسـێ نـاخوینن ئـوو ب زۆر خـوە مانـدی دکـن، هنـدەك ژ وان ئەرکێن خوە یێن خویندنێ ژی بجە نائینن. خویندکارەکێ هۆسا نـە خوەشـیێ ژ دەرس خویندنێ دبت، نە ژی دەرس-خوین دبت. ئەو نکارت شیانێن خوە ژی زێدە بکت.

چ کەسەك نكارت ل شوونا هەوە بژیت. ژیانا هەوە یا هەوە ب خوە یە ئوو شێوازا ژیانا هەوە ژی گرێدایی وێ باوەریێ یە کۆ هەوە د هوندرێ خوە دا ب خوە هەیە. هون نكارن ژیانا خوە ئوو بەرپرسیاریتی یا د راستا وێ دا بئێخن سەر ملێن کەسەکێ دی. هیڤیدارم ژبەر نەزانینێ هەستا خوە-ب-خودان-زانینێ د هەوە دا نەمرت ئوو ل دووماهیێ نەبن کارکەرەکێ زەڤیێ. کاردار ئوو خوەدیێ خوە بن ئوو وەسا ژی بژین. ب باوەری یا ب خوە زانستی فێر ببن ئوو بژین. ئومێد ئوو ئارمانج یێن وان کەسانن کۆ د کارێ خوە دا خوە خودان دبینن.

بەهرا دەهێ

# کی دێ شیانێن نڤستی شیار بکت

هەوە ژی رەنگە سەرهاتی یا وێ دایکا لەواز ئوو کەڤتی بهیست بت کو ژبو ڤورتالکرنا پسێ (= کوررێ) خوە ژنشکێڤە ترومبێلەك بلند کر. ئەڤ میناکەکا راستین یا وان هێزێن مەزن یێن نەپەنی یێن مرۆڤانە. مرۆڤان شیانێن دەر-ژ-ئەدەتی هەنە. لێ ژبەر وێ کۆ شیانێن وەها ب ئاوایەکی نەپەنی د مەدا هەنە، ئەم چ جاران ب درستی ژ کووراهی ئوو هێزا وان هایدار نابین. کەسێن کۆ هایێ وان ژ شیانێن وان یێن نەپەنی هەیە د ژیانا خوە دا گەلەك سەرکەڤتی نە. لێ کەسێن کۆ ژ هێزێن خوە بێ ئاگەهن، ژیانا خوە ب ئاوایەکێ ئاسایی دەرباز دکن. ل گۆرە یێ لێکۆلینێن بەلاڤبوویی، هەر مرۆڤەك تەنێ ١٥ ژ سەدێ ژ شیانێن خوە یێن نەپەنی دخەبتینت. ژبەر وێ، ئەگەر ئەم تەنێ ٢٠ ژ سەدێ ژ شیانێن خوە بدین کاری، دێ ئەم هەمی ببین مرۆڤێن عەبقەری (= نابغە)، ئوو ئەگەر ٣٠ ژ سەدێ ژ شیانێن خوە بخەبتنین، دێ ببین قەهرەمانێن مەزن.

لەوما، دادوەرانە یە ئەگەر ببێژین هەر مرۆڤەکێ عەبقەری ئوو قەهرەمان شیانێن خوە یێن نەپەنی گەلەك زێدەتر ژ خەلکێ ئەدەتی دپەروەرینت ئوو پێشدا دبت. "ئێدیسۆن"ی ژبو هەر ئیختراعەکا خوە، هندەك جاران ٢٠٠ جاران ئان زێدەتر ژی ئامیرێ ئیختراعکری دجەرباند. "ئێدیسۆن"ی ب ماندینەنیاسیەکا زێدە بێقام شیانێن خوە یێن نەپەن پەروەراندن ئوو عەبقەریەتا نڤستی د خوە دا شیار کر. ل داویێ، ئەو بوو عەبقەریەك. باوەری ب خوە بوون گەلەك گرنگە. هەر کەسەك دکارت دراڤەکێ ستوور بدەستڤە بئینت ئوو گەلەك ژی ب هێز ببت. لێ پارە ئوو دەستهلات د ژیانێ دا تشتێن هاریکارن، نابت پشتی بدەستڤەئینانا وان مرۆڤ خوە بەرڤەبدت ئوو تەنبەلیێ

بکت. مرۆڤ هەرگاڤ دبیّ د بزاڤیّ دا بت، وەها نەکت دیّ بررزت. مرۆڤ ئەگەر ب بەردەوامی ژبۆ خورتترکرنا باوەری یا ب خوە ئوو پیّشکەڤتنا خوە نەخەبتت، دیّ د ژیانیّ دا بەر ب پاشڤە بچت. سەدەما ڤیّ ژی ئەوە کۆ پاراستنا رەوشا هەیی گەلەك دژوارە، هون نەچارن د ژیانا خوە دا ئان بەر ب پیّش ئان ژی بەر ب پاش بچن. دەما کۆ خەلك بەرب پیّش بچن ئوو هون تەنیّ بزاڤیّ بکن ل جهیّ خوە ییّ هەیی بسەکنن، د راستییّ دا، هون بەر ب پاشڤە دچن.

هون دبیّ ب ئاوایەکیّ ئافراندنکارانە ژبۆ پیّگەهاندن ئوو وەرارا خوە بخەبتن. "هانری ییّ بیّرگسۆن"[1] ، فەیلەسوٚڤیّ فەرەنسی جارەکیّ گۆت بوو "پیّشداچوون خوەرسکیّ ژیانیّ یە". هەمی بوونەوەر دبیّ چەلەنگانە وەراریّ بکن ئوو پیّشدا بچن ئوو ڤیّ ئیّکیّ ب بناغەییّ ژیانا خوە بپەژرینن.

لەوما، هون دبیّ بەردەوام چاڤدیّری یا وەرار ئوو پیّشکەڤتنا خوە بکن ئوو ب هەمی هیّزا خوە ڤە بزاڤیّ بکن ژیرتر ئوو زیرەکتر ببن. دبیّ هون د راستا خەلکی دا لیّبهور ئوو د راستا خوە دا هشك بن. هشیار بن نەکەڤن داڤا عوزر ئوو موهانەیان. بیّ سەرکەڤتنا ب سەر خوە دا هون نکارن ب سەر چ کەسەکی دا بسەربکەڤن. ئەگەر هون خوە مرۆڤەکیّ بیّکار ئوو لەواز بحەسبینن، خەلك ژی دیّ هەوە وەسا ببینن.

ئەز هەمی جاران ئاخینا هندیّ هلدکیّشم کۆ چما من خویندنا خوە نەڤەداند. برریار بوو کۆ ژبۆ بەردەوامبوونا ل سەر خویندنیّ بچم دەرڤەییّ وەلاتی. لیّ ئاریشە ییّن وی چاخی نەهیّلا. رەنگە ژبەر ویّ بت کۆ هیّشتا ئەز هەست دکم من تشتەکیّ گرنگ ژ دەست دایە. دەما ئەز سەفەران دکم ئوو دچم ل جیهانیّ دگەررم ئوو خەلکەکی دبینم، ڤیّ کیّماسییّ زیّدەتر هەست دکم. ژبۆ میناك، دەما ئەز ل سەر کاریّ

---

(١) هانری لوویی ییّ بیّرگسۆن (Henri-Louis Bergson) (١٨٥٩-١٩٤١) فەیلەسووفیّ فرانسایی. ل نیڤی یا سەدسالا بیستیّ باندۆرا وی ل سەر هزرا رۆژئاڤاییّ خورت بوو. وی بیردۆز ئانکۆ تیۆریەکا وەراریّ ل سەر بناغەییّ رەهەندیّن رەڤانی ئوو رووحانی ییّن مرۆڤی پیّشکیّشکر. وی ل سالا ١٩٢٧یّ خەلاتیّ نۆبلیّ ییّ ئەدەبیاتیّ وەرگرت.

خوه دگەل بیانیەکی دروونم، بێهایداری ئوو نەشەهرەزایی یا من ژ ئەدەت ئـوو تیتـالێن وی ئوو دیرۆکا وەلاتێ وی ژبۆ من ئاریشەیان چێ دکت.

دەما هون بەردەوام سەفەران بکن، هون نزانن کا کەسێ هـون دێ جارەکـا دی ببیـنن چ بیرووباوەر ئان دین هەیە. ژبەر وێ دبێ هون ژبۆ هەر رەوشەکێ ئامادە ئـوو بەرهـەڤ بن. ئەگەر نە هون بسەرناکەڤن.

ژبۆ میناك، دبێ هندەك تشتان ل سەر دینێ ئیسلامێ ئـوو هندۆسـیێ ئـوو هـەروەها تـشتەکێ ل سـەر دیرۆکـا وەلاتـێن سـوودان ئـوو جـەزائیرێ بـزانن. سـەرۆکێ دەسـتەکا رێڤەبەری یـا شـەریکەیەکێ گەلـەك زێـدەتر ژ هنـدێ کـۆ هـون هـزر دکـن حەوجـەدارێ زانیارانە. ژبەر ڤێ حەوجەداریێ یـە کـۆ هنـدەك جـاران دەرسـدێرێن زانینگـەهان ژی د سەفەران دا دگەل منن ئوو د فررۆکەییێ دا زانیارێن پێدڤی ل سەر وەلات ئان نەتەوە یـا هاڤلدار ددن من. لێ مخابن هەمی گاڤان من دەلیڤە یا ڤێ نینە. زانیارێن هۆسا هایـداری یـا مـن ل سـەر دیـرۆك، رەوشـا جڤـاکی ئـوو بوویـەرێن ڤـێ داویـێ یـێن نەتـەوەیان بـەرفرەهتر دکـت. هەلبـەت، ئـەڤ جـۆرەیێ فێربـوونێ وەکـی تەماشـەکرنا دیمـەنان ژ تەرەنەکا ئانکۆ ڤیتارەکا بەزا ئوو سەریعە. لێ هـەر ئـەڤ فێربـوون ژی هێـز ئـوو شـیانێ ددت من ئوو زانیارێن گشتی یێن من بەرفرەهتر دکن.

دبێژن جوانێن ئەڤرۆ تەنێ ژبۆ ئـەڤرۆ دژیـن. ئـەز ئێـك ژ وان کەسـانم کـۆ گەلـەك خەمێ ژ ڤێ سـرێمێ ئـوو ژ ڤـێ شـێوازا هزرینـا جوانـان دخـوەرم. ئەگـەر هـون تـەنێ د خەما ژیانا خوە یا ئەڤرۆ دا بـن، هـەوە چ دەلیڤـە نـابن شـیانێن خـوە بپـەروەرینن ئـوو پاشەرۆژا خوە ئاڤا بکن.

شێوازا هزرینا "نها دێ بچین ناڤ مەیدانێ، پاشی چ تشتێ دبت بلا ببت" دێ جـوانی یا هەوە خـراب بکـت. تـاقیکرنێن چـەند بەرسـڤی[1] چ کـارەکی ل وەرار ئـوو پێـشکەڤتنا هەوە ناکن، بلا دەرەجە یا هەوە ١٠٠ ژ سەدێ ژی بت. ژبەر وێ کۆ دەرەجە یێن وەسـا چ

---

(١) ئەزموون ئـانکۆ تـاقیکرنێن چەندبەرسـڤی (Multiple Choice Questions) ئـەو تاقیکرنن کۆ هەر پرسیارەکێ چەند بەرسڤ ژبۆ دهێن نڤیسین ئوو دبێ بەرسـڤا درسـت ژ ناڤ وان بهێت هلبژارتن.

ئافراندن ئوو نووخوازی تێدا نینه. تاقیكرنێن هۆسا شیانێن هەوە ئوو هێـزا ئافرانـدنێ د هەوە دا دكوژن.

جوانێن كـۆ ب سـەعەتان ل پـێش تێلـەفزیۆنێ دروونـن ئـان دەمـا خـوە ب خوینـدنا كۆڤارێن كارتۆنی ڤە دەرباز دكن، ل دووماهیێ دێ بگەهن ڤۆناخـەكێ كـۆ دێ ژ هـزرینێ ژی بێزار ببن. ئـەو ل پـەی كەلـەجان ئـوو خوەشـی یـێن گـاڤین ئـوو روومـەتی نـە ئـوو هێدی هێدی دێ ببن مرۆڤێن بێ باندۆر ئـوو بـەركار (= مونفـەعل) ئـوو چ پێنگاڤـەكێ ژبۆ پێگەهاندنا شیانێن خوە ناهاڤێژن.

هەر وەكی من پێشتر ژی گۆت، پاراستنا رەوشا نها د راسـتیێ دا وەكـی پاشڤەچوونێ یە. ژبەر وێ كۆ دەما هون ژبـۆ پاراسـتنا رەوشـا خـوە یـا نهـا دخـەبتن، خـەلك ب پـێش هەوە دكەڤن ئوو هەوە پاشدا دهێلن. ئەز تشتەكێ زێدە نابێژم ئەگەر ببێژم كەسێن كۆ هۆسا دژین، رۆژا وان ئاڤا بوویە، ژبەر وێ كۆ وان چ هیڤی ب پاشـەرۆژێ نەمانـە. تـەنێ جوانێن كۆ هەرگاڤ ژبۆ بدەستڤەئینانا زانینێ ئوو پەروەراندنا شیانێن خـوە دخـەبتن د ژیانا خوە دا پێش دكەڤن. جوانێن وەسا ب هیڤی ئوو ئومێد ل پاشەرۆژێ تەماشە دكـن ئوو ئەم حەوجەدارێن وان جوانانین.

ژبۆ خوە هشك ئـوو زەهمـەتگر بـن ئـوو سـاناهی ل خـوە مـەبهوورن، چ جـاران هـزر مەكن كۆ هون گەهشتنە ئارمانجا خوە یـا دوومـاهیێ ئـوو چ جـاران ژ كـارێن خـوە رازی مـەبن. ژیـانێ ب هێـزا خـوە یـا هـەری مـەزن بـدوومینن. ئەگـەر هـون نـەبزڤن، هـون ژ كاركەڤتی نە. پێش نەكەڤتن هەر پاشدامانە.

د راستیێ دا، كەسێن كـۆ شـیانێن خـوە یـێن هونـدرین، كـۆ هـەوە هـەمیان هەنـە، ب باشـترین شـێواز دپـەروەرینن، دبـن قـەهرەمان ئـوو عەبقـەری. هـون ژی شـیانێن خـوە بپەروەرینن ژبەر وێ كۆ هـون ژی دكـارن بـبن قـەهرەمان ئـوو عەبقـەری. ژبـیر مـەكن، هەرگاڤا هون بخوازن، هون دكارن عەبقەریەتا نڤستی د خوە دا شیار بكن. لەوما بـەر ب پێش هەرن ئوو وێ عەبقەریەتا نڤستی د هوندرێ خوە دا شیار بكن.

**بەهرا یازدەهێ**

# نووكسیە ئوو چ-نەدیتی سەرئێشن

ل ڤان سالێن دووماهیێ وەلاتێ كۆرەیێ ب ئاوایەكێ رێژەیی ژینفرەهتر بوویە ئوو داهاتا سەرانە یا وێ ژ توخیبێ ٥٠٠٠ دۆلاران دەرباز بوویە. شەڤام تژی ترومبێلێن جۆربجۆرن. مە فرۆشگەهێن مەزن هەنە كۆ مشتی پەرتالێن پربهانە. هەمی كەس دكارن سەفەرێن دەرڤەیی وەلاتی بكن.

گەلەك مخابن كۆ ئێك ژ سەرباركێن ڤێ ژینفرەهی یا نووهاتی، پررمەزاختن ئوو زێدەگاڤی یا خەلكی یە. ئێشەك كۆ وەكی نەساخیەكا پەژێك ئوو ڤەگر د هەمی جڤاكێ دا بەلاڤ بوویە. درستە كۆ ئەم ژ ئالی یێ ستاندەرێن ژیانێ ڤە ژینفرەهتر بوونە، لێ ب راستی دەما هندێ نەهاتی یە كۆ ب گەلەك مەزاختنێ ئوو زێدەگاڤیێ بژین.

ب سەر هندێ را كۆ داهاتا سەرانە یا وەلاتێ مە ژ توخیبێ ٥٠٠٠ دۆلاران دەرباز بوویە، لێ ب راستی ئابۆری یا كۆرەیێ ئەڤرۆ وەكی ئابۆری یا ژاپۆنێ ئوو تایوانێ یا بەری چەند سالان نیە كۆ داهاتا سەرانە یا وان هندە بوو. ئەز هەست دكم كۆ داهاتا سەرانە یا درست یا كۆرەیێ تشتەكێ نێزیكی ٢٠٠٠ دۆلارانە. ب بەرێكڤەدانا پەرچڤتنا ئابۆری (= تەزەخخوم، ئینفلاسیۆن) ئوو بهایێ زێدە یێ پارە یێ كۆرەیێ ل بەرانبەری دۆلاری ئوو ستاندەرا نها یا ڤی وەلاتی ل چاڤ ستاندەرێن ژاپۆن ئوو تایوانێ دەما كۆ داهاتا سەرانە یا وان ب ڤاسی داهاتا سەرانە یا مە بوو، ئەز دكارم ببێژم كۆ داهاتا سەرانە یا كۆرەیێ زێدەتر نێزیكی توخیبێن ٢٠٠٠ دۆلارانە. ئەم ئەڤرۆ ب پشتگەرمی یا داهاتا سەرانە یا خوە، دراڤەكێ بێقام دمەزێخین.

كەسێ كۆ داهاتا وی دو هزار دولارن، ئەگەر سەد هزار دۆلاران بمەزێخت، دێ ل دووماهیێ تووشی ئاریشەیان ببت. ئەگەر ئەم ڤێ ئێكێ تێ بگەهین، بێگومان دێ

ژینفرەهی یا مالباتی ئوو جڤاکی یا مە زێدەتر ببت. ل ڤی وەلاتی، پرانی یا خەلکی دینانە ئوو شێتانە پارەیی دمەزێخن. چ کەسەك هزرا پاشەکەڤتکرنا دراڤی ناکت. ئەڤ زێدەمەزاختن سەدەما سەرەکی یا ئاریشە ئوو پرسگرێکێن نوو د جڤاکێ دا یە. لەوما، دبێ ئەم رێ یا ڤێ زێدەمەزاختنێ بگرین. وەسا دیارە کۆ مرۆڤ گەلەك زوو تشتان ژبیر دکت. هێشتا هەیامەکا درێژ ب سەر وێ دەمێ را دەرباز نەبوویە کۆ وەلاتێ مە ب زۆر شیا خوە ژ زنجیرا برسیتی ئوو نەداریێ رزگار بکت. ئەڤ زێدەمەزاختنێن نەژیرانە ئوو نەئاقلمەندانە وەکی هندێ نە کۆ زارۆیەك بەری بکارت ب رێڤە بچت، بزاڤێ بکت ببەزت.

بدەستڤەئینانا دراڤی گرنگە، لێ مەزاختنا وی ژی هەر وەسا گرنگە. کەسێ کۆ ب زۆری ئوو زەهمەتیەکا زێدە پارەیەکی بدەستڤە دئینت بهایێ وی دزانت ئوو چ جاران دینانە وی نامەزێخت. دەما کەسەك ژبۆ بدەستڤەئینا پارەیی زەهمەتیان ببینت، دراڤێ خوە بێ ورج نامەزێخت. ئەگەر وەها بکت، ترانە ب هەمی ماندیبوونا خوە کری یە. ل ئالیەکێ دی، پارەیەکێ کۆ ب ساناهی بدەستڤە هات بت، ساناهی ژی ژ دەست دچت. کەس ژ مەزاختنا پارەیەکێ کۆ بێ زەهمەت بدەستڤە هات بت پشیمان نابت.

ڤێجا سەدەما ڤان هەمی زێدەمەزاختنێن نەبەرپرسانە ل سەرانسەری جڤاکا مە یا ئەڤرۆ ل کۆرەیێ چ یە؟ ب نهێررینا من، ئان خەلکی بهایێ بدەستڤەئینانا ب زەهمەتا دراڤی ژبیر کری یە، ئان خەلکەکێ مشە پارەیەکێ بێ زەهمەت د دەستان دا هەیە. ئەڤ هەر دو سەدەمێن سەرئێش ئوو ئاریشەیانن.

ئەز باوەرم کۆ ژ ئالی یێ دیرۆکی ڤە ئەم ل دەراڤەکا گەلەك نازك دا نە ئوو دەما هندێ هاتی یە کۆ هەمی ژبۆ نەهێلانا رێبازێن نەدلخوازێن هەیی بخەبتین.

وەلاتێ مە نها ل سەر دورێیانەکێ یە کۆ ل ئالیەکێ وێ دکارین ب لەز بەر ب وەرارا ئابۆری بچین ئوو ببین نەتەوەیەکا پێشکەڤتی ئوو ل ئالیەکێ دی ل جهێ خوە یێ نها بسەکنین. ڤێجا ئەم دبێ هەستا وەلاتپارێزیێ د خوە ئوو کارێ خوە دا بڤەژینین. ئەم دبێ وان هەستێن خوەگۆریکرنێ یێن دەهسالێن ٦٠ێ ئوو ٧٠ێ دوبارە بڤەژینین ئوو خوەماندیکرنێ دەست پێ بکین ڤە.

هەر چندە ئاستێ ژیانا ژاپۆنیان گەلەك ژ مە بلندترە، لێ ژیانا وان گەلەك ژ یا مە هەڤسەنگترە. هەما رێڤەبەرێن ئاست-بلند یێن شەریكە یێن مەزن یێن ژاپۆنێ ژی د خانی یێن ١٠٠-١٣٠ مەتری دا ب ناڤمالی یێن گەلەك سادە دژین. سەرۆكێ دەستەكا رێڤەبەری یا شەریكە یا مەزن یا "تۆشیبا"یێ[١] كو سالانە نێزیكی ١٠٠ ملیۆن یەنان داهات هەیە د خانیەكێ ٨٣ مەتری دا دژیت ئەوو هەیڤانە زێدەتر ژ ١٥٠٠٠٠ یەنان نامەزێخت. لێ ل كۆرەیێ هندەك ژ رێڤەبەرێن شەریكە یێن بچووك ژی خانی یێن ٣٣٠ مەتری هەنە كو ناڤمالی یا وان هەمی تشتێن لووكس یێن بیانی نە.

كەس د پاشەكەڤتكرنا پارەیی ئەوو ئابۆریكرنێ دا هەڤالێ ژاپۆنیان نینە، هەر ئەڤان پاشەكەڤتكرن ئەوو ئابۆراندنێ (= ئیقتسادكرنێ) ژاپۆن كری یە ئێك ژ وەلاتێن هەری زەنگین یێن جیهانا ئەڤرۆ. دبێ مرۆڤ هندەك تشتان ژ خەلكی فێر ببت ئەوو ئەم دبێ ل راستا ئابۆراندن ئەوو ژیانا هەڤسەنگا ژاپۆنیان شەرمێ ژ خوە بكین[٢]. دەما خەلك دەست ب زێدەمەزاختنێ بكن، راوەستاندنا وان كارەكێ زەحمەتە. لەوما، دبێ ئەم دپێشدا ب بهایێ مەزاختنا ژیرانە ئەوو ئابۆراندنێ بحەسین. دەما خەلك فێری تشتێن باشتر ئەوو مەزنتر ببن، هێلانا وان تشتان زەحمەتتر دبت. ژبو میناك، كەسەكێ كو د خانیەكێ مەزندا بژیت، گەلەك زۆری ئەوو زەحمەتێ دبینت دەما مالا خوە ڤەبگوهێزت خانیەكێ بچووكتر. چ تشتەك ژ وێ نەخوەشتر نینە كو كەسەك هەمی گاڤان ب

---

(١) تووشیبا (Toshiba) شەریكەیەكا مەزنا پربەرهەما ژاپۆنی یە كو هەمی كوردەك بەرهەمێن وێ یێن وەكی ناڤمالیان ئان كۆمپیۆتەرێن سەركۆشیێ (لەپتۆپ) دنیاسن. ئەڤ شەریكە ژ هەڤگرتنا دو شەریكەیێن دی ل سالا ١٩٣٩ێ هات دامەزراندن. شەریكەیا ئێكێ ل سالا ١٨٧٥ێ ژبو جارا ئێكێ ئامیرێن تەلەگرافێ ژبو ژاپۆنیان چێكرن، شەریكەیا دوییێ ل سالا ١٨٩٠ێ گلۆپێ كارەڤایی ل ژاپۆنێ چێكر. ڤان هەردو شەریكەیان پشتی ئێكگرتنێ ناڤێ خوە كر تووشیبا كو لێكدانا ناڤێن هەردوان بوو ب كورتكرن ڤە. تووشیبا نها ل هەمی جیهانێ ژبو چێكرنا ئامیر ئەوو ئالاڤان كارەڤایی ئەوو ئەلەكترۆنی شەریكەیا هەفتێ (٧) یە. ل سالا ٢٠٠٦ێ، تووشیبایێ ١٦٠ هزار كارمەند ئەوو كاركەر هەبوون ئەوو داهاتێ وێ ژی ٥٢ ملیار دۆلارێن ئەمەریكایی بوون.

(٢) ئەم دبێ چ ببێژین خوە دەما داهاتا شەریكەیەكا وان یا وەكی تووشیبایێ ب تەنێ ژ هەمی داهاتێن وەلاتێ ئیراقێ كو ئەم تەنێ ١٣ ئان ١٧ ژ سەدێ ژ داهاتێ وێ وەردگرین زێدەترە؟

تـرومبێلا خـوە هـات بـت ئـوو چـوو بـت ئـوو نهـا نەچـار بـت ب تـرومبێلێن گـشتی هاتنووچوونێ بکت. زێدەمەزاختن نە هەما مەترسیدارە، هێدی-هێـدی دبـت ئەدەتـەکێ خـراب یـێ جڤـاکی. نەتەوەیـەکا مـەزاختنکار کـۆ زێـدەتر ژ داهاتـا خـوە دمـەزێخت، نەتەوەیەکە بەر ب ئاریشەیان دچت. مەترسی یا ڤێ پێڤـاژۆیێ تـەنێ خـسارکرنا دراڤـی نینە، ئەڤ کاری ل ویژدانا تەڤانە یا جڤاکێ ژی دکت. چ ڤاس مـرۆڤ کـێمتر خـوە مانـدی بکـن، زێـدەتر دێ ل پـەی کەلـەجان ئـوو خوەشـی یـێن دەمکـورت یـێن ژیـانێ بـچن، دێ زێدەتر ژ رابوارتنێ حەز بکن، کێمتر ژ کارکرنێ خوەشیێ دبینن ئوو هێـدی-هێـدی دبـن قوربـانی یـێن تەنبـەلی ئـوو زێـدەگاڤیان. ل شـوونا پاشـەکەڤتێن بـچووک-بـچووک ئـوو درست، هەمی گاڤان دێ ل بدەستڤەئینانا پارەیێ ئەرزان-ب-دەست-کـەڤتی ئـوو پـوورەیی بگەرن. رفتارێن هۆسـا دێ ل دوومـاهیێ جڤـاکێ ڤـارێ (=ژ رێیـێ دەرکـەڤتی) بکـت ئـوو زەوال ئوو نەمانا نەتەوەییێ ب دوو خوە را بئینت.

ل ڤی وەلاتی هەمی وەسا دراڤی دمەزێخن دێ ببێژی ڤای ئاڤا رووبـاری یـە. نەتـەوە هەمی ژ ڤێ سەر خوەشیێ خواروخوار ب رێڤە دچن. نها دەما هندێ هاتی یە کـۆ ئـەم هەمی هشێ خوە بجەمینین. ئەڤ زێدەگاڤی ب گـشتی وەلاتـێ مـە بـەر ب دینـاتییێ دبـت. کەسێن کۆ بناسێن ڤێ ئاریشە یا رەڤانی ئوو پسیکۆلۆژیکن خـەلکێ نووکیـسە یـێن نـوو-ب-مالی-را-گەهشتی نە. ئـەڤ ئـێش گەهـشتی یـە دەسـتەکا رێبـەری یـا وەلاتـی ژی، ئـانکۆ درست ئەو کەسـێن کـۆ دبـێ چاکسازیخواز بـن ئـوو نـەهێلن تـاگری یـا تـشتێن خـراب د جڤاکێ دا زێدە بکت. ژبەر ڤارێ-بوونێن وها، جداتی یێن چیناتی ل ڤی وەلاتـی زێـدەتر ئـوو زێـدەتر دبـن. نها ل جڤاکا مـە خەلکـەکێ وەسـا هەیـە کـۆ هـەر ئێـك ژ ئەنـدامێن مالباتێن وان ترومبێلا خـوە هەیـە ئـوو خەلکـەك ژی هەنـە جهـێ نڤـستنێ تێـرا هـەمی ئەنـدامێن مالبـاتێ نینـە. هنـدەك کـەس ل ڤـی وەلاتـی وەکـی دینـان بزاڤـێ دکـن بـبن ئەندامێن یانە یێن گۆلفێ ئـوو خـشاندنا ل سـەر بـەفرێ، ئـوو هنـدەکێن دی ل تەمـەنێ وان، ل هندەك مالباتێن دی ل ڤی وەلاتی، ژبەر زۆرا نەداری ئوو خزانیـێ خـوە دکوژن. هـون دبیـنن کـا چـاوا جڤاکـا مـە ژ زێـدەگاڤیان زیـانێ دبینـت ئـوو چ نـەدادوەری ئـوو نەعەدالەتی یێن کرێت ئوو ئەشکرا ژ وان چێ بوونە.

زەنگین دبیٚ تیتێک-ئوو-میتکێن ژیانا خوە کێم بکن ئوو ل شوونا خوەهلکێشا ب پارەییٚ خوە ئوو زێدەمەزاختنێن زێدەگاڤانە یێن خوە، مالیٚ خوە دگەل نەداران ڤەببەشن. ئەم دبیٚ رێ ئوو شوونێن ژینفرەهی یا جڤاکی ڤەبگەررینین جڤاکا خوە. زەنگین دبیٚ بەرژەوەندی یێن خوە کێمتر بکن ئوو هاریکارییٚ بکن کۆ کەلێش ئوو دەرزا چیناتی یا دناڤبەرا زەنگینان ئوو نەداران دا کێمتر بکن. لیٚ ئەگەر زەنگین وەسا دفکرن کۆ مایێ چ کەسەکی د شێوازا مەزاختنا وان ناچت، هنگی جڤاك هەمی دێ تووشی ئاریشەیان ببت. ئەگەر زێدەمەزاختنێن ئیسرافکارانە یێن زەنگینان بەردەوام بکت، ئەو دێ جداتی یێن چیناتی زێدە بکن ئوو ب ڤێ ژی جڤاکێ بەر ب نەمان ئوو نەرازیبوونێ دبن.

چەند سالان بەری نها، د مێهڤانیەکێ دا کۆ ژبۆ رێڤەبەرێن کارگێرییٚ ئوو مالباتێن وان هات بوو سازکرن، هەڤژینا رێڤەبەرەکی ب پالتۆیەکێ پیستی یێ گرانبها هات بوو. من ب درستی دزانی کۆ ئەو کارمەند ب مووچەییٚ خوە نەدکاری پالتۆیەکێ پیستی یێ وەسا بکرت. ب سەر هندێ را، وان چەند ترومبێل ژی هەبوون. گەلەك ئەشکرا بوو کۆ مەزاختنێن وێ مالباتێ ژ داهاتا وێ زێدەترن. تەنێ دبیٚ وان ئەو پارەییٚ زێدە ژ رێ یێن دێ بددەستڤە ئینابت. ب سەر هندێ را، ژبەر وێ کۆ وی ل پشکا کرینان کاردکر، گەلەك کەسان گومان ل دەستپاکژی یا وی دکر.

هنگی من هەست کر زێدەگاڤی یێن وی کەسی ب ساناهی دێ تووشی کارمەندێن دی ژی ببن. لەوما، بیٚ کۆ کەس پیٚ بحەست، من فرمان دا کۆ وی مرۆڤی ژ سەر کارێ وی دەربکن ئوو بەرپرسیاری یا وی ژێ بستینن. هندی ئەز دزانم، وی کارمەندی چ موهانە ژبۆ کرینا پالتۆیەکێ پیستی ژبۆ ژنا خوە نەبوون. هەلبەت، وی مرۆڤی ل دووماهییٚ شەریکە هێلا. بەرپرسیاری یا مرۆڤی د راستا جڤاکا وی دا ب زێدەبوونا دراڤیٚ وی زێدەتر دبت. هەر تشتێ مە هەبت ب خێرا جڤاکێ گەهشتی یە مە. ئەڤ راستی دەرهەڤا مالی، ناڤووبانگی ئوو دەستهلاتێ ژی وەسا یە. جڤاکێ ژبۆ ئاڤاکرنا کۆچك ئوو ڤەسرێن فرعەونانی ئەم زەنگین نەکرینە. جڤاکێ ئەم زەنگین کرینە دا وێ زەنگینییٚ ب ئاوایەکێ هەژی دوبارە لیٚ ڤەبگەررینین.

ڤێجا هندی هون زەنگینتر ببن، دبێ ئابۆریانەتر بژین. هون بەرپرسیارن کۆ ب ئابۆراندنێ ئوو خوەماندیکرنێ جڤاکێ بەر ب رێ یێن هەژی ئوو ساخلەم ببن. وەلاتێ مە زێدەتر ژ هەر دەمەکێ د ژینفرەهیێ دا یە، لێ هێشتا ئەم نەگەهشتینە وی ئاستی کۆ ب زێدەگاڤیان خوە هلبکێشین. ئەم نها ل سەر دورێیانەکێ نە. ئەم دکارین بەر ب وەرار ئوو پێشکەڤتنێ پێنگاڤان بهاڤێژین ئوو ببین نەتەوەیەکا پێشکەڤتی ئان ژی هەر ل جهێ خوە بسەکنین. ژ بیر مەکن! ئێك ژ مەزنترین کۆسپە ئوو ئاستەنگێن پێشکەڤتنا هەر جڤاکەکێ زێدەگاڤی ئوو زێدەمەزاختنەکا بێقامە.

بلا ئەم ئەدەتێ خوەماندیکرنێ بەربەلاڤتر بکین. بلا ئەم هەمی رفتارێن هەژی بڤەژینین. بلا ئەم مشەیی یا نیعمەتێن ئەڤرۆ ژبۆ سبەهی یێن پررنیعمەتتر ئمبار بکین ئوو داخوازی یێن خوەپەرێسانە یێن خوە هەڤسار بکین دا تەباتا جڤاکا مە ئوو ژینفرەهی یا نفشێن پاشەرۆژێ مسۆگەرتر ببن. بلا ئەم خوەماندیکەر ئوو ئابۆریکەر بین.

**بەهرا دوازدەیێ**

# ژ هوندرێ خوە بزێن ئوو بلقان بدن

ب ئاوایەکێ ئـەدەتی، پـشتی خوارنـا زادی ل خوارنگـەهان، گەلـەك ژ بیانیـان ژ خزمەتکارێن خوارنگەهێ کیسەکێ نـایلوونی دخـوازن دا پاشمـایی یـا زادێ خـوە دگـەل خـوە بـبن مـالێ. هەلبـەت ژبـۆ دیتنـا دیمەنـەکێ هۆسـا، نـە پێـدڤی یـە کـۆ سـەفەرەکا دەرڤەیی وەلاتی بکن. هندەك ژ بیانیان ڤی کاری ل کۆرەیێ ژی دکن. لێ بـلا زاد چـەند گرانبها ژی بت، ئەم کۆرەیی کارەکێ وها ناکین. ژبۆ مە کۆرەییان داخوازا برنـا پاشمـایی یا زادی کریارەکا نەحەزکری یە ئوو ئەم چ جاران کارەکێ وهـا نـاکین. ئـەم ل نـك خـوە دهـزرین کـۆ کـارەکێ وهـا دێ رەنگڤەدانـەکا خـراب ل سـەر مـە هـەبت. رەنگـە ژی، ئـەم بترسـین کـۆ خـەلك هـزر بکـن ئـەم گەلـەك نـەدار ئـوو خـزانین ئـان ئـەم گەلـەك پاشدامایی نە.

بیانی چاوا ل وی کاری دنهێـررن؟ ئـەرێ رامانـا وێ ئـەوە کـۆ بیـانی تـشتێن ئـەرزان دکررن ئوو نەدارن، ئان ژی رەنگڤەدانەکا خرابا وانە؟

ب نهێررینا من، ئەم زێدەتر ژ رادە یا پێدڤی د خەما پاراستنا روومـەتی دا نـە ئـوو گەلەك ژ رییایێ ئوو روومەتینیێ حەز دکین. هنـدەك ژ خـەلکێن کێمخوینـدەوار خـوە وەسا نیشا ددن کۆ گەلەك زانا ئوو خویندانە. خەلکـەکێ کـۆ پـچەکا پـارەیی د بـەریکێن وان دا هەیە، ژبۆ خوەهلکێشانێ زێدەمەزاختنان دکـن. هەلبـەت هـەمی هۆسـا نینـە، لـێ گەلەك کـەس ژ مـە سـپەهیتی ئـوو بـەدەوی یـا هونـدر ئـوو بـاتنی گۆری روومـەت ئـوو زاهـری دکـن. ئـەم دهـزرین کـۆ ژبـۆ کارتێکرنـا ل سـەر خـەلکی دبـێ زێدەبێـژیێ (= موبالغەییێ) بکین. گەلەك کـەس ب هنـاڤێن ڤـالا ئـوو پـووچ تـەنێ ب روومـەتێ خـوە رییایێ دکن: ل سەر ڤە بالا، د ناڤدا ڤالا!

هیڤیدارم کۆ هون جوان ل گۆره یێ ڤی فەرهەنگی (= کولتۆری) نەبن. ژیانا خوە ب روومەتینی ئوو ریبایێ تێك مەدن. جوانی ڤۆناخەکە کۆ دبێ هون ژبۆ وەرارا خوە تەرخان بکن. رێ ئوو شێوازا ژیانێ چ روومەتی نینە، ژیان ژیانا هناڤان ئوو هوندرێ مرۆڤی یە. شێوازێن کۆ ژ روومەتی دهێن پووچ ئوو بێمفا نە. شێوازێن کۆ ژ هوندرێ مرۆڤان دهێن، بهادار ئوو گرانبهانە ئوو هەتاهەتا دگەل مرۆڤی دمینن.

جوان ب سرۆشتێ خوە ڤە نازکن ئوو ژبەر ڤێ ژی ساناهی دکەڤن داڤا پاراستنا روومەتی. ژبەر ڤێ یە کۆ گەلەك ژ ستڕانبێژان ئوو هونەرمەندان د کنجان ئوو جلکان ئوو روومەتی دا هەڤرکی یا هەڤدو دکن. گەلەك ژ جوانان ژی شەیدا یێن وان دبن، ئەڤ روومەتێن پر تیتك-ئوو-میتك هێدی هێدی دبن مۆدە یێن رۆژێ ئوو ل دووماهیێ ئەڤ ستێرێن هونەری دبن بابەتێن گەرمێن گەنگەشە ئوو ئاخڤتنێن رۆژانە یێن هەمیان.

ئەز چ جاران نابێژم کۆ حەزکرنا ژ ستڕانەکێ ئان هونەرمەندەکێ نەمازە باش نینە. لێ تشتێ کۆ ئەز تەکەز دکم ئەوە کۆ جوانی ڤۆناخەکا گەلەك گرنگە ئوو هەر د وێ دەمێ دا ژی گەلەك کورتە. لەوما، ڤێ دەلیڤە یا هۆسا گرانبها ب مۆدە یێن رۆژێ ئوو روومەتێ ژیانێ زرر مەکن. مۆدە ئوو روومەتینی هەمی بێ بەڤا نە ئوو زوو دچن، تەنێ هوندرێ مرۆڤانە کۆ چ جاران ژ ناڤ ناچیت. ئەز ب راستی باوەرم کۆ ل دەما جوانتی یا خوە، هەمی دەم ئوو هێزا خوە ژبۆ پێگەهاندنا هوندرێ خوە بمەزێخن.

مەکەڤن داڤا روومەتی یێن کۆ زوو بسەر دچن. ئەگەر ئەڤ تشتێن روومەتی گەلەك خوەشك بن ئوو بالا هەوە رابکێشن ژی، ژبیر مەکن کڤارکێن ژەهرین گەلەك ژ کڤارکێن ساخلەم بەدەوترن. ئەڤ ژبۆ گەوهەر ئوو  جەواهران ژی راستە. پررانی یا گەهەورێن بەدەلی ئوو نەئەسل ژ یێن ئەسل تەییسۆکتر ئوو روهنترن. هەر ئەڤ ژی دبت سەدەما هندێ کۆ مرۆڤ زێدەتر بەر ب ئالی یێ وان بچیت. لێ هون ب وان بەدەلیان مەهێن خاپاندن.

ئەگەر ڤەعدە (= جهێ پیساییکرنێ) یا زارۆان گەلەك جوان ئوو تەییسۆك ژی بهێت چێکرن، تەنێ ب کێری کارەکی دهێت. هەر وەسا گولدانێن کرێت ئوو ستوور ژی دکارن گولێن گەلەك جوان د خوە دا هل بگرن. هون دبێ ب کریارێن خوە بئاخڤن. گۆتار ئوو

کریارێن هەوە دبیّ هەڤپێژن (= هەماهەنگ) بن. پەیڤێن هەوە وەکی جوویەکا ئاڤیّ ژ دەڤیّ هەوە دەردکەڤن، لێ ئەگەر کریار دگەل وان نەبت کەس پووتەی پێ ناکت. مەتەلەکا ناڤدار هەیە دبێژت: "کار ب کریاریّ ب دووماهی دهێن، نە ب ئاخڤتنیّ".

پرۆژە یا مە یا پێسێن ل سوودانیّ ئاڤاکرنا کۆچکا مێهڤانان ژبۆ سەرکۆماریّ وی وەلاتی بوو. برریار بوو مێهڤانخانە ل ئالی یێ دی یێ کۆچکا سەرکۆماری بهێت ئاڤاکرن. حوکمەتا سوودانیّ گەلەك رازی نەبوو کۆ پرۆژەیێ بدت مە، رەنگە ژبەر وێ کۆ کاربدەستێن سوودانی وی چاخی دبن باندۆرا کۆرە یا باکور ڤەبوون کۆ پرۆژە یا ئاڤاکرنا "ناڤەندا جوانان" ل سوودانیّ ل بەردەستیّ وان بوو. ب سەر ڤێ را، حوکمەتا سوودانیّ ل وێ دەمێ تێکهلی یێن سیاسی دگەل کۆرە یا باکور هەبوون ئوو هێشتا دگەل کۆرە یا باشور چ تێکهلی چێ نەکربوون. ب هەر ئاوایی بت، ئەم د رەوشەکا دژوار دا بوون.

ئەز دهزریم کۆ ئەگەر وێ دەرفەتیّ ژ دەست بدم، چ جاران نکارم دەستیّ خوە ب سووکا کاری ل سوودانیّ را بگەهینم. ژبەر وێ من برریار دا کۆ ل شوونا ئاخڤتنیّ ب چەکێ کریاریّ هوندری وێ سووکیّ ببم. چما؟ ئەز باوەرم کۆ سەد گۆتن گۆری کریارەکێ نە. ڤێجا، مە دەست ب کاری کر ئوو شەڤ ئوو رۆژان بەردەوام ٢٤ چاخکان مە ل سەر ڤێ پرۆژەیێ کار کر. بێگومان کۆچکا سەرکۆماری های ژ روهنی یا چرا یێن جهێ کاریّ مە ل سەرانسەری شەڤێ هەبوو. مە وەکی دینان کار دکر ئوو گەلەك زووتر ژ دەما دیارکری مە پرۆژە داوی کر. رەنگە سەرکۆماری کاریّ مە ئوو کۆرەیی یێن باکوری بەرێکڤەدابت ئوو کەڤت بت بن باندۆرا کار ئوو تەکنۆلۆجیا یا مە. ب هەر رەنگی بت، ب رێ یا وێ پرۆژەیێ مە دەری ل بەر حوکمەتا خوە ڤە کر کۆ تێکهلی یێن سیاسی دگەل وی وەلاتی چێ بکت.

ئاخڤتن ئوو دانووستان بهێزترین شێواز ژبۆ رازیکرنا خەلکی نینە، هەر چەندە ئاخڤتن گەلەك گرنگە ئوو هون دبیّ بکارن باش ئوو درست بئاخڤن ئوو کاری ل خەلکی بکن. لێ د راستییّ دا، کریارێن هەوە نە کۆ کاری ل خەلکی دکن. هندەك جاران رەنگە ئاخڤتن چ ئەنجامان ب دوو خوە را نەئینن، لێ کریارکیکرنا وان پەیڤان ئوو وان

هزران چ جاران هەوە تووشی شکەستنێ ناکن. ئەگەر هەوە ب راستی دڤێت کۆ خەلك ژ هەوە باوەر بکن، ب پاکژی کار بکن ئوو کەسێ بەرانبەر رازی بکن.

هێزا رەڤانی (= پسیکۆلۆژیك) یا مرۆڤان شییان ئوو هێزا راستین یا وانە. جیهانا ئەڤرۆ حەوجەدارا وان کەسان نینە کۆ ب سەرووبەرەکێ رائێك دهێن ئوو دچن، ئەم حەوجەدارێن مرۆڤێن خودان شییانێن راست ئوو درستین. مرۆڤێن کۆ پرربێژ نەبن ئوو خوە مەزن نەکن ئو ل هەمی دەران ژی رێز ل وان بهێت گرتن. ڤێجا هون دبێ ل دەما جوانتی یا خوە، هندی ژ هەوە دهێت، خوە بپەروەرینن ئوو زانستی فێر ببن. ژبۆ سەرکەڤتنا د ژیانێ دا، هون حەوجەدارێن فەرهەنگەکێ (= کولتۆرەکێ) زەنگین، نهێررینەکا ڤەکری ئوو بەرفرەه ئوو پاکژن. هون دبێ شەهرەزا ئوو کارزان بن. جوانتی گەلەك زوو دەرباز دبت، وێ ژ بەر نەزانی ئوو تشتێن روومەتی زرر مەکن. ل دەما پیریێ، دێ ژبۆ هەر دەقیقە یا تەمەنێ خوە کۆ ل دەما جوانتی یا هەوە زرر بوویە، ب سەعەتان خەمێ بخوەرن ئوو ئاخینان هل بکێشن.

ل گۆرە یێ ئامارێن چەند سالێن بەری نها، رێژە یا خویندکاران ل کۆرەیێ ٢٥٠٠ خویندکار ژبۆ هەر ١٠٠٠٠٠ (سەد هزار) کەسێن هێشەتێ بوو. ئەڤ هژمار ٤ جاران ژ هژمارا خویندکارێن دەهسالا هەفتێان زێدەترە. ئامار نیشا ددن کۆ هەر سال ٢٥٠٠٠٠ کەس ل سەر هێزا کاری یا خویندا یا وەلاتی زێدە دبن. لێ مە تێرا وان هەمی کەسان کار نینە. ئەڤ نیشا ددن کۆ هەڤررکیەکا مەزن ل وەلاتی هەیە. ژبەر وێ نابت هون جوانتی یا خوە ئەهمەڤانی دەرباز بکن. ئەڤرۆ دبێ هون شیانێن خوە هەتا کۆپیتکان زێدە بکن، هەلبەت نە ژبۆ بدەستڤەئینانا سەرکەڤتنان، لێ ژبۆ پاشدانەمانا ژ هەڤررکان.

ئەگەر شییان ئوو باوەری یا ب خوە ئوو هێزێن هوندرێ خوە بگەهینن پیتکان (= کۆپیتکان)، هنگی دێ هاریکاری یا گەشترکرنا پاشەرۆژا جڤاکا خوە بکن. وەکی چەرخا چالا ئاڤێ ڤالا مەبن، شییان ئوو هێزێن هوندرێ خوە بپەروەرینن. ببن ئێك ژ ستوونێن سەرەکی یێن پێشکەڤتنا نەتەوە یا خوە.

# پەیڤا دووماهیێ
# شییانێن نەپەنی یێن خوە ئەشکرا بکن

جـوانتی قۆناخـا دەربازبوونـا ژ تـوخیبێن زارۆتیـێ بـەر ب گەهـشتنێ ئـان ژی راوەستیانا نیڤارێیێ نینە. زێدەگاڤی نینـە ئەگـەر ببێـژم ئـەڤ قۆنـاخ برریـارا پاشـەرۆژا هەوە ددت.

دەرفـەتێن ژیـانێ ئـەرینی ئـوو نـەیینی نـە؛ هیڤـی ئـوو بێهیڤـیتی، ئومێـد ئـوو بێئومیدی. کا هون جوان چەند کارێ خوە ل گۆرە یێ رەوشێ بگـوهێررن، شـێوازا ژیانـا هەوە ل ڤێ قۆناخێ برریارا پاشەرۆژا هەوە ددت. لەوما، نڤشێ کـەڤن ئـەوقاس گرنگیـێ ددت نڤشێ نوو. ئـەز وەکـی کەسـەکێ کۆ چـەند کـراس زێـدەتر ژ هـەوە دڕاندنـە ئـوو وەکـی دامەزرینـەرێ دامەزرياییـەکا پێـشەسازی ئـوو کەسـەکێ کـۆ ژدل حـەز ژ جوانـان، ئانکۆ بەرپرسێن پاشەرۆژا وەلاتێ مە، دکت، دخوازم کۆ هزر ئوو بیرێن خوە ژبـۆ هـەوە ببێژم. ئەز باوەرم کۆ جوانان گەلەك شییانێن نەپەن هەنە.

## باوەری ئوو ئارمانج

هـەر وەکـی مـن بـەرتر گـۆت، دیـرۆك ژبـۆ وان کەسـانە کـۆ خـودان ئارمـانج بـن. تەنێ ئەو نەتەوە یێن کۆ بزاڤێ دکـن هـزر ئـوو ئارمـانجێن خـوە بجـه بکـن دکـارن بـبن پێشەنگێن دیرۆکێ.

ئارمانجێن هەوە دبێ وەکی ئاڤا کانیـان زەلال، ئـوو هـەر د وێ دەمـێ دا ژی، شـکۆدار ئوو مەزن بن. ل ڤێ جیهانێ، ژبۆ جوانێن کۆ ئارمانجێن خوەپەرێسانە ئـوو نـزم هەنـە، چ جه نینە. هون دبـێ بکـارن جهـێ جیهـانێ د دلـێن خـوە دا ڤـەبکن ئـوو ئارمـانج ئـوو هیڤی یێن هەوە ب مەزناهی ئوو شکۆداری یا ئەسمانی بن. ئێك ژ فەیلەسوّفان گۆتی یە "جوانێ بێ ئارمانج وەکی کەسەکی یە کۆ خوەکوشتنەکا رووحی بکت."

## ئافرینەرانە بهزرن

سـرێم ئـوو مەشـا دیرۆکـێ ئـوو بـاژاروارییێ هـەمی جـاران ب هزرمەنـدان ئـوو ئافرینەران هاتی یە دیارکرن. جڤاکەکا کۆ رێزێ ل ئافرینەری یا خوە ئوو هێزا خوە یـا بەرهەمئینانێ دگـرت، چ جـاران تووشـی شکەسـتنێ نابـت. هـون دکـارن ئـەرینی بهـزرن، ڤێجا هەر تشتەکی ب هزرێن ئـەرینی دەسـت پـێ بکـن. هۆسـا هـون دێ بـبن دەلیـل ئـوو رێنوما یێن رێ یا کەسان.

هون نابت تەنبـەل بـن ئـوو ب ئاوایـەکێ زێدەگاڤانـە خـوە ب مـژوولیان ڤـە مـژوول بکن. ئامادە بن کۆ جیهانێ برێڤەببن ئوو چاڤێ هەوە ل جیهانێ ئوو ل پاشەرۆژێ بـت. جیهان ئوو پاشەرۆژ تێکهلن، ئوو د راستییێ دا ژی هەما هەر ئێکن.

د جڤاکێ دا، تەنێ تەماشەڤان مەبن، فەرمانداریێن جیهانێ بن. د ڤێ رێییێ دا، نفشێ کەڤن دبێ ب هەمی شیانان هاریکاری یا هەوە بکت. ڤێجا، ئافرینەرانـە بهـزرن. ئـەرینی ئوو پرربزاڤ بن، پاشەرۆژەکا گەشتر ئاڤا بکن.

## خەبات

وەرارا دیرۆکـێ ئـوو بـاژارواریێ ب خـەبات ئـوو مێرخاسـیێ چـێ بوویـە. کەسـێن خەباتکار د هەمی کاران دا سەرکەڤتی نە. هون ژبەر جوانتی یا خوە تژی بـاوەری یـا ب خوە نە ئوو ئەڤ باوەری یا ب خوە سەدەما مێرخاسی ئوو نەترسی یـا هـەوە یـە. جـوان هەرگاڤ ل دوو سەربهورێن نوو نە ئوو ژ شکەستنێ ناترسـن. کەسـێ کـۆ هـەر کـارەکی ب ترس ئوو لەرز دەست پێ بکت، گەلەك بەری هنگی جوانتی ئوو دلگەشی یـا خـوە وەنـدا کری یە.

پێت ئوو گورری یا حەز ئوو ڤینا کاری ئوو سەرکەڤتنێ دبـێ هـەمی هـەبوونا هـەوە دا بگرت. هون دبێ هەرگاڤ بزاڤێ بکن شییانێن خوە بپەروەرینن.

بـاوەر- ب-خـوە-هـەبوون، خـەبات، مێرخاسـی ئـوو نەترسـی، سـەربهورخوازی، سەرکەڤتن، دلگەشی، پێشەنگی ئوو هەستێن گەرم، هـەمی سـالۆخەتێن جوانـانن. جـوان چ پەیڤان ژبـۆ بێبهایی، لـەوازی، تەنبـەلی، شکەسـتن، بێئومێـدی، خوەدانەدەسـتان ئـوو سەرشۆرییێ ڤەنابینن. ڤێجا بخـەبتن ئـوو نەترسـانە ژی بخـەتبن. ژ شکەسـتنێ مەترسـن ئوو ب هەمی بوونا خوە ب پێر ژیانێ ڤە هەررن.

## خوەگۆریکرن

دیرۆك ب خوەگۆریکرنێن مرۆڤان گەش بوویە. نڤشێ نها دبێ ژبۆ بەختەوەری ئوو سەرکەڤتنا نڤشێ پاشەرۆژێ خوە گۆری بکت.

ژبەر وێ کۆ هون جوانن، دبێ خوە ئوو بەرپرسیاریتی یێن جڤاکی یێن خوە بنیاسن. ئەگەر هون خوە ل بەرانبەری جڤاکا خوە، نەتەوە یا خوە ئوو نڤش ئوو پاشەرۆژا خوە بەرپرسیار نەزانن، ئێدی هون جوان نینە. ئەڤ ئێك زێدەتر ژ هەر دەمەکا دی ژ بۆ نڤشێ نوو یێ کۆرەیێ گرنگە. وەلاتێ مە نها ل دەرازینکا پێشکەڤتنێ یە ئوو ل بەرە کۆ ببت نەتەوەیەکا پێشکەڤتی. ژبەر وێ کۆ نڤشێ من ب هەستکرنا ب بەرپرسیاریێ ئوو ب خوەگۆریکرنێ، نەتەوە یا کۆرەیێ گەهاندی یە قۆناخا ڤێ گاڤێ. نها ل سەر هەوە دمینت کا نەتەوەیێ ژ دەرازینکێ دەرباز بکن ئان نە. ئەگەر هون خوە بەرپرسیار نەزانن ئوو هەستا خوەگۆریکرنێ د هەوە دا نەبت، وەلاتێ مە هەر دێ ل ڤێ دەرازینکێ بمینت ئوو چ جاران دەربازی قۆناخا دی نابت.

بێ گومان چ کەسەك ژ مە ڤێ ناخوازت. لەوما، دبێ هەستا بەرپرسیاریتی ئوو خوەگۆریکرنێ د خوە دا بهێز ئوو خورت بکین ئوو ڤێ هەستێ پێشکێشی نڤشێ پاشەرۆژێ ژی بکین.

## ژ مرۆڤان حەز بکن

مرۆڤ ژبۆ ژیانێ ئوو ژیانا هەڤپشك هاتنە سەر دنیایێ. چ کەسەك نکارت ب تەنێ ئوو ڤەدەر ژ مرۆڤان بژیت. خوەپەرێسی سالۆخەتەکا حەزکری نینە. ژبەر وێ چ جاران خوە ب دەمارگریێ، خوەپەرێسیێ ئوو تەماعکاریێ پیس مەکن. ل شوونا هندێ کۆ ل خوە بهزرن، خەما خەلکی بخوەرن. هەمی گاڤان بەرژەوەندی یێن جڤاکێ ئوو خەلکی ل پێش بەرژەوەندی یێن خوە یێن تایبەتی دابنن. خوەپەرێس نە چ جاران جوانە ئوو نە ژی جوامێر.

جوان بهایێ ددن باوەریێ ئوو بیرووباوەران ئوو شەیدا یێن بەدەوی ئوو هاریکاری ئوو ڤیانێ نە. ئەو ل پەی بنەما یێن ژیانا هەڤپشك ئوو ژینفرەهی یا هەڤپشك دچن ئوو بێ تەماعی یا مادی ب کووری ل مرۆڤانتیێ دنهێرن.

جوان ل كوژى يێ خوەڤەدەركرنێ عەمرێ خوە ب خەيالان ئوو هـزرێن ڤـالا دەربـاز ناكن. كوژى يێ خوەڤەدەركرنێ هەژى يێ جوانان نينە. جهێن ڤەكرى ئوو سـەربەردايى زێدەتر هەژى يێ وانن. ل جهێن وەسا "ئەز" دبت "ئـەم". ڤێجا خـوە مـەكن ديـل ئـوو هێسيرێ خوەپەرێسيێ. ب باوەرى ئوو ب ڤيان بەر ب سبەهى بلەزن.

## دگەل خوە راست بن

نڤشێ من چەند بزاڤێ ژى بكت نكارت دگەل خوە راست بـت. ئاريـشە يـێن پيـشەيى ئوو مالبـاتى نـاهێلن. هنـدەك جاران ژبـەر هنـدەك دەراڤـان، ئـەم نەچاربوونە هنـدەك تشتان بكين ئوو هندەك ئاخڤتنان بكين كۆ ب چ رەنگان ب دلێ مە نەبوونە. لـێ نڤـشێ ئەڤرۆ نەچار نينە سەرێ خوە ئەوڤاس ژبەر ڤان تشتان بچەمينت. هەمى گاڤـان بزاڤـێ بكـن نەكـەڤن دەراڤـێن وەسـا كـۆ ب دلـێ هـەوە نـەبن. ل دەمـا جـوانتيێ ل پـەى داخوازێن راستين يێن خوە هەررن ئوو ئـەڤ بـەرزترين ئـوو بلنـدترين راسـتى يـا هـەوە دگەل خوە يە.

## خوەشكاندى بن

وەرار ئوو پێشكەڤتنا هزرى ئـوو كەسـانى يـا هـەر مرۆڤـەكى ب پـەروەردەبوون ئـوو فێركرنا وى ڤە گرێدايى يە. دەما هون دهزرن كۆ ب راسـتى هـون كەسـەكێ گـرنگن، وێ گـاڤێ وەرارا رووحـى ئـوو رەڤـانى يـا (= پـسيكۆلۆژيكا) هـەوە رادوەسـتت. كەسـاهى ئـوو رووحا هەوە ب خوەشكاندنێ ئوو بزاڤا ژبـۆ فێربوونـا زێـدەتر پـێش دكـەڤت. چـاوا كـۆ ئەنداميێن لەشێ هەوە خورتتر دبن، وەسا ژى دبـێ هـون خوەشـكاندى ئـوو نـەرمتر بـبن. دبێ ئەم ژ خوها ئەنى يا جۆتكاران، كنجێن دوهن-گرتى يێن كاركەران ئـوو نـازێن پـر ژ دلۆڤانى يێن دايكێن كۆ ل تاريتى يـا بەرسـپێدەيان تێـشتێ ژبـۆ زارۆ يـێن خـوە بەرهـەڤ دكن فێر ببين. چاڤێن خوە ئوو گوهێن خوە ل دەنگ ئوو ديمەنێن دەردۆرا خوە ڤـەكن. خوەشكاندى بن ئوو ب دل ئوو گيان ژبۆ فێربوونا زانستى بخەبتن.